**٤٧٧٤- خوای گەورە فەرمویەتی: نوێژم[1] لەنێوان خۆم و بەندەکەمدا دابەشکردووە بە دوو بەشەوە ئەوەشی بەندەکەم داوای بکات پێی دەبەخشم ، کاتێك بەندەکەم دەڵێت ( الحمد لله رب العالمین ) ( الفاتحه ٢: ) خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەکەم سوپاسی کردم کاتیك دەڵێت: ( الرحمن الرحیم ) ( الفاتحه ٣: ) خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەکەم ستایشی کردم کاتێك دەڵێ: ( ملك یوم الدین ) ( الفاتحه ٤: ) دەفەرموێت: بەندەکەم پەسەندو مەزن ڕایگرتم کاتێك دەڵێت : ( ایاك نعبد و ایاك نستعین ) ( الفاتحه : ٥ ) دەفەرموێت: ئەمە لەنێوان خۆم و بەندەکەمدایە، ئەوەشی لێم داوا بکات پێی دەبەخشم کاتێك دەڵێت: ( اهدنا الصراط المستقیم، صراط الذین أنعمت علیهم غیر المغضوب علیهم ولا الضالین ) دەفەرموێت: ئەوە بۆ بەندەکەمە و داوا کارییەکەشی جێبەجێ ئەکەم.**

(صحیح ابي داود ٧٧٩)

## بابەتی سوڕەتی ( البقره )

٤٧٧٥- قیل لبني إسرائیل ( ادخلوا الباب سجدا و قولوا حطة فبدلوا فدخلوا یزحفون علی أستاههم و قالوا: حبة في شعیرة )

( صحیح ) ( حم ق د ت ) عن أبي هریرة

**٤٧٧٥- بەنی ئیسرائیل وترا: ( وادخلوا الباب سجداً وقولوا حطة ) ( البقره:٥٨ ) بەڵام ئەوان گۆڕییان و، بە قنگەخشکە و پاشەو پاش چوونە ژورەوە و لەجیاتی ( حطة )[2] وتیان (( دەنکە جۆ ) و، وتیان.**

(صحیح الترمذي ٢٩٥٦)

٤٧٧٦- ذخره الله لنا و صلاة الوسطی صلاة العصر

( صحیح ) ( طب ) عن أبي مالك الأشعري

**٤٧٧٦- نوێژی ناوەڕاست نوێژی عەسرە.**

(المشکاة ٦٣٣)

---

[1] واتە: سوڕەتی ( الفاتحة ).

[2] ( حطة )واتە لە گوناهەکانمان خۆشبە بەڵام ئەوان گوریان ( حبة فی شعیرة )دەنکێك جۆ.

٤٧٧٧- نحن أحق بالشك من إبراهيم إذ قال: ( رب أرني كيف تحيي الموتى قال أولم تؤمن ؟ قال بلى و لكن ليطمئن قلبي) و يرحم الله لوطا لقد كان يأوي إلى ركن شديد و لو لبثت في السجن طول ما لبث يوسف لأجبت الداعي

( صحيح ) ( حم ق هـ ) عن أبي هريرة

**٤٧٧٧- ئێمە لە ئیبراهیم پێشترین بە گومان بردن[1]، کاتێك فەرمووی:(( رب أرني كيف تحي الموتي، قال اولم تؤمن قال بلى ولكن ليطمئن قلبى ))( البقرة:٢٦٠ ) رەحمەتی خوایش لە ( لوط ) بێت، پەنای بردەبەر گۆشەو پەنایەکی بەهێز، ئەگەر ئەوەندەی یوسف لە زینداندا بومایە بەقسەی داوای نوێنەری پاشام دەکرد[2].**

(الصحيح ١٨٦٧)

٤٧٧٨- يجيء النبي يوم القيامة و معه الرجل و النبي و معه الرجلان و النبي و معه الثلاثة و أكثر من ذلك فيقال له: هل بلغت قومك ؟ فيقول: نعم فيدعى قومه فيقال لهم: هل بلغكم هذا ؟ فيقولون: لا فيقال له: من يشهد لك ؟ فيقول: محمد و أمتُه فيدعى محمد و أمته فيقال لهم: هل بلغ هذا قومه فيقولون: نعم فيقال: و ما علمكم بذلك ؟ فيقولون: جاءنا نبينا فأخبرنا أن الرسل قد بلغوا فصدقناه فذلك قوله: ( و كذلك جعلناكم أمة وسطا لتكونوا شهداء على الناس و يكون الرسول عليكم شهيدا )

( صحيح ) ( حم ن هـ ) عن أبي سعيد

**٤٧٧٨- پێغەمبەری وا هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و یەك پیاوی لەگەڵدایە و، پێغەمبەر دێت و، دووکەس و سێ کەسی لەگەڵدایە یان زیاتر، پێی دەوترێت ئایا گەلەکەت ئاگادار کردەوە؟ دەفەرموێت: بەڵێ، ئینجا گەلەکەی بانگ دەکرێن، پێیان دەوترێت: ئایا ئاگادار کرانەوە، دەڵێن: نەخێر ئینجا بە پێغەمبەرەکەیان دەوترێت:**

[1] ئەوەوی دەفەرموێت : دەربارەی واتای ئەم فەرموودەیە زانایان جیاوازییان هەیە ، پەسەند ترین بۆچوون ئەوەیە کە ( ابو ابراهيم المزنى ) و هەندێ زانایانی تر دەڵێن : واتە گومان مەحاڵە لە لای پێغەمبەران ، ئەگەر گومانیش دروست بوایە لە لای کەسێك لە پێغەمبەران سەبارەت بە زیندوو کردنەوەی مردووەکان ئەوا ئێمە لە پێشتر دەبووین بە ئیبراهیم ، ئینجا ئێوەیش دەزانن کە من هەرگیز گومانم نەکردووە ، بۆیە لەوە دڵنیابن کە ئیبراهیم گومانی نەکردووە.

[2] کاتێك نوێنەری پاشا چووە بەندیخانەوە بە یوسفی ووت وەرە دەرەوە پاشا کاری پێتە ئەویش فەرموی نایەمە دەرەوە هەتا پیلانی ئافرەتەکانی کۆشك ڕوون نەکرێتەوە.

**کێ شایەتیت بۆ دەدا؟ دەفەرموێت: موحەمەد و ئوممەتەکەی، ئیتر بانگی موحەمەد و ئوممەتەکەی دەکرێت و پێیان دەوترێت: ئایا ئەمە گەلەکەی خۆی ئاگادار کردەوە؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ ئینجا دەوترێت ئێوە چۆن ئەوەتان زانی؟ ئەوانیش دەڵێن: پێغەمبەرەکەمان ئاگاداری کردینەوە و، ئێمەیش باوەڕمان پێکرد، ئەوەیە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ((وكذلك جعلنكم أمة وسطا لتكونوا شهداء على الناس ويكون لرسول عليكم شهيدا)) (البقرة:١٤٣).**

**(الصحيحه ٢٤٤٨)**

٤٧٧٩- يجيء نوح و أمته فيقول الله: هل بلغت ؟ فيقول: نعم أي رب ! فيقول لأمته: هل بلغكم ؟ فيقولون: لا ما جاء لنا من نبي فيقول لنوح من يشهد لك ؟ فيقول: محمد و أمته و هو قوله تعالى ( و كذلك جعلناكم أمة وسطا لتكونوا شهداء على الناس) (البقرة:١٤٣) و الوسط: (العدل فيدعون فيشهدون له بالبلاغ ثم أشهد عليكم)

( صحيح ) ( حم خ ت ن هـ ) عن أبي سعيد

**٤٧٧٩- نوح و ئوممەتەکەی دێن و، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ئایا ئابینت ڕاگەیاند؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگار، ئینجا بەئوممەتەکەی دەفەرموێت: ئایا پێی ڕاگەیاندن؟ ئەوانیش دەڵێن: نەخێر ئێمە هیچ پێغەمبەرێکمان بۆ ڕەوانە نەکراوە، ئینجا بە نوح دەفەرموێت کێ شایەتیت بۆ دەدا؟ دەڵێت: موحەمەد و ئوممەتەکەی، ئەوەیە خوای گەورە دەفەرموێت: ( وكذلك جعلنكم أمة وسطا لتكونوا شهداء على الناس ) ( البقرة:١٤٣ ) (الوسط) واتە: دادگەریی، بانگ دەکرێن و شایەتی ڕاگەیاندنی بۆ دەدەن ئینجا شایەتیان لەسەر دەدەم.**

(الصحيح ٢٤٤٨)

## بابەتی سورەتی (النساء)

٤٧٨٠- ثلاثة يدعون الله عز و جل فلا يستجاب لهم: رجل كانت تحته امرأة سيئة الخلق فلم يطلقها و رجل كان له على رجل مال فلم يشهد عليه و رجل آتى سفيها ماله و قال الله تعالى: ( و لا تؤتوا السفهاء أموالكم .

( صحيح ) ( ك ) عن أبي موسى .

**٤٧٨٠- سێ کەس لەخوا دەپاڕێنەوە و نزایان گیرا نابێت: پیاوێك ئافرەتێکی بەدڕەوشتی هەبێت و لێی جیا نەبێتەوە[1]، پیاوێکیش پارەی لای پیاوێکی تر بێت و بێنەوەی شایەتی لەسەر گرتبێت[2]، پیاوێکیش ماڵی لای کەسێکی کەوودەن دابنێت و بەکەسی نەدات، خوای گەورە دەفەرموێت:(( ولاتؤتوا السفهاء أموالكم )) ( النساء:٥ ).**

(الصحيح ١٨٠٥)

## بابەتی سورەتی ( المائدە )

٤٧٨١- يا أيها الناس ! إنكم تحشرون إلى الله حفاة عراة غرلا ( كما بدأنا أول خلق نعيده ألا و إن أول الخلائق يكسا يوم القيامة إبراهيم ألا و إنه يجاء برجال من أمتي فيؤخذ بهم ذات الشمال فأقول يا رب أصحابي ! فيقال: إنك لا تدري ما أحدثوا بعدك فأقول كما قال العبد الصالح: ( كنت عليهم شهيدا ما دمت فيهم فلما توفيتني كنت أنت الرقيب عليهم ) فيقال: إن هؤلاء لم يزالوا مرتدين على أعقابهم منذ فارقتهم )

( صحيح ) ( حم ق ت ن ) عن ابن عباس

**٤٧٨١- خەڵکینە! ئێوە کۆدەکرێنەوە بە پێخاوسی و ڕووتی و خەتەنە نەکراوی (كما بدأنا اول خلق نعيدة)( الأنبياء:١٠٤ ) یەکەمین کەسیش لە ڕۆژی قیامەتدا پۆشاکی لەبەردەکرێت ئیبراهیمە، کەسانێکیش لە ئوممەتم دەهێنن بەلای چەپدا دەیانبەن، منیش دەڵێم: خوایە هاوەڵەکانم! پێم دەوترێت: تۆ نازانیت لە دوای تۆ چییان داهێنا، منیش وەکو بەندە خواناسەکە دەڵێم:(( وكنت عليهم شهيدا مادمت فيهم فلما توفيتني كنت أنت الرقيب عليهم ))( المائدە: ١١٧ ) ئیتر دەوترێت: ئەوانە لەو کاتەوە تۆ ئەوانت بەجێهێشتوون پاشگەزبوونەوە لە ئاینەکەیان.**

(صحيح الترمذي ١٨٠٥)

---

[1] ئەگەر بپاڕێتەوە لە دژی نزای وەرناگیرێت چونکە دەتوانێت لێی جیابێتەوە و، هەر بەردەوامیش دەبێت لە هاوسەرگیری ئەو ئافرەتە.

[2] ئەویش نکوڵی دەکات لەو پارەیە، بۆیە نزای وەرناگیردرێت چونکە دەتوانێت و ، خۆی کەم تەرخەم بووە لە جێ بەجێ کردنی فەرموودەی خوای گەورە ( واشهدوا شهدين من رجالكم ).

٤٧٨٢- يلقى عيسى حجته في قوله: ( و إذ قال الله يا عيسى ابن مريم أأنت قلت للناس اتخذوني و أمي إلهين من دون الله) (المائدة: ١١٦) فلقاه الله: ( سبحانك ما يكون لي أن أقول ما ليس لي بحق ) (المائدة :١١٦) الآية كلها

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة

**٤٧٨٢- خوای گەورە دەفەرموێت:( ( وإذ قال الله ياعيسى بن مريم ءأنت قلت للناس اتخذونى و امي إلهين من دون الناس ) )( المائده: ١١٦ ) ئیتر خوای گەورەیش فێری دەکات بڵێت( سبحانك ما يكون لى ان أقول ماليس لى بحق ) ( المائده: ١١٦ ) هەموو ئایەتەکە.**

(الصحيح ٢٤٥٤)

## بابەتی سورەتی ( الأنفال )

٤٧٨٣- ما منعك يا أبي أن تجيبني إذ دعوتك ؟ ألم تجد فيما أوحى الله إلي أن ( استجيبوا لله و للرسول إذا دعاكم لما يحييكم ) .

( صحيح ) ( حم ت ك ) عن أبي هريرة.

**٤٧٨٣- ئەی ئۆبەی چی ڕێگەی لێ گرتی وەڵامم بدەیتەوە کاتێ بانگم کردی؟ ئایا لەقورئاندا نە تخوێندووەتەوە:( ( استجيبوا لله للرسول اذا دعاكم لما يحييكم ) )( الأنفال:٢٤ ).**

(الصحيح ابي داود ١٣١١)

## بابەتی سورەتی ( التوبه )

٤٧٨٤- صدق الله و رسوله: ( إنما أموالكم و أولادكم فتنة نظرت إلى هذين الصبيين يمشيان و يعثران فلم أصبر حتى قطعت حديثي و رفعتهما )

( صحيح ) ( حم ٤ حب ك ) عن بريدة

**٤٧٨٤- خوای گەورە و پێغەمبەرکەی ڕاستیان فەرمووە:( انما أموالكم واولادكم فتنة ) ( التغابن:١٥ ) تەماشای ئەو دوو منداڵەم کرد ڕێ دەکەن و پێیان هەڵدەکەوێت، ئیتر ئارامم نەگرت تاکو قسەکەم بڕی و بەرزم کردنەوە.**

(صحيح ابى داود ١٠١٦)

## بابەتی سورەتی ( ابراهیم )

٤٧٨٥- نزلت هذه الآية في أهل قباء: ( فيه رجال يحبون أن يتطهروا و الله يحب المطهرين ) .

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة.

**٤٧٨٥- ئەم ئایەتە لەخەڵکی ( قباء )دا دابەزی ( فيه رجال يحبون ان يتطهّروا والله يحب المتطهرين ) ( التوبة: ١٠٨ ).**

(صحيح ابى داود ٣٤).

٤٧٨٦- إذا أقعد المؤمن في قبره أتي ثم شهد أن لا إله إلا الله و أن محمد رسول الله فذلك قوله: ( يثبت الله الذين آمنوا بالقول الثابت )

( صحيح ) ( خ ) عن البراء .

**٤٧٨٦- کاتێك ئیماندار لە گۆڕەکەیدا ڕاست دەکرێتەوە و شایەتمان دەهێنێ، ئەوەیە کەخوای گەورە دەفەرموێت: (( يثبت الله الذين امنوا بالقول الثابت ))[1] ( ابراهيم: ٢٧ ).**

(الصحيح ٣٩٦٣)

٤٧٨٧- المسلم إذا سئل في القبر يشهد أن لا إله إلا الله و أن محمدا رسول الله فذلك قوله تعالى: ( يثبت الله الذين آمنوا بالقول الثابت في الحياة الدنيا و في الآخرة )

( صحيح ) ( حم ق ٤ ) عن البراء

**٤٧٨٧- موسڵمان کاتێك لە گۆڕەکەیدا پرسیاری لێ دەکرێت شایەتی دەدات کە جگە لەخوا خوایەکی تر بەهەقنییە و، موحەمەدیش ڕەوانەکراوی خوای گەورەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: (( يثبت الله الذين امنوا بالقول الثابت في الحياة الدنيا و في الاخرة )) ( ابراهيم: ٢٧ ).**

(الصحيح ٣٩٦٣)

## بابەتی سورەتی الحجر

٤٧٨٨- السبع المثاني فاتحة الكتاب.

( صحيح ) ( حم ق ٤ ) عن عبادة

---

[1] **خوا بڕواداران دامەزراو دەکات لەسەر ووتەی کە (( لا اله الا الله )).**

**٤٧٨٨- (السبع المثانى[1])سورەتى (الفاتحه)يە.**

(الصحيح ابى داود ١٣١٠)

## بابەتى سورەتى (الإسراء)

٤٧٨٩- يقول العبد يوم القيامة: يا رب ألم تجرني من الظلم ؟ فيقول: بلى فيقول: إني لا أجيز على نفسي إلا شاهدا مني فيقول ( كفى بنفسك اليوم عليك شهيدا و بالكرام الكاتبين شهودا فيختم على فيه و يقال لأركانه: انطقي فتنطق بأعماله ثم يخلى بينه و بين الكلام فيقول: بعدا لكن و سحقا فعنكن كنت أناضل )

( صحيح ) ( حم م ن ) عن أنس

**٤٧٨٩- بەندە لە ڕۆژى قيامەتدا دەڵێت: خوايە تۆ پەنات نەدام لە ستەم؟ ئەويش دەفەرموێت:بەڵێ ، ئەويش دەڵێت: من ڕازى نابم بە شايەتێك نەبێت لە خۆم، ئيتر دەفەرموێت:((كفى بنفسك اليوم عليك حسيبا)) (الإسراء:١٤) هەروەها بەو نوسەرە ڕێزلێگيراوانە شايەتى دەدەن، ئيتر دەمى دادەخرێت و بە لاقەكانى دەوترێت: قسە بكەن دەربارەى كردەوەكانى، ئينجا ڕێگەى پێدەدرێت قسە بكات و دەڵێت: بەدبەختى بۆ ئێوە، من لە پێناوى ئێوەدا كۆششم دەكرد.**

(الترغيب ٣٦١٢)

٤٧٩٠- طائر كل إنسان في عنقه

( صحيح ) ( ابن جرير ) عن جابر

**٤٧٩٠- نامەى كردەوەكانى هەموو كەسێك بە گەردەنيەوەيە.**

(الصحيح ١٩٠٠)

٤٧٩١- طير كل عبد في عنقه

( صحيح ) ( عبد بن حميد ) عن جابر

**٤٧٩١- نامەى كردەوەكانى هەموو بەندەيەك هەڵواسراوە بەگەردنييەوە[2].**

(الصحيح ١٩٠٧)

---

[1] **لەو ئايەتەى خوا دەفەرموێت : (و لقد اتيناك سبعا المثاني).**

[2] **هەروەها (احمد) ڕيوايەتى كردووە.**

## بـابەتـی سورەتـی ( مريم )

٤٧٩٢- إذا أحب الله عبدا نادى جبريل: إن الله يحب فلانا فأحبه فيحبه جبريل فينادي جبريل في أهل السماء: إن الله يحب فلانا فأحبوه فيحبه أهل السماء ثم يوضع له القبول في الأرض.

( صحيح ) ( ق ) عن أبي هريرة .

**٤٧٩٢- ئەگەر خوای گەورە بەندەیەکی خۆشبوێت بانگی جبریل دەکات: من فلاّنە کەسم خۆش دەوێت تۆش خۆشت بوێت ئیتر لە ئاسمان جاردەدرێت و ئینجا خۆشەویستی بۆ دێتە خوار بۆ سەر زەوی، ئەوەش فەرموودەی خوای گەورەیە( ان الذین امنوا وعملوالصالحات سیجعل لهم الرحمن ودّا ) (مریم:٩٦) ئەگەر خوای گەورە ڕقی لەبەندەیەکیش بێت بانگی جبریل دەکات: بەڕاستی من ڕقم لە فلاّنە کەسە، دەکات لە ئاسماندا جاڕداداتو، ئیتر ڕقلێبوونی بۆ دادەبەزێتە سەر زەوی.**

(الضعيفة ٢٢٠٧)

## بـابەتـی سورەتـی ( طه )

٤٧٩٣- من نسي الصلاة فليصلها إذا ذكرها فإن الله قال: ( أقم الصلاة لذكري )

( صحيح ) ( م د ن هـ ) عن أبي هريرة

**٤٧٩٣- هەرکەسێك نوێژی لەبیرچوو، با هەرکات بیری کەوتەوە دەستبەجێ بیکات، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت:(( واقم الصلوة لذکری ))( طه:١٤ ).**

(الارواء ٢٦٣)

## بـابەتـی سورەتـی( الأنبيـاء )

٤٧٩٤- يحسب ما خانوك و عصوك و كذبوك و عقابك إياهم فإن كان عقابك إياهم بقدر ذنوبهم كان كفافا لا لك و لا عليك و إن كان عقابك إياهم دون ذنوبهم كان فضلا لك و إن كان عقابك إياهم فوق ذنوبهم اقتص لهم منك الفضل أما تقرأ كتاب الله: ( و نضع الموازين القسط ليوم القيامة الآية ؟ )

( صحيح ) ( حم ت ) عن عائشة

**٤٧٩٤- بەگوێرەی ناپاکی و یاخی بوون و بەدرۆخستنەوەیان بۆتۆ و بۆت هەیە سزایان بدەی، ئەگەر سزاکەت بۆ ئەوان بە گوێرەی تاوانەکانیان بوو ئەوە سەر بەسەرە، ئەگەریش سزاکەشت کەمتر بوو لە تاوانەکانیان ئەوە چاکەیە بۆ تۆ، ئەگەر سزاکەی تۆ زیاتر بوو لە تۆڵەی تاوانەکانیان تۆڵەی ئەوان لە تۆ دەکرێتەوە ئایا نە تخوێندۆتەوە لە قورئانی پیرۆزدا: ((ونضع الموازين القسط ليوم القيامة)) (الأنبياء: ٤٧).**

(المشكاة ٥٥٦١)

## بابەتی سورەتی (الحج)

٤٧٩٥- يقول الله تعالى: يا آدم! فيقول: لبيك و سعديك و الخير في يديك فيقول: أخرج بعث النار قال: و ما بعث النار؟ قال من كل ألف تسعمائة و تسعة و تسعين فعندها يشيب الصغير (و تضع كل ذات حمل حملها و ترى الناس سكارى و ما هم بسكارى و لكن عذاب الله شديد قالوا: يا رسول الله! و أينا ذلك الواحد؟ قال: أبشروا فإن منكم رجلا و من يأجوج و مأجوج ألف و الذي نفسي بيده أرجو أن تكونوا ربع أهل الجنة أرجو أن تكونوا ثلث أهل الجنة أرجو أن تكونوا نصف أهل الجنة ما أنتم في الناس إلا كالشعرة السوداء في جلد ثور أبيض أو كشعرة بيضاء في جلد ثور أسود أو كالرقمة في ذراع الحمار)

(صحيح) (حم ن) عن أبي سعيد

**٤٧٩٥- خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی ئادەم! ئەویش دەڵێت: فەرمانت بەجێیەو کامەرانی لەلای تۆیە و چاکە هەمووی بەدەستی تۆیە، دەفەرموێت: ڕەوانەکراوانی دۆزەخ دەربهێنە دەڵێت: ڕەوانەکراوی دۆزەخ چییە؟ دەفەرموێت: لەهەموو هەزار کەس نۆسەد و نەوەدو نۆ کەس، لەو کاتەدا منداڵ سەری سپی دەبێت (و تضع كل ذات حمل حملها وترى الناس سكارى وماهم بسكارى ولكن عذاب الله شديد) (الحج:٢) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! کێ لەئێمە ئەو یەکەیە؟ فەرمووی: مژدەتان لێ بێت، یەکێ لەئێوە و، هەزار لە یەئجوج و مەئجوج سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە، هیوادارم ئێوە چواریەکەی بەهەشتبن، هیوادارم سێ یەکەی بەهەشت بن، هیوادارم نیوەی بەهەشت بن ئێوە لەنێو خەڵکیدا وەکو تاڵە موویەکی ڕەش لە پێستی گایەکی سپیدان، یان وەکو تاڵە موویەکی سپی لە پێستی گەیەکی ڕەشدان، یان وەکو پەڵەیەك وان لە باسکی گوێدرێژێکدا.**

(الصحيح ٣٣٠٧)

## بابەتى سورەتى ( المؤمنون )

٤٧٩٦- ما منكم من أحد إلا له منزلان: منزل في الجنة و منزل في النار فإذا مات فدخل النار ورث أهل الجنة منزله فذلك قوله: ( هم الوارثون )

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي هريرة

**٤٧٩٦- هيچ كەسێك نيە لەنێوە دوو مەنزڵگاى نەبێت: يەكێكيان لەبەهەشت و يەكێكيان لە دۆزەخ جا كاتێك بمرێت و بچێتە دۆزەخەوە خەڵكى بەهەشت ئەو جێگايە بە ميراتى دەگرن، ئەوەيە فەرموودەى خواى گەورە:(( هم الوارثون )) ( المؤمنون : ١٠ ).**

(الصحيح ٢٢٧٨)

## بابەتى سورەتى ( الروم )

٤٧٩٧- البضع ما بين الثلاث إلى التسع

( صحيح ) ( طب ابن مردويه ) عن دينار بن مكرم .

**٤٧٩٧- ( البضع ) واتە لەنێوان سێ بۆ نۆيە[١] .**

(الصحيحة ٣٣٥٦)

## بابەتى سورەتى ( لقمان )

٤٧٩٨- خمس لا يعلمهن إلا الله: ( إن الله عنده علم الساعة و ينزل الغيث و يعلم ما في الأرحام و ما تدري نفس ماذا تكسب غدا و ما تدري نفس بأي أرض تموت إن الله عليم خبير) (لقمان:٣٤).

( صحيح ) ( حم الروياني ) عن بريدة .

**٤٧٩٨- پێنج شت هەيە تەنها خواى پەروەردگار دەيزانێت : بێگومان هاتنى كاتى دياريكراوى دواڕۆژ ، چەندو چۆنيەتى باراندەبارێت ، زانستى تەواو دەربارەى ئەوەى لە**

---

[١] ئەمەى فەرمووە سەبارەت بە لێكدانەوە ى فەرموودەى خواى گەورە ( في بضع سنين ) ( الروم: ٤ ).

**منداڵیدایە ، هیچ کەس بە مسۆگەری نازانێت بەیانی چی ڕوو دەدات ، وە هیچ کەسێك بە مسۆگەری نازانێت لە کام خاکدا دەمرێت.**

(الصحيحة ٢٩١٤)

٤٧٩٩- الظلم ثلاثة فظلم لا يغفره الله و ظلم يغفره و ظلم لا يتركه فأما الظلم الذي لا يغفره الله فالشرك قال الله: ( إن الشرك لظلم عظيم) و أما الظلم الذي يغفره فظلم العباد أنفسهم فيما بينهم و بين ربهم و أما الظلم الذي لا يتركه الله فظلم العباد بعضهم بعضا حتى يدبر لبعضهم من بعض ) .

( حسن ) ( الطيالسي البزار ) عن أنس.

**٤٧٩٩- ستەم سێ جۆرە: ستەمێك هەرگیز خوا لێی خۆش نابێت و،وستەمێکیش خوا لێی خۆش دەبێت، ستەمێکیش وازی لێ ناهێنێت، ئەو ستەمەی خوا لێی خۆش نابێت ئەومیە کەدەفەرموێت:(( أن الشرك لظلم عظيم )) (لقمان:١٣) ئەو ستەمەیش کە خوا لێی خۆش دەبێت ستەمی بەندەکانە لە نێو خۆیان و پەروەردگاریاندا، ئەو ستەمەیش کەوازی لێ ناهێنیت، ستەمی بەندەکانە لەیەکتری، تاکو خوای گەورە تۆڵەیان بۆ لەیەکتر دەکاتەوە.**

(الصحيحة ١٩٢٧)

## بابەتی سورەتی (الأحزاب)

٤٨٠٠- إني ذاكر لك أمرا و لا عليك أن لا تعجلي حتى تستأمري أبويك إن الله تعالى قال: (يا أيها النبي قل لأزواجك إلى قوله ( عظيما ) .

( صحيح ) ( ق ن هـ ) عن عائشة .

**٤٨٠٠- من بابەتێکت بۆ باس دەکەم و، پەلەیش مەکە لە وەڵامدانەوەیدا، تاکو ڕاوێژ دەکەیت بە باوکت و دایکت، خوای گەورە دەفەرموێت:(( ياأيها النبي قل لأزواجك )) (الأحزاب:٢٨) تاکو دەفەرموێت:(( عظيما )).**

(الصحيحة ٣٥٩٣)

## بابەتى سورەتى( يس )

٤٨٠١- هل تدرون أين تغرب هذه ؟ تغرب في عين حامية.

( صحيح ) ( د ) عن أبي ذر.

**٤٨٠١- ئايا دەزانى ئەوە[1] لە كوێ ئاوا دەبێت، لە چاوگەيەكى ئاگريندا ئاوادەبێت[2].**

## بابەتى سورەتى ( ص )

٤٨٠٢- إن عفريتا من الجن تفلت علي البارحة ليقطع على الصلاة فأمكنني الله منه فذعته و أردت أن أربطه إلى سارية من سواري المسجد حتى تصبحوا و تنظروا إليه كلكم فذكرت قول أخي سليمان ( رب اغفر لي و هب لي ملكا لا ينبغي لأحد من بعدي) ص : ١٣٥ ، فرده الله خاسئا ) .

( صحيح ) ( حم ق ن ) عن أبي هريرة .

**٤٨٠٢- دێوێك لە جنۆكەكان دوێنێ بەدومدا دەگەڕا بۆ ئەوەى نوێژەكەم لێ ببڕێت، بەلاَم خواى گەورە منى زاڵ كرد بەسەريدا و دەستم لە بينەقاقايناو، ويستم بيبەستمە بە يەكێك لە كۆڵەكەكانى مزگەوتەكەوە تاكو بەيانى هەمووتان تەماشاتان بكردايە، ئيتر وتەكەى سوليمانى برامم كەوتەوە ياد:(( رب أغفر لي وهب لي ملكا لا ينبغي لاحد من بعدي )) بۆيە خوا بە كەنەفتى وێڵى كرد.**

(الصحيحة ٩٨٧).

## بابەتى سورەتى ( الطور )

٤٨٠٣- البيت المعمور في السماء السابعة يدخله كل يوم سبعون ألف ملك ثم لا يعودون إليه حتى تقوم الساعة

( صحيح ) ( حم ن ك هب ) عن أنس .

---

[1] واته : خۆر.

[2] رواه النسائي في الكبرى في تفسير قوله تعالى ( و الشمس تجري المستقر لها ) ( يس : ٣٨ ).

**٤٨٠٣- ( البيت المعمور ) لە ئاسمانى حەوتەمە، هەموو رۆژێك حەفتا هەزار فريشتە دەچنە ناوى و جارێكى تر ناگەڕێتەوە ناوى تاكو رۆژى قيامەت[1].**

(الصحيحة ٤٧٧)

## بابەتى سورەتى ( الرحمن )

٤٨٠٤- لقد قرأتها - يعني سورة الرحمن - على الجن ليلة الجن فكانوا أحسن مردودا منكم كنت كلما أتيت على قوله ( فبأي آلاء ربكما تكذبان قالوا: و لا بشيء من نعمك ربنا نكذب فلك الحمد ) .

( حسن ) ( ت ) عن جابر.

**٤٨٠٤- من خوێندمەوە- واتە :سورەتى ( الرحمن )- لەسەر جنۆكەكان لە شەوى جنۆكەكاندا، ئەوان لە ئێوە چاكتر وەڵاميان دەدايەوە، هەموو جارێ كە دەگەشتمە ئايەتى( فبأى الاء ربكما تكذبان ) دەيانووت: لەهيچ شتێك لە بەهرەكانى پەروەردگارمان نكۆڵى ناكەين هەرچى سوپاس و ستايش هەيە هەر بۆ تۆيە.**

(الصحيحة ٢١٥٠)

## بابەتى سورەتى( الحشر )

٤٨٠٥- أما بعد فإن الله أنزل في كتابه ( يا أيها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة إلى آخر الآية ( يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله و لتنظر نفس ما قدمت لغد ) إلى قوله: (هم الفائزون) تصدقوا قبل أن لا تصدقوا تصدق رجل من ديناره تصدق رجل من درهمه تصدق رجل من بره تصدق رجل من تمره من شعيره لاتحقرن شيئا من الصدقة و لو بشق تمرة ) .

( صحيح ) ( م ) عن جرير .

**٤٨٠٥- لە پاش سوپاسى خوا :بەراستى خواى گەورە لە قورئاندا ئەمەى ناردۆتە خوار:(( يا أيها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة )) (النساء:١) تاكو كۆتايى ئايەتەكە(( ياأيها الذين**

---

[1] واتە : لەبەر فەرەبالغى جارێكى تر بەريان ناكەوێت بچنەوە ناوى.

**امنوا اتقوا الله ولتنظر نفسه ما قدمت لغد)) (الحشر:١٨) تاكو فەرموودەى خواى گەورە(هم الفائزون) (التوبه:٢٠) بەخشندەيى بكەن پێش ئەوەى تواناى ئەوەتان نەمێنێ، پياوێك دينارێكى بەخشى، پياوێك درهەمێكى بەخشى، پياوێك لە گەنمەكەى خۆى بەخشى، پياوێك لەخورماكەى خۆى بەخشى، پياوێك لە جۆكەى خۆى بەخشى، هيچ بەخشينێك بەكەم مەزانە ئەگەر بەلەتكە خورمايەكيش بووە.**

(المشكاة ٢١٠)

## بابەتى سورەتى (المطففين)

٤٨٠٦- إن العبد إذا أخطاء خطيئة نكتت في قلبه نكتـه سوداء فإن هـو نـزع و استغفر و تاب صقل قلبه و إن عاد زيد فيها حتى تعلو على قلبه و هو الران الذي ذكر الله تعالى ( كلا بل ران على قلوبهم ما كانوا يكسبون .

( حسن ) ( حم ت ن هـ حب ك هب ) عن أبي هريرة .

**٤٨٠٦- بەڕاستى بەندە كاتێك تاوانێك ئەنجام دەدات خاڵێكى ڕەش لە سەر دڵى دروست دەبێت، جا ئەگەر وازبهێنێت و داواى لێخۆشبوون بكات و بگەڕێتەوە دڵى ساف دەبێتەوە، ئەگەر بگەڕێتەوە سەرى زياد دەكات، تاكو سەر دڵى دادەپۆشێت، بەو شێوەى كەخواى گەورە باسى كردووە:((كلا بل ران على قلوبهم ماكانوا يكسبوه)) (المطففين:١٤).**

(الترغيب ٢٤٦٩)

## بابەتى سورەتى(الكوثر)

٤٨٠٧- أنزلت علي آنفا سورة ( بسم الله الرحمن الرحيم ( إنا أعطيناك الكوثر فصل لربك و انحر إن شانئك هو الأبتر)١ذ-٣، أتدرون ما الكوثر ؟ فإنـه نهر وعدنيـه ربي عليـه خير كثير هو حوضي ترد عليه أمتي يوم القيامة آنيته كعدد النجوم فيختلج العبد منهم فأقول: رب إنه من أمتي فيقول: ما تدري ما أحدث بعدك ) .

( صحيح ) ( م د ن ) عن أنس .

**٤٨٠٧- كەميّك پيّش ئيّستا سورەتى بسم الله الرحمن الرحيم (انا اعطيتك الكوثر فصل لربك وانحر ان شانئك هو الأبتر) (الكوثر:١-٣) بۆ دابەزى ئايا دەزانن (الكوثر) چييە؟ رووبارێكە پەروەردگارم بەڵێنى پێدام پێم ببەخشێ، چاكەى زۆرى لەسەرە، حەوزى منە و ئوممەتم دێن بۆلام بۆسەر ئەو حەوزە، قاپەكانى بەئەندازەى ئەستێرەكانى ئاسمانن، كەسانێكيان لێ دادەبڕێن ، منيش دەڵێم: خوايە ئەوە لەئوممەتى منە، ئەويش دەفەرموێت: تۆ نازانيت لە پاش تۆ چييان داهێناوە.**

(الصحيحة أبى داود ٧٥٣)

## بابەتى سورەتى (النصر)

٤٨٠٨– خبرني ربي أني سأرى علامة في أمتي فإذا رأيتها أكثرت من قول: سبحان الله و بحمده استغفر الله و أتوب إليه فقد رأيتها ( إذا جاء نصر الله و الفتح فتح مكة ( و رأيت الناس يدخلون في دين الله أفواجا فسبح بحمد ربك و استغفره إنه كان توابا ) .

( صحيح ) ( م ) عن عائشة .

**٤٨٠٨- پەروەردگارم ئاگادارى كردوومەتەوە كەنيشانەيەك دەبينم لە ئوممەتەكەم، كاتێك ببينم بە زۆرى بڵێم: پاكى و بێگەردى بۆ خوا، داواى لێخۆشبوون دەكەم و دەگەڕێمەوە بۆ لاى خوا، ئينجا من ئەوەم بينى: ((اذا جاو نصر الله والفتح)) (النصر:١) فەتحى مەككەيە ((ورأيت الناس يدخلون في دين الله أفواجا فسبح بحمد ربك واستغفره انه كان توابا)) (النصر:٢-٣).**

(الصحيحة:٣١٥٧)



# پەراوی
# ڕاوكردن و سەربڕین

٤٨٠٩- أتريد أن تميتها موتات ؟ هلا حددت شفرتك قبل أن تضجعها.

( صحيح ) ( ك ) عن ابن عباس .

**٤٨٠٩- ئایا دەتەوێت چەندین جار بیکوژیت؟ چەقۆکەت تیژ بکە پێش ئەوەی ئاژەڵەکە ڕاکێشیت بۆ سەربڕین.**

(الصحيحة:٢٤)

٤٨١٠- إن عطب منها شيء فانحره ثم اغمس نعله في دمه ثم اضرب صفحته ثم خل بينه و بين الناس فليأكلوه.

( صحيح ) ( حم د هـ ) عن ناجية الأسلمي .

**٤٨١٠- ئەگەر یەکێ کەوت ترسای مرداربێتەوە سەری ببڕە و، نەعلەکەی نوقم بکە لە خوێنەکەی و ، لە دونگەکەی بدە بە نەعلەکە و ، وازی لێ بهێنە تا خەڵکی بیخۆن.**

(المشكاة ٢٦٤١)

٤٨١١- إن عطب منها شيء فخشيت عليه موتا فاذبحها ثم اغمس نعلها في دمها ثم اضرب بها صفحتها و لا تطعم منها أنت و لا أحد من أهل رفقتك و اقسمها.

( صحيح ) ( حم د ) عن ابن عباس ( حم م هـ ) عنه عن ذؤيب بن حلحلة وليس لذؤيب حديث غيره .

**٤٨١١- ئەگەر یەکێ کەوت و ترسای مرداربێتەوە، سەریببڕە و نەخۆت و نەکەس و کارت لێی مەخۆن بەڵکو دابەشی بکەن.**

(المشكاة ٢٦٣٥)

٤٨١٢- إن الله تعالى كتب الإحسان على كل شيء فإذا قتلتم فأحسنوا القتلة و إذا ذبحتم فأحسنوا الذبحة و ليحد أحدكم شفرته و ليرح ذبيحته.

( صحيح ) ( حم م ٤ ) عن شداد بن أوس .

**٤٨١٢- خوای گەورە چاکەی لەسەر هەموو شتێك نووسیوە، جاکاتێك نێچیرێك دەکوژن بەچاکی بیکوژن، ئەگەر سەریشتان بڕی بەجوانی سەری ببڕن، چەقۆتانیش تیژ بکەن و، سەربڕاوەکەشتان ئاسوودە بکەن[1].**

(الأرواء ٢٢٣٢)

٤٨١٣- إن الله محسن يحب الإحسان فإذا قتلتم فأحسنوا القتلة و إذا ذبحتم فأحسنوا الذبح و ليحد أحدكم شفرته ثم ليرح ذبيحته.

( صحيح ) ( طب ) عن شداد بن أوس .

**٤٨١٣- خوای گەورە چاکەکارەو حەز لە چاکە دەکات جا ئەگەر نێچیرەکەتان کوشت بەچاکی بیکوژنەوەو ئەگەر سەرتان بڕی بە جوان سەری ببڕن با هەر یەکێك لە ئێوە چەقۆکەی تیژ بکات و سەربڕاوەکەی ئاسوودە بکات.**

(الأرواء ٢٢٣٢)

٤٨١٤- أمر الدم بما شئت و اذكر اسم الله عز و جل.

( صحيح ) ( حم د هـ ك ) عن عدي بن حاتم .

**٤٨١٤- خوێنەکەی بڕێژە بەهەر شتێك دەتەوێت و، ناوی خوای لەسەر بهێنە.**

(الأرواء ٤٠٨٣)

٤٨١٥- أنهر الدم بما شئت و اذكر اسم الله عليه.

( صحيح ) ( ن ) عن عدي بن حاتم .

**٤٨١٥- خوێنەکەی هەڵنیشێنە بەهەر چی دەتەوێ و[2] ، ناوی خوای لەسەر بهێنە.**

(الأرواء ٢٥٢٢)

٤٨١٦- ذكاة الجنين ذكاة أمه .

( صحيح ) ( د ك ) عن جابر ( حم د ت هـ حب قط ك ) عن أبي سعيد ( ك ) عن أبي أيوب وأبي هريرة ( طب) عن أبي أمامة وأبي الدرداء وكعب بن مالك.

---

[1] **مەناوی دەڵێت : ئەمە یەکێکە لە بنچینەکانی ئایین.**

[2] **گیانی دەربهێنە بەهەر شتێك جگە لە دگان و نینۆك.**

**٤٨١٦- سەربڕینی کۆرپەلەی ناو سك، سەربڕینی دایکیتی.**

(الأرواء ٢٦٠٦)

٤٨١٧- سموا الله عليه و كلوه.

( صحيح ) ( خ هـ ) عن عائشة.

**٤٨١٧- ناوی خوای لەسەر بهێنن و بیخۆن.**

(غاية المرام ٤٥)

٤٨١٨- كل ما فرى الأوداج ما لم يكن قرض سن أو حز ظفر.

( صحيح ) ( طب ) عن أبي أمامة.

**٤٨١٨- هەرچی شتێك دەمارەکەی ببڕێت دروستە، جگە لە قە پی ددان و بڕینی نینۆك.**

(الصحيحة ٢٠٢٩)

٤٨١٩- كل ما ردت عليك قوسك.

( صحيح ) ( حم ) عن عقبة بن عامر وحذيفة بن اليمان ( حم د ) عن ابن عمرو ( هـ ) عن أبي ثعلبة الخشني.

**٤٨١٩- هەرچی شتێك کەوانەکەت بۆت بگێڕێتەوە[1].**

(الصحيحة ٢٠٢٨)

٤٨٢٠- ملعون من سب أباه ملعون من سب أمه ملعون من ذبح لغير الله ملعون من غير تخوم الأرض ملعون من كمه أعمى عن طريق ملعون من وقع على بهيمة ملعون من عمل بعمل قوم لوط.

( صحيح ) ( حم ) عن ابن عباس.

**٤٨٢٠- نەفرین لیٚ کراوە ئەو کەسەی جنێو بەباوکی خۆی بدات، نەفرین لێکراوە ئەو کەسەی جنێو بەدایکی خۆی بدات، نەفرین لیٚ کراوە کەسێك قوربانی بۆ جگە لە خوای گەورە بکات، نەفرین لیٚ کراوە کەسێك سنوورەکانی زەوی بگۆڕێت، نەفرین لێکراوە کەسێك ڕیٚ لە نابینایەك بگۆڕێت، نەفرین لێکراوە کەسێك بکەوێتە سەر ئاژەڵێك[2]، نەفرین لیٚ کراوە کەسێك کاری قەومی ( لوط ) ئە نجام بدات[3].**

(المشكاة ٣٥٨٣)

---

[1] واتە : بۆت دروستە خواردنی.

[2] واتە : لەگەڵی جووت بێت.

[3] نێر بازی بکات.

٤٨٢١- ما أنهر الدم و ذكر اسم الله عليه فكلوه ليس السن و الظفر و سأحدثكم عن ذلك أما السن فعظم و أما الظفر فمدى الحبشة.

( صحيح ) ( حم ق ٤ ) عن رافع بن خديج.

**٤٨٢١- ئەوەی خوێن بەڕژێنێت و ناوی خوای لەسەر ببات، بیخۆن، جگە لەنینۆك و ددان، ئەوەشتان بۆ باس دەكەم، ددان لەبەر ئەوەی ئێسقانە و، نینۆكیش چەقۆی حەبەشەیە.**

(الأرواء ٢٥٩٦)

٤٨٢٢- أحلت لنا ميتتان و دمان فأما الميتتان: فالحوت و الجراد و أما الدمان: فالكبد و الطحال.

( صحيح ) ( هـ ك هق ) عن ابن عمر .

**٤٨٢٢- دوو مردارەوە بوو و، دوو خوێنمان بۆ ڕەوا كراوە،دوو مردارەوە بوەكە ماسی و كوللەیە، دوو خوێنەكەش: جگەر و سپڵە.**

(الصحيحة ١١١٨)

٤٨٢٣- أكل كل ذي ناب من السباع حرام.

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي هريرة .

**٤٨٢٣- خواردنی هەموو ئاژەڵێكی نینۆكداری دڕندە قەدەغەیە.**

(الأرواء ٢٥٥٣)

٤٨٢٤- إن الله و رسوله ينهيانكم عن لحوم الحمر الأهلية فإنها رجس من عمل الشيطان.

( صحيح ) ( حم ق ن هـ ) عن أنس .

**٤٨٢٤- بەڕاستی خوا و پێغەمبەرەكەی گۆشتی گوێدرێژیماڵیان لەسەر قەدەغە كردوون، چونكە چەپەڵە و لەكاری شەیتانە.**

(الأرواء ٢٥٥٠)

٤٨٢٥- ألا إني أوتيت الكتاب و مثله معه ألا يوشك رجل شبعان على أريكته يقول: عليكم بهذا القرآن فما وجدتم فيه من حلال فأحلوه و ما وجدتم فيه من حرام فحرموه ألا لا يحل لكم لحم الحمار الأهلي و لا كل ذي ناب من السبع و لا لقطة معاهد إلا أن يستغني عنها صاحبها و من نزل بقوم فعليهم أن يقروه فإن لم يقروه فله أن يغصبهم بمثل قراه.

( صحيح ) ( حم د ) عن المقدام بن معد يكرب .

**٤٨٢٥- من قورئانم بۆ هاتۆتە خوار و ئەوەندەی تـریش لەگەڵیدا، دوور نییە کەسێکی تێـر لەسەر تەختەکەی[1] خۆی بڵێت: کـار بـەقورئان بکـەن، هەرچـیتان تیـا بینـی ڕەوایـە بـەڕەوای بزانن و، هەرچیتان تیا بینی قەدەغە کراوییە قەدەغەی بزانن، گۆشتی گوێ درێـژ ڕەوا نییە بۆ ئێوە و، هەروەها ئەدڕنـدەی نینۆکـدار و نـەدۆزراوەی کەسێکی خـاوەن پـەیمانیش، مەگـەر خاوەنەکەی لـێ بێنیـاز بێـت، هەرکەسێکیش لایدایـە لای کەسـانێك پێویـستە میوانـداری لێ بکەن، ئەگەر نا بۆی هەیە بایی ئەوەندەیان بەزۆر لێ داگیر بکات.**

(المشكاة ١٦٣)

٤٨٢٦- الضب لست آكله و لا أحرمه .

( صحيح ) ( حم ق ت ن هـ ) عن ابن عمر.

**٤٨٢٦- بزن مژە[2] نەگۆشتی دەخۆم و نەقەدەغەشی دەکەم[3].**

(المشكاة ٤١١٠)

٤٨٢٧- كل ذي ناب من السباع فأكله حرام.

( صحيح ) ( م ن ) عن أبي هريرة.

**٤٨٢٧- هەموو نینۆکداری دڕندە خواردنی قەدەغەیە.**

(غاية المرام ٤١)

٤٨٢٨- كل شيء قطع من الحي فهو ميت.

( صحيح ) ( حل ) عن أبي سعيد.

**٤٨٢٩- هەموو پارچەیەك لە لاشەی زیندوو قرتێندرابێت قەدەغەیە.**

٤٨٢٩- ما قطع من البهيمة و هي حية فهو ميتة.

( صحيح ) ( حم د ت ك ) عن أبي واقد ( هـ ك ) عن ابن عمر ( ك ) عن أبي سعيد ( طب ) عن تميم.

---

[1] قەنەفەی خەوتن ، یان تەختی پیاو ما قوڵان – یان کورسی دانیشتن.

[2] (الضَبّ) بزن مژە – سوسەمار – گیاندارێکە لە قۆریلە دەچێت بەڵام زۆر گەورەیە.

[3] ئەمەی دەفەرموێت : موسوڵمانان بە کۆی ڕا لەسەر ئەوەن کە کوشتنی بزن مژە حەڵاڵە بخورێت ، جگە لە حەنەفییەکان نەبێت بە مەکروهیان زانیوە ، ئەوەشی (قاضی عیاض) ، باسی کردووە لە قەدەغەکردنی بۆچوونێکی پەسەند نی یە.

**٤٨٢٩- ئەوەى لەئاژەڵى زيندوو ببڕدرێت ئەوە مردارەوە بووە.**

(غاية المرام ٤٦)

٤٨٣٠- يكون في آخر الزمان قوم يجبون أسنمة الإبل و يقطعون أذناب الغنم ألا فما قطع من حي فهو ميت .

( صحيح ) ( هـ ) عن تميم الداري .

**٤٨٣٠- لە كۆتايى زەماندا كەسانێك حەزايان لە دونگەى سەرپەرشتى وشترە و كلكى بزنيش بە زيندووى دەبڕن، بەڵێ ئەوەى لەزيندوو بڕابێت مردارەوە بووە.**

(غاية المرام ٤١)

٤٨٣١- نهى عن أكل الجلالة و ألبانها.

( صحيح ) ( د ت هـ ك ) عن ابن عمر.

**٤٨٣١- پێغەمبەرى خوا ( ﷺ ) گۆشت و شيرى ئەو ئاژەڵى پيسخۆرى قەدەغە كردووە.**

(الأرواء ٢٥٧٠)

٤٨٣٢- نهى عن أكل الضب.

( حسن ) ( ابن عساكر ) عن عائشة ( د ) عن عبدالرحمن بن شبل.

**٤٨٣٢- پێغەمبەرى خوا ( ﷺ ) گۆشتى بزن مژەى قەدەغەى كردووە.**

(الصحيحة ٢٣٩٠)

٤٨٣٣- نهى عن أكل المجثمة - و هي التي تصبر بالنبل -.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي الدرداء.

**٤٨٣٣- پێغەمبەرى خوا ( ﷺ )خواردنى گۆشتى ئەو ئاژەڵەى قەدەغەكردووە كە دەبەسترێتەوە و دەكرێتە نيشانە و تيرباران دەكرێن هەتا مردار دەبێتەوە .**

(الصحيحة ٢٣٩١)

٤٨٣٤- نهى عن أكل كل ذي ناب من السباع.

( صحيح ) ( ق ٤ ) عن أبي ثعلبة.

**٤٨٣٤- پێغەمبەرى خوا ( ﷺ ) خواردنى هەموو دڕندەيەكى نينۆكدارى قەدەغە كردووە.**

(الأرواء ٢٥٥٥)

٤٨٣٥- نهى عن أكل كل ذي ناب من السباع و عن أكل ذي مخلب من الطير.

( صحيح ) ( حم م د ن ) عن ابن عباس.

**٤٨٣٥- پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خواردنی هەموو دڕندەیەكی كەڵبەدارو هەموو باڵندەیەكی نینۆكداری قەدەغەكردووە[1].**

(الأرواء ٢٥٥٥)

٤٨٣٦- نهى عن أكل لحوم الحمر الأهلية.

( صحيح ) ( ق ) عن البراء وجابر وعلي وابن عمر وأبي ثعلبة.

**٤٨٣٦- پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) خواردنی گۆشتی گوێدرێژیماڵی قەدەغە كردووە.**

(الصحيحة ٣٥٨)

٤٨٣٧- لا تحل النهبى و لا كل ذي ناب من السباع و لا تحل المجثمة.

( صحيح ) ( حم ن ) عن أبي ثعلبة.

**٤٨٣٧- ماڵی دزراو ڕەوانییە، نەهیچ دڕندەیەكی كەڵبەدارو نە گیانداریك بە نیشانە دا كرابێت تاكو دەكوژرێن ڕەوانییە خواردنیان ڕەوا نیە.**

(الصحيحة ٢٣٩١)

٤٨٣٨- لا تذبحن ذات در.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة.

**٤٨٣٨- ئاژەڵی شیردار سەر مەبڕە.**

(الصحيحة ١٦٣١)

٤٨٣٩- لا عقر في الإسلام.

( صحيح ) ( د ) عن أنس.

**٤٨٣٩- لەئیسلامدا ئاژەڵ سەر ببڕدرێت لەسەر گۆڕ دروست نیە[2].**

**( الصحيحه ٢٤٣٦ )**

---

[1] **وەكو هەڵۆ و قەلەڕەش و داڵەكەر خۆرە.**

[2] **لەسەردەمی نەفامیدا وشتریان لەسەر گۆڕی مردووەكان سەر دەبڕی، دەیانووت: خاوەنی گۆڕەكە لەژیانیدا بۆ میوان سەری دەبڕی و ئێمە بەم شێوە لە پاش مردنی پاداشتی دەدەینەوە.**

٤٨٤٠- اذبحوا لله في أي شهر كان و بروا لله و أطعموا.

( صحيح ) ( د ن هـ ك ) عن نبيشة.

**٤٨٤٠- قوربانی بکەن بۆ خوا لەهەر مانگێکدا بێت[1]، چاکە بکەن لە پێناو خوادا و، خواردن ببەخشن.**

(الارواء ١١٦٧)

٤٨٤١- إن لهذه الإبل أوابد كأوابد الوحش فإذا غلبكم منها شيء فافعلوا به هكذا.

( صحيح ) ( حم ق ٤ ) عن رافع بن خديج .

**٤٨٤١- ئەم وشترانە دڕندە وياخيان هەيە وەکو دڕندەکانی دەشت و دەر، جا ئەگەر کارێکی لەو جۆرەيان کرد ئێوەش ئاوايان لێ بکەن[2].**

(المشكاة ٤٠٧١)

٤٨٤٢- العتيرة حق .

( حسن ) ( حم ن ) عن ابن عمرو.

**٤٨٤٢- عەتيرە[3] ڕەوايە.**

(الارواء ١١٨١)

٤٨٤٣- الفرع حق و إن تتركوه حتى يكون بكرا شعريا ابن مخاض أو ابن لبون فتعطيه أرملة أو تحمل عليه في سبيل الله خير من أن تذبحه فيلزق لحمه بوبره و تكفأ إناءك و توله ناقتك.

( حسن ) ( حم د ن ك ) عن ابن عمرو.

**٤٨٤٣- نۆبەرە ڕەوايە، باشتر وايە وازی لێ بهێنن تاکو گەورە دەبێت و خڕکەڵە دەبێت و دەبێتە ساڵێك و توندوتۆڵ دەبێت، بيبەخشێت يان سواری بيت لە پێناوی خوادا، چاکترە لەوەی سەری ببڕيت گۆشتەکەی بلکێ بەتووکەکەيەوە و، مەنجەڵە شيرەکەت برێژيت و، دايکەکەشی بەزۆر بەريە لای بێچووەکەی.**

(الارواء ١١٦٧)

---

[1] کاتێك وشتريان دەگەشتە سەد وشتر، لەڕەجەبدا وشترێکيان سەر دەبڕی بۆ بتەکانيان (فرع) يان پێ دەوت، ئيتر پێغەمبەر ﷺ ئەوەی قەدەغە کرد و فەرمانی کرد تەنها بۆ خوای گەورە قوربانی بکرێت.

[2] واتە: تيری تێکردن وەکو ئەو نێچيرەی دەستت پێی ناگات.

[3] مەناوی دەڵێت:هەندێکيان دەيانووت: ئەگەر فلانە کارم بۆ ڕێکەوێت دەمەڕ سەر دەبڕم لەڕەجەبدا، لەسەرەتای ئيسلام ئەمە هەبوو، دواتر نەسخ کرا.

٤٨٤٤- لا فرع و لا عتيرة.

( صحيح ) ( حم ق ٤ ) عن أبي هريرة.

**٤٨٤٤- نه( فرع ) نۆبەرە و، نه ( عتيره )[1] لەخۆگرتنى مانگى رەجەب رەوا نين.**

(الارواء ١١٦٦)

٤٨٤٥- إذا ذبح أحدكم فليجهز.

( صحيح ) ( هـ عد هب ) عن ابن عمر .

**٤٨٤٥- ئەگەر كەسێكتان ويستى ئاژەڵ سەرببڕێت با دەست و بردى لێ بكات و خێرا ملى ببڕێتەوە.**

(الصحيحة ٢١٣٠)

## بابەتى قوربانى

٤٨٤٦- إذا دخل العشر و أراد أحدكم أن يضحي فلا يمس من شعره و لا من بشره شيئا.

( صحيح ) ( م ن هـ ) عن أم سلمة .

**٤٨٤٦- كە چوونە دەى ( ذي الحجة ) و، كەسێكتان ويستى قوربانى بكات[2]، با لە قژو نينۆكى خۆى نەگرێت.**

(الارواء ١٠٤٩)

٤٨٤٧- إذا رأيتم هلال ذي الحجة و أراد أحدكم أن يضحي فليمسك عن شعره و أظفاره

( صحيح ) ( م ) عن أم سلمة .

**٤٨٤٧- ئەگەر مانگى ( ذي الحجة ) تان بينى و، كەسێك لەئێوە ويستى قوربانى بكات، با لەقژو نينۆكى خۆى نەگرێت.**

(المشكاة ١٤٥٩)

٤٨٤٨- إذا ضحى أحدكم فليأكل من أضحيته

( حسن ) ( حم ) عن أبي هريرة .

**٤٨٤٨- ئەگەر كەسێك لەئێوە قوربانى كرد با لەگۆشتى قوربانيەكەى خۆى بخوات.**

(الصحيحة ٣٥٦٣)

---

[1] (فرع) **نۆبەرەيە ، (عتيرة) لەخۆگرتنى ئاژەڵ بۆ مانگى رەجەب.**

[2] **لەئيحرامدا نەبێت.**

٤٨٤٩- أربع لا يجزين في الأضاحي: العوراء البين عورها و المريضة البين مرضها و العرجاء البين ظلعها و العجفاء التي لا تنقي.

( صحيح ) ( مالك حم ٤ حب ك هق ) عن البراء .

**٤٨٤٩- چوار جۆر بری قوربانی ناكەون: كوێری ئاشكرا، نەخۆشی ئاشكرا، شەلێكی ئاشكرا، ئاژەڵی زۆر لەڕو لاواز.**

(الارواء ١١٣٤)

٤٨٥٠- اركبوا الهدي بالمعروف حتى تجدوا ظهرا.

( صحيح ) ( حب ) عن جابر .

**٤٨٥٠- بەچاكی سواری وڵاخی قوربانی بن، تا وڵاخێكتان دەستدەكەوێت سواری بن.**

(المشكاة ٢٦٣٤)

٤٨٥١- إن الجذعة يجزي مما تجزي منه الثنية

( صحيح ) ( حب ) عن جابر .

**٤٨٥١- وشتری پێنج ساڵان وەكو وشتری شەش ساڵان دەگونجێ بۆ قوربانی.**

(الارواء ١١٤٦)

٤٨٥٢- إن الجذع[1] من الضأن يوفي مما يوفي منه الثني من المعز

( صحيح ) ( د ن هـ ك هق ) عن مجاشع بن مسعود .

**٤٨٥٢- مەڕی یەك ساڵان وەكو بزنی دوو ساڵانە لەقوربانیدا.**

(الارواء ١١٣٢)

٤٨٥٣- إن أول ما نبدأ به في يومنا هذا أن نصلي ثم نرجع فننحر فمن فعل ذلك فقد أصاب سنتنا و من ذبح قبل ذلك فإنما هو لحم قدمه لأهله ليس من النسك في شيء

( صحيح ) ( حم ق ٣ ) عن البراء .

**٤٨٥٣- یەكەمین كاری ئەم ڕۆمان بەنوێژ دەست پێ دەكەین، ئینجا دەگەڕێنیەوە و، قوربانی سەردەبڕین، هەر كەسێك ئەوە بكات سوننەتی ئێمەی پێكاوە، هەر كێش پێش**

---

[1] (الجذع) **بۆ وشتر چوار ساڵی تەواو كردبێت و پێی نابێتە ساڵی پێنجەم ، لە ڕەشەوڵاخدا ئەوەیە دوو ساڵی تەواو كردبێت بچێتە ساڵی سێهەمەوە، لە مەڕو بزندا ئەوەیە بە هەشت نۆ مانگی تەمەنی كردبێت ، ئیتر بەیەك ساڵانان دادەنرێ و حیسابی یەك ساڵانی بۆ دەكرێت ئەگەر قەلەو جوان و تێكسمراو بێت.**

**ئەوە سەری ببڕێت، ئەوە گۆشتێکەو بۆ کەس وکاری خۆی کردووە، پەیوەندی نییە بەقوربانی یەوە.**

(المشكاة ١٤٣٥)

٤٨٤٤- إن أول منسك يومكم هذا الصلاة.

( حسن ) ( طب ) عن البراء .

**٤٨٥٤- یەکەم خوا پەرستنی ئەم ڕۆژەتان نوێژ کردنە.**

**( الصحيحه ١٦٧٨ )**

٤٨٤٤- إنا كنا نهيناكم عن لحومها أن تأكلوها فوق ثلاث لكي تسعكم فقد جاء الله بالسعة فكلوا و ادخروا و اتجروا ألا و إن هذه الأيام أيام أكل و شرب و ذكر الله.

( صحيح ) ( د ) عن نبيشة .

**٤٨٥٥- ئێمە گۆشتی قوربانی مان قەدەغە کرد بوو لێتان لە سێ ڕۆژدا زیاتر، بۆ ئەوەی بەشتان بکات، وا خوای گەورە بۆی فراوانی کردن، بۆیە بخۆن و پاشەکەوت بکەن و مامەڵەی لەگەڵ خودا پێوە بکەن ئاگاداربن، ئەم ڕۆژانە[1] ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەو یادی خوان.**

(الصحيحة ١٧١٣)

٤٨٥٦- إني كنت نهيتكم: أن تأكلوا لحوم الأضاحي إلا ثلاثا فكلوا و أطعموا و ادخروا ما بدا لكم و ذكرت لكم: أن لا تنبذوا في الظروف: الدباء و المزفت و النقير و الحنتم انتبذوا فيما رأيتم و اجتنبوا كل مسكر و نهيتكم عن زيارة القبور فمن أراد أن يزور فليزر و لا تقولوا هجرا.

( صحيح ) ( ن ) عن بريدة .

**٤٨٥٦- من لەئێوەم قەدەغە کرد بوو: کە تەنها سێ ڕۆژ لەگۆشتی قوربانی بخۆن ، بەڵام لێی بخۆن و لێی ببەخشن و لێی پاشەکەوت بکەن و ئەوەندەی بەچاکی دەزانن ، پێشم وتبوون: شەربەت دروست مەکەن لە کولەکەی وشك و قاپی سواخ کراو بەقیرو داری هەڵکۆڵراو دییەگ یان لەگۆزەی سەوز، بەلام بەئارەزووی خۆتان ئەوانە بەکار بهێنن و لەسەر خۆشکەر دوور بکەونەوە، سەردانی گۆڕستانم لێ قەدەغەکردبوون، کێ دەیەوێت سەردان بکات با بیکات،بەلام قسەی نابەجێ مەکەن.**

(الصحيحة ٨٨٤)

---

[1] **ايام التشريق.**

٤٨٥٧- إني كنت نهيتكم عن زيارة القبور فزوروها لتذكركم زيارتها خيرا و كنت نهيتكم عن لحوم الأضاحي بعد ثلاث فكلوا و أمسكوا ما شئتم و كنت نهيتكم عن الأشربة في الأوعية فاشربوا في أي وعاء شئتم و لا تشربوا مسكرا.

( صحيح ) ( حم م ت ن ) عن بريدة .

**٤٨٥٧- من سەردانی گۆڕستانم لێتان قەدەغە کرد بوون، بەڵام سەردانی بکەن با سەردانەکە چاکەتان یاد بخاتەوە، گۆشتی قوربانیشم لێ قەدەغە کرد بوون لەدوای سێ ڕۆژ ، بەڵام لێی بخۆن و چەندتان دەوێت لێی هەڵگرن ، هەروەها خواردنەوەم لە هەندێ قاپدا لێ قەدەغە کردبوون ، بەڵام لەهەر قاپێکدا حەز دەکەن بخۆنەوەو، خۆتان لەبێ هۆشکەر بپارێزن.**

(احكام الجنائز ١٧٧)

٤٨٥٨- إني كنت نهيتكم عن لحوم الأضاحي فوق ثلاث كيما تسعكم فقد جاء الله بالخير فكلوا و تصدقوا و ادخروا إن هذه الأيام أيام أكل و شرب و ذكر الله.

( صحيح ) ( حم م ن هـ ) عن نيشة .

**٤٨٥٨- من لەسەرووی سێ ڕۆژەوە گۆشتی قوربانیم لێ قەدەغە کرد بوون، بەمەبەستی ئەوەی بەشتان بکات، خوای گەورە چاکەی بۆ هێنان، بیخۆن و بیبەخشن و پاشەکەوتی بکەن، ئەم ڕۆژە ڕۆژانی خواردنەوەو، یادی خوان.**

(صحيح النسائي ٤٢٣)

٤٨٥٩- البقرة عن سبعة و الجزور عن سبعة.

( صحيح ) ( حم د ) عن جابر .

**٤٨٥٩- مانگا بۆ حەوت کەس و، وشتر بۆ حەوت کەس دەکرێتە قوربانی[1].**

(الارواء ١٠٤٦)

٤٨٦٠- البقرة عن سبعة و الجزور عن سبعة في الأضاحي.

( صحيح ) ( طب ) عن ابن مسعود .

**٤٨٦٠- مانگا بۆ حەوت کەس و، وشتر بۆ حەوت کەس دەرکرێنە قوربانی.**

(الروض النضير ٦١٣)

---

[1] **( ابن العربی ) فەرموویەتی: هەموو زانایان لەسەر ئەم بۆ چوونەن تەنها ( مالك ) نەبێت. ئەمەیش مەسەلەیەکە ڕەتناکرێتەوە.**

٤٨٦١- الجزور عن سبعة.

( صحيح ) ( الطحاوي ) عن أنس .

**٤٨٦١- وشتر بۆ حەوت کەس.**

(الروض النضير ٦١٣)

٤٨٦٢- دم عفراء أحب إلى الله من سوداوين.

( حسن ) ( حم ك ) عن أبي هريرة .

**٤٨٦٢- وڵاخی سپی باو[1] بەلای خواوە خۆشترە لەڕەشە وڵاخ.**

(الصحيحة ١٨٦١)

٤٨٦٣- دم عفراء أزكى عند الله من دم سوداوين.

( حسن ) ( طب ) عن كثيرة بنت سفيان .

**٤٨٦٣- خوێنی وڵاخی سپی لەلای خوا پەسەند ترە لەخوێنی ڕەشە وڵاخ.**

(الصحيحة ١٨٦١)

٤٨٦٤- ضحوا بالجذع من الضأن فإنه جائز .

( صحيح ) ( حم طب ) عن أم بلال.

**٤٨٦٤- بەرخ بکەنە قوربانی دروستە[2].**

(الضعيفة ٦٥)

٤٨٦٥- على أهل كل بيت أن يذبحوا شاة في كل رجب و في كل أضحى شاة

( حسن ) ( طب ) عن مخنف بن سليم

**٤٨٦٥- وا چاکە هەموو ماڵێك لەڕەجەبدا مەڕێك سەربڕن و[3]، لەهەموو قوربانیکیشدا مەڕێك سەربڕن.**

٤٨٦٦- يا أيها الناس ! إن على أهل كل بيت في كل عام أضحية و عتيرة[4]

( حسن ) ( حم ٤ ) عن مخنف بن سليم

---

[1] بۆ قوربانی.

[2] بەمەرجێ قەڵەو پیاکەوتوو تێکسمڕاو بێت دروستە لەشەش مانگ زیاتر بێت.

[3] سوننەتە، چەندین زانایش یەکڕاییان باسکردووە لەسەر واجب نەبوونی.

[4] سەربڕینی ئاژەڵ لە قوربانیدا.

**٤٨٦٦- خەڵكینە! هەموو ماڵێك پێویستە دوو قوربانی بكەن لەڕەجەب و قورباندا.**

(المشكاة ١٤٧٨)

٤٨٦٧- كلوا لحوم الأضاحي و ادخروا

( صحيح ) ( حم ك ) عن أبي سعيد وقتادة بن النعمان

**٤٨٦٧- گۆشتی قوربانی بخۆن و لێشی پاشەكەوت بكەن.**

(الصحيحة ٣٥٦٣)

٤٨٦٨- كنت نهيتكم عن لحوم الأضاحي فوق ثلاث ليتسع ذوو الطول على من لا طول له فكلوا ما بدا لكم و أطعموا و ادخروا

( صحيح ) ( ت ) عن بريدة

**٤٨٦٨- سێ ڕۆژ زیاتر گۆشتی قوربانی م لێ قەدەغە كردبوون، بۆ ئەوەی دەست ڕۆیشتووەكان یارمەتی هەژارەكان بدەن، بەڵام بخۆن و هەڵگرن بەئارەزووی خۆتان.**

(الصحيحة ٢٠٤٨)

٤٨٦٩- كان يذبح أضحيته بيده

( صحيح ) ( حم ) عن أنس

**٤٨٦٩- پێغەمبەر ﷺ قوربانی خۆی بەدەستی خۆی سەر دەبڕی.**

(صحيح ابن ماجة ٣١٥٥)

٤٨٧٠- كان يضحي بكبشين أقرنين أملحين و كان يسمي و يكبر

( صحيح ) ( حم ق ن هـ ) عن أنس

**٤٨٧٠- پێغەمبەر ﷺ دوو بەرانی بەڵەكی شاخداری كردە قوربانی ، ناوی خوای هێنا و ( الله اكبر)ی كرد.**

(صحيح ابي داود ٢٧٩٤)

٤٨٧١- كان ينحر أضحيته بالمصلى

( صحيح ) ( خ د ن هـ ) عن ابن عمر

**٤٨٧١- پێغەمبەر ﷺ قوربانی خۆی لەسوژدەگای جەژن سەر دەبڕی[1].**

(المشكاة ١٤٣٨)

---

[1] **بۆ ئەوەی خەڵكیش چاوی لێ بكەن و قوربانی سەر بڕن.**

٤٨٧٢- ليأكل كل رجل من أضحيته.

( صحيح ) ( طب حل ) عن ابن عباس.

**٤٨٧٢- با هەموو كەس لە قوربانی خۆی بخوات.**

(الصحيحة ٣٥٦٣)

٤٨٧٣- من باع جلد أضحيته فلا أضحية له.

( حسن ) ( ك هق ) عن أبي هريرة.

**٤٨٧٣- هەر كەسێك پێستی قوربانی یەكەی بفرۆشێت قوربانی یەكەی دروست بەرناكەوێت[1].**

٤٨٧٤- من ذبح بعد الصلاة تم نسكه و أصاب سنة المسلمين.

( صحيح ) ( خ ) عن البراء.

**٤٨٧٤- هەر كەسێك لەدوای نوێژی جەژن قوربانی سەر ببڕێت، خوا پەرستنەكەی تەواوە و، سوننەتی موسوڵمانانی پێكاوە.**

(المشكاة ١٤٣٧)

٤٨٧٥- من ذبح قبل الصلاة فإنما يذبح لنفسه و من ذبح بعد الصلاة فقد تم نسكه و أصاب سنة المسلمين

( صحيح ) ( خ ) عن أنس

**٤٨٧٥- هەركەسێك پێش نوێژی قوربانی سەر بڕێت، ئەوە بۆ خۆی سەربڕیوە، هەركەسێكیش دوای نوێژی جەژن قوربانی بكات ، خوا پەرستنەكەی تەواوەو، سوننەتی موسوڵمانانی پێكاوە.**

(المشكاة ١٤٣٧)

٤٨٧٦- من رأى منكم هلال ذي الحجة و أراد أن يضحي فلا يأخذن من شعره و لا من أظافره حتى يضحي

( صحيح ) ( ت ن هـ ك ) عن أم سلمة

**٤٨٧٦- هەر كەسێك لەئێوە مانگی ( ذي الحجة )ی بینی و، ویستی قوربانی بكات، با لە هیچ قژو نینۆكی نەقرتێنێ تاكو قوربانیكەی سەر دەبڕێت.**

(صحيح النسائي ٤٣٦١)

---

[1] ( الحاكم ) ئەم فەرموودەی بە( صحيح ) زانیوە، بەلام ( الذهبي ) ئەوەی ڕەتكردووەتەوەو بەلاوازی زانیوە چونكە ( ابن عياش ) هەیە لە سەنەدەكەیدا و كەسێكی لاوازە. بڕوانە ( فيض القدير ٦/١٢١ ) ( وەرگێر ).

٤٨٧٧-من صلى صلاتنا ونسك نسكنا فقد أصاب النسك ومن نسك قبل الصلاة فلا نسك له.

( صحيح ) ( ق د ) عن البراء.

**٤٨٧٧- هەركەسێك نوێژو خوا پەرستنی ئێمەی كرد ئەوە پێكایەتی، هەركێیش لە پێش نوێژدا قوربانی بكات دروست نییە.**

(صحيح ابي داود ٢٨٠٠)

٤٨٧٨- من ضحى قبل الصلاة فإنما ذبح لنفسه و من ذبح بعد الصلاة فقد تم نسكه و أصاب سنة المسلمين.

( صحيح ) ( ق ) عن البراء.

**٤٨٧٨- هەركەسێك پێش نوێژی جەژن قوربانی بكات ئەوە بۆ خۆی سەربڕیوە، هەركەسێكیش لە پاش نوێژی جەژن قوربانی بكات خوا پەرستنەكەی تەواوە، سوننەتی موسوڵمانانی پێكاوە.**

(الارواء ١١٤٠)

٤٨٧٩- من كان ذبح أضحيته قبل أن يصلي فليذبح مكانها أخرى و من لم يكن ذبح فليذبح باسم الله.

( صحيح ) ( حم ق ن هـ ) عن جندب.

**٤٨٧٩- هەركەسێك قوربانییەكەی لە پێش نوێژی جەژندا سەر ببڕێت، با قوربانییەكی تر لە جێگای سەر ببڕێت، هەر كەسێكیش سەری نەبڕیوە با بەناوی خواوە سەری ببڕێت.**

(الارواء ١١٤٠)

٤٨٨٠- من كان ذبح قبل الصلاة فليعد.

( صحيح ) ( حم ق ن هـ ) عن أنس.

**٤٨٨٠- هەركەسێك پێش نوێژی جەژن قوربانی سەر بڕیوەبا دوبارەی بكاتەوە.**

(الارواء ١١٣٩)

٤٨٨١- من كان له ذبح يذبحه فإذا أهل هلال ذي الحجة فلا يأخذن من شعره و لا من أظفاره شيئا حتى يضحي.

( صحيح ) ( م د ) عن أم سلمة.

**٤٨٨١- هەر كەسێك قوربانییەكی هەبوو، ویستی سەری ببڕێت و، مانگی (ذي الحجة) دەركەوت، با هیچ لەتووك و نینۆكی خۆی نەگرێت.تاكو قوربانییەكەی سەر دەبڕێت.**

(الارواء ١١٤٩)

٤٨٨٢- من كان له سعة و لم يضح فلا يقربن مصلانا.

( صحيح ) ( هـ ك ) عن أبي هريرة.

**٤٨٨٢- هەر كەسێك توانای هەبێت و قوربانی نەكات، با نزیكی سوژدەگای جەژنمان[1] نەكەوێتەوە.**

(مشكلة الفقر ١٠٢)

٤٨٨٣- نهيتكم عن ثلاث و أنا آمركم بهن نهيتكم عن زيارة القبور فزوروها فإن في زيارتها تذكرة و نهيتكم عن الأشربة أن لا تشربوا إلا في ظروف الأدم فاشربوا في كل وعاء غير أن لا تشربوا مسكرا و نهيتكم عن لحوم الأضاحي أن تأكلوها بعد ثلاث فكلوا و استمتعوا بها في أسفاركم.

( صحيح ) ( د ) عن بريدة.

**٤٨٨٣- سێ شتم لێ قەدەغە كردبوون، ئێستا خۆم فەرمانتان پێ دەكەم بیكەن. سەردانی گۆڕەكانم لێ قەدەغە كرد بوون، بەلآم سەردانی بكەن، چونكە دەبێتە مایەی یادخستنەوە، لێشم قەدەغە كرد بوون خواردنەوە بخۆنەوە لە پێستدا[2] نەبێت، بەلآم لەهەموو قاپێكدا خواردنەوە بخۆنەومو، دوورە پەرێز بن لە بێ هۆشكەر، لێشم قەدەغە كرد بوون گۆشتی قوربانی بخۆن لەدوای سێ ڕۆژ، بەلآم لێی بخۆن و لەگەڵ خۆتانی ببەن بۆ گەشتەكانتان.**

(الجنائز ١٧٨)

٤٨٨٤- لا يأكل أحدكم من لحم أضحيته فوق ثلاثة أيام.

( صحيح ) ( حم م ت ) عن ابن عمر.

**٤٨٨٤- كەس لەگۆشتی قوربانییەكەی نەخوات لە سێ ڕۆژ زیاتر[3].**

(الارواء ١١٤١)

---

[1] واتە: با نوێژی جەژنیشمان لەگەڵ نەكات ئەمەش بۆ هەڕەشەیە نەك بۆ نەكردن.

[2] واتە :تەنها لەو شتانە دانەبێت كە لە پێست دروستكراوی وەكو : چەوەند – ڕاویەو مەشكە.

[3] فەرموودەیەكی مەنسوخە.

٤٨٨٥- لا يذبحن أحدكم حتى يصلي.

( صحيح ) ( ت ) عن البراء.

**٤٨٨٥- با كەستان قوربانی سەر نەبڕێت تاكو نوێژی جەژن نەكات.**

(صحيح الترمذي ١٥٠٨)

**دەرگای گوێزەبانە**

٤٨٨٦- عن الغلام شاتان مكافأتان و عن الجارية شاة .

( صحيح )( حم د ن هـ حب ) عن أم كرز ( حم هـ ) عن عائشة ( طب ) عن أسماء بنت يزيد.

**٤٨٨٦- بۆ كوڕ دوو مەڕ و بۆ كچ يەك مەڕ.**

(الارواء ١١٥٢)

٤٨٨٧- عن الغلام شاتان و عن الجارية شاة لا يضركم أذكرانا كن أم إناثا

( صحيح ) ( حم د ت ن ك حب ) عن أم كرز ( ت ) عن سلمان بن عامر وعن عائشة

**٤٨٨٧- بۆ كوڕ دوو مەڕ بۆ كچ يەك مەڕ، زيانی نييە ئاژەڵەكە نێرينە بێت يان مێينە.**

(الارواء ١١٥٢)

٤٨٨٨- عن الغلام عقيقتان و عن الجارية عقيقة .

( صحيح ) ( طب ) عن ابن عباس.

**٤٨٨٨- بۆ كوڕ دوو گوێزەبانەو، بۆ كچ يەك گوێزەبانە.**

( **الصحيحه ٢٧٢٠** )

٤٨٨٩- العقيقة تذبح لسبع أو لأربع عشرة أو لإحدى و عشرين

( صحيح ) (طس الضياء) عن بريدة

**٤٨٨٩- گوێزەبانە سەر دەبڕێت لەڕۆژی حەوتەم يان چواردە يان بيست و يەك.**

(الارواء ١١٥٦)

٤٨٩٠- العقيقة حق عن الغلام شاتان متكافئتان و عن الجارية شاة.

( صحيح ) (حم) عن أسماء بنت يزيد.

**٤٨٩٠- گوێزەبانە ڕەوايە، لەجياتی كوڕ دوو مەڕو، لەجياتی كچ يەك مەڕ.**

(الارواء ١١٥٢)

٤٨٩١- الغلام مرتهن بعقيقته تذبح عنه يوم السابع و يسمى و يحلق رأسه.

( صحيح ) ( ت ك ) عن سمرة.

**٤٨٩١- كـوڕ بـارمتى بەگوێزەبانەكەيـەتى، ڕۆژى حەوتـەم بـۆى سـەر دەبڕدرێـت و، ناودەنرێت سەرى دەتاشرێت.**

(الارواء ١١٥١)

٤٨٩٢- الغلام مرتهن بعقيقته فأهريقوا عنه الدم و أميطوا عنه الأذى.

( صحيح ) ( هب ) عن سلمان بن عامر.

**٤٨٩٢- كوڕ بارمتى بەگوێزەبانەكەيەتى، بۆيە خوێنى بۆ بڕێژن[1] و قژى بتاشن.**

٤٨٩٣- في الإبل فرع و في الغنم فرع و يعق عن الغلام و لا يمس رأسه بدم.

( صحيح ) ( طب ) عن يزيد بن عبدالله المزني عن أبيه.

**٤٨٩٣- فەرەع[2] لە وشتردا دروستە ،لە مەڕيشدا دروستە، گوێزەبانـەش بـۆ كـوڕ دەكرێت و خوێنى حەوتمەكەى لەسەر هەڵناسورێت.**

**(الصحيحە ١٩٩٦)**

٤٨٩٤- في الغلام عقيقة فأهريقوا عنه دما و أميطوا عنه الأذى.

( صحيح ) ( ن ) عن سلمان بن عامر.

**٤٨٩٤- پێويستە گوێزەبانە بكرێت بۆ كوڕ بۆيە خوێنێكى بۆ بڕێژن[3] و قژى بتاشن.**

٤٨٩٥- كل غلام رهينة بعقيقته يذبح عنه يوم سابعه و يحلق رأسه و يسمى.

( صحيح ) ( حم د ن هـ ك ) عن سمرة.

**٤٨٩٥- هەموو كوڕێك بارمتەى گوێزەبانەكەيەتى، لەڕۆژى حەوتەم دا بۆى سـەر دەبڕێت و سەرى دەتاشرێت و ناو دەنرێت.**

(الارواء ١١٥١)

٤٨٩٦- مع الغلام عقيقة فأهريقوا عنه دما و أميطوا عنه الأذى.

( صحيح ) ( خ د هـ ) عن سلمان بن عامر.

**٤٨٩٦- لەگەڵ كوڕدا گوێزەبانە هەيە، بۆيە خوێنێكى بۆ بڕێژن و سەرى بتاشن.**

(الارواء ١١٥٧)

---

[1] واتە: دوو مەڕى بۆ سەربڕن.

[2] لەسەردەمى جاهيلى كاتێك يەكێك وشترەكانى دەبوونە سەد سەر بەچكە ووشترێكى سەردەبڕى ، مەڕيش بەهەمان شێوە.

[3] واتە: دوو مەڕى بۆ سەربڕن.

٤٨٩٧- لا يحب الله العقوق و من ولد له ولد فأحب أن ينسك عنه فلينسك عن الغلام شاتان مكافأتان و عن الجارية شاة.

( صحيح ) ( د ن ) عن ابن عمر.

**٤٨٩٧- خوای گەورە ڕقی لە ( عقوق )ە[1] ئازاردان ، هەركەسێك منداڵێكی بوو، حەزی كرد گوێزەبانەی بۆ بكات، با بۆ كوڕ دوومەڕ و، بۆ كچ مەڕێك سەرببڕێت.**

(الصحيحة ١٦٥٥)

٤٨٩٨- يعق عن الغلام و لا يمس رأسه بدم.

( صحيح ) ( هـ ) عن يزيد بن عبدالمزني.

**٤٨٩٨- گوێزەبانە بۆ كوڕ دەكرێت و خوێنی حەوتمەكەی لەسەر هەڵناسوڕێت.**

(الصحيحة ٢٤٥٢)

## بابەتی ڕاو كردن

٤٨٩٩- إذا أرسلت كلابك المعلمة و ذكرت اسم الله فكل مما أمسكن عليك و إن قتلن ، إلا أن يأكل الكلب فإني أخاف أن يكون إنما أمسكه على نفسه ، و إن خالطها كلاب من غيرها فلا تأكل فإنك لا تدري أيها قتل و إن رميت الصيد فوجدته بعد يوم أو يومين ليس به إلا أثر سهمك فكل و إن وقع في الماء فلا تأكل

( صحيح ) ( ق ٤ ) عن عدي بن حاتم .

**٤٨٩٩- ئەگەر سەگە فێركراوەكانت تێبەردا و ناوی خوات هێنا، ئەوەی بۆت دەگرن بیخۆن، بامرداریش بوبێتەوە، مەگەر سەگەكە لێی خوارد بێت، چونكە دەترسم بۆ خۆی گرتبێت، ئەگەر تێكەڵی سەگی تر بوو، لەڕاوكراوەكە مەخۆ، چونكە نازانی كامیان كوشتوویانە، ئەگەر نێچیرەكەت پێكاو دوای ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ دۆزیتەوە هیچی پێوەنەبوو جگە لە شوێنی نێرەكەت لێی بخۆ، ئەگەر كەوتبوە نێو ئاوەوە مەیخۆ.**

(الارواء ٢٦١٢)

---

[1] چونكە ئەو وشە لە( عق )ەوە وەرگیراوە، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) حەزی لەناوی ( النسيكة ) دەكرد وناوی ناخۆشی دەگۆڕی بۆ ناوی خۆش.

٤٩٠٠- إذا أرسلت كلبك المعلم فقتل فكل و إذا أكل فلا تأكل فإنما أمسك على نفسه و إن وجدت معه كلبا آخر فلا تأكل فإنما سميت على كلبك و لم تسم على كلب آخر.

( صحيح ) ( ق ) عن عدي بن حاتم .

**٤٩٠٠- ئەگەر سەگە فێرکراوەکەت تێبەرداو و نێچیری کوشت لێی بخۆ، بەڵام ئەگەر خۆی لێی خوارد تۆ لێی مەخۆ، چونکە بۆ خۆی ڕاوی کردووە، ئەگەر سەگێکی ترت لەگەڵدا بینی لە نێژیرەکە مەخۆ، چونکە تۆ ناوی خوات لەسەر سەگەکەی خۆت هێناوە نەك لەسەر سەگێکی تر.**

(الارواء ٢٦١٣)

٤٩٠١- إذا أرسلت كلبك المكلب و ذكرت و سميت فكل ما أمسك عليك كلبك المكلب و إن قتل و إن أرسلت كلبك الذي ليس بمكلب و أدركت ذكاته فكل و كل ما رد عليك سهمك و إن قتل و سم الله.

( صحيح ) ( حم ق ٣ ) عن أبي ثعلبة .

**٤٩٠١- ئەگەر سەگی ڕاوچیەکەت تێبەرداو ناوی خوات هێنا لەو نێچیرە بخۆ کە ڕاوی دەکابا نێچیرەکە مرداریش بوو بێتەوە، بەڵام ئەگەر سەگە ڕاوچیەکەت تێبەردا و فریای نێچیرەکە کەوتی سەرییببڕیت لێی بخۆ، هەرچیش تیرەکەت بۆت گلدەداتەوە با کوشتبێتیشی و ناوی خوای لێ بێنە و بیخۆ.**

(صحيح الترمذي ١٧٩٧)

٤٩٠٢- إذا أرسلت كلبك فاذكر اسم الله فإن أمسك عليك فأدركته حيا فاذبحه فإن أدركته قد قتله و لم يأكل منه فكله و إن وجدت مع كلبك كلبا غيره قد قتل فلا تأكل فإنك لا تدري أيها قتله و إن رميت بسهمك فاذكر اسم الله فإن غاب عنك يوما فلم تجد فيه إلا أثر سهمك فكل إن شئت و إن وجدته غريقا في الماء فلا تأكل فإنك لا تدري الماء قتله أو سهمك ؟.

( صحيح ) ( م ن ) عن عدي بن حاتم .

**٤٩٠٢- ئەگەر سەگەکەت تێبەردا ناوی خوای لێ بێنە، ئەگەر بۆی گرتیت و بە زیندویی فریای کەوتی سەری ببڕە، ئەگەر هەتا فریای کەوتی کوشتبووی بەڵام لێی نەخوارد بوو هەر لێی بخۆ، ئەگەر لەگەڵ سەگەکەی خۆت سەگێکی ترت بینی نێچیرەکەش کوژرابوو لێی مەخۆ، چونکە نازانیت کامیان کوشتوویانە، ئەگەر تیرەکەتیش هاویشت ناوی خوای**

**٥٢٦٧-ئەوە بزانە ئەى با مەسعود ، بەڕاستى خواى گەورە بەسەر تۆدا بەتواناترە لە تواناى تۆ بەسەر ئەولاوەدا[1] .**

(الترغيب ٢٢٧٧ )

٥٢٦٨- أما بعد فما بال أقوام يشترطون شروطا ليست في كتاب الله ما كان من شرط ليس في كتاب الله فهو باطل و إن كان مائة شرط قضاء الله أحق و شرط الله أوثق و إنما الولاء لمن أعتق.

(صحيح) ( ق ٤ ) عن عائشة .

**٥٢٦٨-لەدواى سوپاسى خواى گەورە : ئەوە چى يە كەسانێك هەندێ مەرج دادەنێن لە قورئاندا نييە ، هەرچى مەرجێك لە قورئاندا نەبێت بەتاڵە ، ئەگەر سەد مەرجيش بێت ، فەرمانى خواى گەورە شايستە ترو پتەو ترە ، سەرپەرشتيارێتى و ميراتى كۆيلە بۆ گەورەكەيەتى .**

( الأرواء ١٣٠٨ )

٥٢٦٩- إن العبد إذا نصح لسيده و أحسن عبادة ربه كان له أجره مرتين

(صحيح) ( مالك حم ق د ) عن ابن عمر .

**٥٢٦٩-كۆيلە ئەگەر دڵسۆزى[2] گەورەكەى بێت و ، بەچاكى خوا پەرستى خواى خۆى بكات دوو پاداشتى هەيە .**

(الصحيحة ١٦١٦ )

٥٢٧٠- إنما الولاء لمن أعتق

(صحيح) ( خ ) عن ابن عمر .

**٥٢٧٠- ميراتگرى كۆيلە بۆ گەورەكەيەتى[3] .**

(الروض النضير ٢/٢١١ )

---

[1] واتە : تواناى خواى گەورە لە سزادانى تۆ زياترە لە تواناى تۆ لە لێدانى ئەو لاوە ، بەلام خواى گەورە ئارام دەگرێت كە تورە دەبێت و ، تۆ ئارام ناگريت .

[2] (( نَصَحَ )) يان (( النصيحة )) بەواتاى ئامۆژگارى – پاراستن و دڵسۆزى دێت.

[3] مەناوى دەڵێت : نەك بۆ كەسى تر ، ئەم فەرموودەيەش لە چوار سوود زياترى لێ وەردەگيردرێت . ئەوەوى دەڵێت : ( ابن جرير ) و ( ابن خزيمة ) دوو كتێبيان لەسەر نووسيوە ...

٥٢٧١- أيما امرئ مسلم أعتق امرءا مسلما فهو فكاكه من النار يجزي بكل عظم منه عظما منه و أيما امرأة مسلمة أعتقت امرأة مسلمة فهي فكاكها من النار يجزي بكل عظم منها عظما منها و أيما امرئ مسلم أعتق امرأتين مسلمتين فهما فكاكه من النار يجزي بكل عظمين منهما عظما منه.

(صحيح) ( طب ) عن عبدالرحمن بن عوف ( د ه طب ) عن مرة بن كعب ( ت ) عن أبي أمامة .

**٥٢٧١-هەر موسڵمانێك موسڵمانێك ئازاد بكات ئەوە دەربازبوونێتی لە دۆزەخ ، بە هەموو ئێسقانێكی ئەوئێسقانێكی لەدۆزەخ ڕزگاردەبێت،هەر ئافرەتێكی موسڵمانیش ئافرەتێكی موسڵمان ئازادبكات ئەوە ڕزگار بونێتی لە دۆزەخ،بە هەموو ئێسقانێكی ئەو ئێسقانێكی لە دۆزەخ ڕزگاردەبێت ، هەر كەسێكیش موسڵمان بێت و دوو ئافرەتی موسڵمان ئازاد بكات ئەوە ڕزگار بوونێتی لە دۆزەخ، بە هەموو دوو ئێسقانی ئێسقانێكی لە ئاگر ڕزگار دەكات.**

(الترغيب ١٨٩١ )

٥٢٧٢- أيما رجل مسلم أعتق رجلا مسلما فإن الله تعالى جاعل وقاء كل عظم من عظامه عظما من عظام محرره من النار و أيما امرأة أعتقت امرأة مسلمة فإن الله تعالى جاعل وقاء كل عظم من عظامها عظما من عظام محررتها من النار يوم القيامة

(صحيح) ( د حب ) عن أبي نجيح السلمي .

**٥٢٧٢-هەر موسڵمانێك پیاوێكی موسڵمان ڕزگاربكات ،خوای گەورە هەموو ئێسكێكی ئەو كەسە دەكاتە پارێزگاری بۆ ئێسكی ئەو موسڵمانە،هەر ئافرەتێكیش ئافرەتێكی موسڵمان ڕزگار بكات خوا بە هەموو ئێسكێكی ئەو ڕزگار كراوە ، پارێزگاری ئێسكێكی ئەو ئافرەتە موسڵمانە دەكات لە دۆزەخ ، لە ڕۆژی قیامەتدا .**

(الصحيحة ١٧٥٦ )

٥٢٧٣- أيما عبد أبق من مواليه فقد كفر حتى يرجع إليهم.

(صحيح) ( م ) عن جرير .

**٥٢٧٣-هەر كۆیلەیەك لە دەست خاوەنەكەی هەڵهات ، ئەوە بێ باوەڕ بووە تاكو دەگەڕێتەوە لایان .**

(الروض النضير ٢٦٩ )

٥٢٧٤- أيما عبد كاتب على مائة أوقية فأداها إلا عشرة أواق فهو عبد و أيما عبد كاتب على مائة دينار فأداها إلا عشرة دنانير فهو عبد.

(حسن) ( حم د ه ك ) عن ابن عمرو .

**٥٢٧٤-هەر كۆيلەيەك نووسراوى ئازادبوونى خۆى نووسى لەسەر سەد ( اوقية )[1] و ، هەمووى جێبەجێ كرد جگە لە دە ئۆقيەى ، ئەو هەر كۆيلەيە ، هەر كۆيلەيەكيش نووسراوى ئازادبوونى خۆى نووسى لەسەر سەد دينار و ، هەمووى جێبەجێكرد دە دينارى نەبێت ، ئەوە هەر كۆيلەيە .**

( الأرواء ١٦٧٢ )

٥٢٧٥- أيما عبد مات في إباقه دخل النار و إن كان قتل في سبيل الله تعالى.

(حسن) ( طس هب ) عن جابر .

**٥٢٧٥-هەر كۆيلەيەك لە كاتى هەڵهاتنيدا بمرێت دەچێتە دۆزەخەوە ، ئەگەر لە جيهاديشدا بكوژرێت .**

٥٢٧٦- ثلاثة يؤتون أجرهم مرتين: رجل من أهل الكتاب آمن بنبيه و أدرك النبي صلى الله عليه وسلم فآمن به و اتبعه و صدقه فله أجران و عبد مملوك أدى حق الله و حق سيده فله أجران و رجل كانت له أمة فغذاها فأحسن غذاءها ثم أدبها فأحسن تأديبها و علمها فأحسن تعليمها ثم أعتقها و تزوجها فله أجران.

(صحيح) ( حم ق ت ن ه ) عن أبي موسى .

**٥٢٧٦-سێ كەس هەن دوو جار پاداشت وەردەگرن ، پياوێك لەئەهلى كيتاب ئيمان بە پێغەمبەرەكەى بهێنێ و بگاتە پێغەمبەر (ﷺ) و بڕوا بە ئەويش بهێنێ و شوێنى بكەوێت و باوەڕى پێ بهێنێ دوو جار پاداشت دەدرێتەوە ، بەندەيەكى كۆيلەيش ، مافى سەر گەورەكەى بدات دوو جار پاداشت دەدرێتەوە ، پياوێكيش ئافرەتێكى كۆيلەى لابێت خۆراكى باشى پێبدات و پەروەردەى بكات و فێرى بكات بە باشى و ئينجا ئازادى بكات و مارەى بكات دوو جار پاداشتى لەسەر وەردەگرێت .**

(الصحيحة ١١٥٣ ) .

---

[1] شەش يەكى نيوەى ( رطل ) و ، شەش يەكى ( أقة ) يە .

٥٢٧٧- عتق النسمة أن تنفرد بعتقها و فك الرقبة أن تعين في عتقها .

(صحيح) ( الطيالسي ) عن البراء.

**٥٢٧٧-ئازاد كردنى كۆيلە ئەوەيە تەنها خۆت ئازادى بكەيت ، بەلاَم يارمەتيدان لە ئازاد كردنيدا ، لەوە جياوازە.**

(الصحيحة ١٢٢٤ )

٥٢٧٨- العبد الآبق لا تقبل له صلاة حتى يرجع إلى مواليه .

(صحيح) ( طب ) عن جرير.

**٥٢٧٨-كۆيلەى هەلْهاتوو نويْژى لىْ وەرناگيردريْت تاكو نەگەريْتەوە لاى خاوەنەكانى .**

( المشكاة ٣٥٤٩ )

٥٢٧٩- كان آخر كلام النبي صلى الله عليه وسلم:الصلاة الصلاة اتقوا الله فيما ملكت أيمانكم.

(صحيح) ( د ه ) عن علي.

**٥٢٧٩-كۆتاى گوفتارى پيْغەمبەر (ﷺ) ئەوەبوو فەرمووى : نويْژەكانتان نويْژەكانتان ، لە خوا بترسن دەربارەى كۆيلەكانتان .**

( الأرواء ٢٢٣٩ )

٥٢٨٠- لله أقدر عليك منك عليه.

(صحيح) ( حم ت ) عن أبي مسعود.

**٥٢٨٠-خواى گەورە بەسەر تۆدا بەتواناترە لە تواناى تۆ بەسەر ئەو لاوەدا[1] .**

**( الترغيب ٢٢٧٧ )**

٥٢٨١- للعبد المملوك الصالح أجران.

(صحيح) ( حم ت ) عن أبي هريرة.

**٥٢٨١-كۆيلەى ژيْر دەستەى چاكەكار دوو پاداشتى هەيە .**

(الصحيحة ٨٨٥ )

٥٢٨٢- للمملوك طعامه و كسوته بالمعروف و لا يكلف من العمل إلا ما يطيق.

(صحيح) ( حم م هق ) عن أبي هريرة.

---

[1] **بە ئەبو مەسعودى فەرموو كاتيْك بينى لە كۆيلەكەى دەدا .**

**٥٢٨٢- كۆيلەى مافى خواردن و پۆشاكى هەيە بەسەر خاوەنەكەيەوە بە چاكى ، نابێ داواى هيچ كارێكيشى لێ بكرێت كەلە تواناىدا نەبێت .**

**( الأرواء ٢١٧٢ )**

٥٢٨٣- للمملوك طعامـه و كـسوته و لا يكلـف إلا مـا يطيـق فـإن كلفتمـوهم فـأعينوهم و لا تعذبوا عباد الله خلقا أمثالكم.

**(حسن) ( حب ) عن أبي هريرة.**

**٥٢٨٣-كۆيلە مافى خواردن و پۆشاكى هەيە كە بۆى دابين بكرێت ، كارێكيشى پێ نەسپێردرێت لە تواناىدا نەبێت ، ئەگەر داواى كارى قورستان لێكردن يارمەتيان بدەن ، ئەشكە نجەشيان مەدەن ئەوانيش وەكو ئێوە مرۆڤن .**

**( الأرواء ٢١٧٢ )**

٥٢٨٤- من أسلم على يدي رجل فله ولاؤه.

**(حسن) ( طب عد قط هق ) عن أبي أمامة.**

**٥٢٨٤-هەريەكێ لەسەر دەستى كەسێك موسڵمان بوو ، ميراتيەكەشى بۆ ئەو دەبێت .**

**(الصحيحة ٢٣١٦ )**

٥٢٨٥- من أعتق رقبة مؤمنة كانت فداءه من النار.

**(صحيح) ( حم د ن ) عن عمرو بن عبسة.**

**٥٢٨٥-هەركەسێك گەردنێكى(( كۆيلەيەكى )) ئيماندار ئازادبكات ئەوە ڕزگاركەريەتى لە دۆزەخ .**

**( صحيح ابي داود ٣٩٦٦ )**

٥٢٨٦- من أعتق رقبة مسلمة أعتق الله له بكل عضو منها عضوا منه من النار حتى فرجه بفرجه.

(صحيح) ( ق ت ) عن أبي هريرة.

**٥٢٨٦-هەركەسێك گەردنى موسڵمانێك(( كۆيلەيەكى موسڵمان )) ئازاد بكات ، بە هەموو ئەندامێكى ئەو لە ئەندامێكى ئەويش ڕزگار دەبێت لە ئاگر ، تەنانەت ئەندامەكانى شەرميشى .**

**( الروض ٣٥٣ )**

٥٢٨٧- من أعتق شركا له في عبد فكان له مال يبلغ ثمـن العبـد قـوم العبـد عليـه قيمـة عـدل فأعطى شركاءه حصصهم و عتق عليه العبد و إلا فقد عتـق منـه مـا عتق.

**(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن ابن عمر.**

**٥٢٨٧-هەریەكێ بەشێكی هەبوو لە كۆیلەیەكدا و بەشەكەی خۆی ئازاد كرد ، ئەوەندەش پارەی بوو نرخی ئەو كۆیلە دەربهێنێ ، دەبێت كۆیلەكە بخەملێنێ و پشكی هاوبەشەكانی بداتەوە و خۆی كۆیلەكە ئازاد بكات، ئەگەرنا ئەوەندەی ئازادبووە كە بەشی خۆیەتی ئازادی كردووە .**

( الأرواء ١٢٢٠ )

٥٢٨٨- من أعتق شقصا من مملوك فعليه خلاصه في ماله فإن لم يكن له مال قوم المملوك قيمة عدل ثم استسعى غير مشقوق عليه.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن أبي هريرة.

**٥٢٨٨-هەریەكێ پشكی خۆی لە كۆیلەیەكدا ئازاد كرد، پێویستە لەسەری لە پارەی خۆی بەتەواوی رزگاری بكات، ئەگەر تواناى ئەوەشی نەبوو، نرخی كۆیلەكە دەخەملێنێ وەكو هاو شێوە ی خۆی و هەوڵی بۆ دەدا ئەگەر لەسەری گران نەبێت .**

( الأرواء ١٢٢٠ )

٥٢٨٩- من أعتق عبدا و له مال فمال العبد له إلا أن يشترط السيد ماله فيكون له.

(صحيح) ( د ه ) عن ابن عمر.

**٥٢٨٩-هەركەسێك كۆیلەیەك ئازادبكات و كۆیلەكەش ماڵی هەبێت ماڵەكەی بۆ خۆیەتی ، مەگەر گەورەكەی مەرجی كردبێت كە ماڵەكەی بداتێ ئینجا ئازاد بێت .**

( الأرواء ١٧٧٦ )

٥٢٩٠- من انتسب إلى غير أبيه أو تولى غير مواليه فعليه لعنة الله و الملائكة و الناس أجمعين

(صحيح) ( ه ) عن ابن عباس

**٥٢٩٠-هەریەكەسێك خۆی بكاتە كوڕی یەكێكی تر جگە لە باوكی ، یان كۆیلەیەك خۆی بداتە پاڵ كەسانێك جگە لە خاوەنەكانی ، نەفرینی خوا و ، فریشتەكان و سەرجەم خەڵكی لێ بێت .**

( صحيح ابن ماجه ٢٦٠٩ )

٥٢٩١- من تولى غير مواليه فقد خلع ربقة الإسلام من عنقه

(صحيح) ( حم الضياء ) عن جابر

**٥٢٩١-هەر کۆیلەیەك خۆی بداتە پاڵ کەسانێك جگە لە خاوەنەکانی ، بازنەی ئیسلام لەگەردنی داماڵاوە .**

(الصحيحة ٢٣٢٩ )

٥٢٩٢- من تولى قوما بغير إذن مواليه فعليه لعنة الله و الملائكة و الناس أجمعين لا يقبل الله منه يوم القيامة صرفا و لا عدلا.

(صحيح) ( م د ) عن أبي هريرة.

**٥٢٩٢-هەر کۆیلەیەك خۆی بکاتە موڵکی کەسانێك بەبێ مۆڵەتی گەورەکانی ، نەفرینی خوا و ، فریشتەکان و ، خەڵکی لەسەر بێت بەگشتی ، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا نە فەرز و نە سوننەتی لێ وەرناگرێت .**

( صحيح ابن داود ٥١١٤ )

٥٢٩٣- من ضرب غلاما له حدا لم يأته أو لطمه فإن كفارته أن يعتقه

(صحيح) ( م ) عن ابن عمر

**٥٢٩٣-هەریەکێ داری (( حەد )) سزای شەرعی لە غولامێکی بدات بێ ئەوەی تاوانێکی کردبێت ، یان زللەیەکی لێ بدات ، قەرەبووەکەی ئازادکردنێتی .**

( المشكاة ٣٣٥٢ )

٥٢٩٤- من ضرب مملوكه ظالما أقيد منه يوم القيامة

(صحيح) ( طب ) عن عمار

**٥٢٩٤-هەریەکێ لە کۆیلەکەی بدات بەناهەق ، تۆڵەی لێ دەکرێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا.**

(الصحيحة ٢٣٥٢ )

٥٢٩٥- من كاتب مملوكه على مائة أوقية فأداها إلا عشر أواق ثم عجز فهو رقيق

(حسن) ( ت ) عن ابن عمرو

**٥٢٩٥-هەریەکێ ڕێکەوت لەگەڵ کۆیلەکەی ئازادی بکات بەرانبەر سەد ( اوقية ) ((کێشانەیەکی تایبەتیە )) و ، هەمووی جێبەجێ کرد ، تەنها دە ( اوقية ) نەبێت و ئینجا توانای نەما ، ئەو کەسە ، هێشتا هەر کۆیلەیە .**

( الأرواء ١٦٧٢ )

٥٢٩٦- من لطم مملوكه أو ضربه فكفارته أن يعتقه.

(صحيح) ( حم م د ) عن ابن عمر.

**٥٢٩٦-هەریەكەسێك لە كۆیلەكەی بدات ، یان زللەیەكی لێبدات ، قەرەبوەكەی ئازاد كردنێتی .**

( الأرواء ١٢٣٥ )

٥٢٩٧- من لعب بطلاق أو ضربه فكفارته أن يعتقه.

(حسن) ( طب ) عن أبي الدرداء.

**٥٢٩٧-هەركەسێك یاری بكات بە تەلاق یان بە ئازاد كردنی كۆیلە ، ئەوە هەر بەو شێوەیە كە وتوویەتی[1] .**

( الأرواء ٨٨٣ )

٥٢٩٨- من لايمكم من خدمكم فأطعموهم مما تأكلون و ألبسوهم مما تلبسون و من لا يلايمكم منهم فبيعوه و لا تعذبوا خلق الله.

(صحيح) ( حم د ) عن أبي ذر.

**٥٢٩٨-هەریەكەسێك لە خزمەتكارەكانتان گونجا لە گەڵتان لەو خواردنەی خۆتان دەیخۆن بەشیان بدەن و ، لە پۆشاكی خۆشتان پۆشاكیان بۆ بكەن هەر یەكێكیشیان لەگەڵتان نەگونجا بیانفرۆشن و ، بەندەكانی خوا ئەشكە نجە مەدەن .**

(الصحيحة ٧٣٩ )

٥٢٩٩- موالينا منا.

(صحيح) ( طس ) عن ابن عمر.

**٥٢٩٩-كۆیلەكانمان لە خۆمانن[2] .**

(الصحيحة ١٦١٢ )

٥٣٠٠- مولى القوم من أنفسهم.

(صحيح) ( خ ) عن أنس.

**٥٣٠٠- كۆیلەو خزمەتكاری كەسانێك لە خۆیانن[3] .**

(الصحيحة ١٢١٦ )

---

[1] واتە : تەلاقەكە دەكەوێت و ، بەندەكە ئازاد دەبێت .

[2] مەبەست لە ( آل البيت ) ە .

[3] واتە : رەچەڵەكی ئەوان هەڵدەگرێت و ئەوان میراتی دەگرن ئەگەر ئازاد كراوبێت ، ئەگەر نا مەبەست لە رێزگرتنێتی .

٥٣٠١- المكاتب عبد ما بقي عليه من كتابته درهم.

(حسن) ( د هق ) عن ابن عمرو.

**٥٣٠١-ئەو کۆیلەیەی گەورەکەی بەڵێننامەی ئازادبوونی بۆ نووسیوە هەر کۆیلەیە تاکو درهەمێکی لەسەر مابێت .**

( الأرواء ١٦٧٢ )

٥٣٠٢- المكاتب يعتق بقدر ما أدى و يقام عليه الحد بقدر ما عتق منه و يرث بقدر ما عتق منه.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عباس.

**٥٣٠٢- ئەو کۆیلەیەی نوسراوی ئازادبوونی بۆ نوسراوە لەلایەن سەر گەورەکەیەوە ، ئازاد دەبێت بەئەندازەی ئەوەی جێبەجێی دەکات داری حەدی لێ دەدرێت و میراتی دەگرێت بە گوێرەی ئەوەندەی ئازاد بووە .**

٥٣٠٣- نعما لمملوك أن يتوفى يحسن عبادة ربه و ينصح لسيده نعما له.

(صحيح) ( ق ت ) عن أبي هريرة.

**٥٣٠٣-خۆشبەختی بۆ کۆیلەیەك بمرێت و ، بەچاکی پەروەردگار خۆی پەرستبێت و ، ئامۆژگاری کردبێت بۆ بەرژەوەندی سەرگەورەکەی ، وەك بەهرەمەند بێت.**

(الصحيحة ٧٢٨ )

٥٣٠٤- هو حر كله ليس لله شريك.

(صحيح) ( حم د ن ) عن والد أبي المليح.

**٥٣٠٤-ئەو هەمووی ئازادە خوای گەورە هاوەڵی نییە[1] .**

( المشكاة ٣٣٩٧ )

٥٣٠٥- الولاء لحمة كلحمة النسب لا يباع و لا يوهب

(صحيح) ( طب ) عن عبدالله ابن أبي أوفى ( ك هق ) عن ابن عمر

**٥٣٠٥-کۆیلایەتی خزمایەتیو دانوپۆیە وەکو خزمایەتی و دان و پۆی نەژاد[2] نا فرۆشرێت و نابەخشرێت.[1]**

---

[1] **پێویستە هەموو کۆیلەکە ئازاد بکات و خۆی نەکاتە هاوبەشی خوای گەورە ، واتە نەڵێ نیوەی کۆیلەم لەبەرخوا ئازاد بێت و نیوەی هەر کۆیلەی خۆم بێ .**

[2] **( الحاكم ) ئەم فەرموودەیەی بە ( صحيح ) زانیوە ، بەڵام ( الذهبی ) بەتوندی ڕەتیکردووەتەوە و چونکە ( عبيد بن القاسم ) لەسەنەدی ئەم فەرموودەدایە و ، ئەو کەسێکی درۆزنە وەکو ( الهيثمی ) دەڵێت . بڕوانە : ( فيض القدير ٤٨٩/٦ ) ( وەرگێڕ ) .**

٥٣٠٦- الولاء لمن أعتق.

(صحيح) ( حم طب ) عن ابن عباس.

**٥٣٠٦-سەرپەرشتیاری و (( میرات )) كۆیلەی ئازاد كراو بۆ ئەو كەسەیە كە ئازادی كردووە ئەگەر میرات گری نەبوو.**

٥٣٠٧- الولاء لمن أعطى الورق و ولي النعمة.

(صحيح) ( ق ٣ ) عن عائشة.

**٥٣٠٧-سەرپەرشتیاری كۆیلە بۆ ئەو كەسەیە نرخەكەی دابێت و سەرپەرشتیاری ژیانیشی هەر بۆ ئەوە.**

٥٣٠٨- لا يحل أن يتولى مولى رجل مسلم بغير إذنه

(صحيح) ( حم م ) عن جابر

**٥٣٠٨-ڕەوانییە بۆ كەس سەرپەرشتیاری كۆیلەیەك بگرێتە دەست بەبێ مۆڵەتی ئەو (( گەورەكەی )).**

٥٣٠٩- يا أبا ذر ! إنك امرؤ فيك جاهلية إنهم إخوانكم فضلكم الله عليهم فمن لم يلائمكم فبيعوه و لا تعذبوا خلق الله

(صحيح) ( د ) عن أبي ذر

**٥٣٠٩-ئەی ئەبا ( ذر ) تۆ هێشتا نەفامیت تیا ماوە ، ئەوانە برای ئێوەن ،خوا چاكەی ئێوەی داوە بەسەریاندا ، هەركە لەگەڵتان نەگونجان بیفرۆشن و ، دروستكراوەكانی خوا ئەشكە نجە مەدەن .**

( الترغيب ١٢٨٢ )

٥٣١٠- من فرق بين والدة و ولدها فرق الله بينه و بين أحبته يوم القيامة

(صحيح) ( حم ت ك ) عن أبي أيوب

**٥٣١٠-هەریەكێ جیاوازی بخاتە نێو دایكێك و منداڵێك لێك بكات ، خوای گەورە ئەو كەسەو خۆشەویستانی لێك دەكات لە ڕۆژی قیامەتدا[2] .**

( المشكاة ٣٣٦١ )

---

[1] اللحمە : كوتە گۆشت – خزمایەتی – نەژاد – دانوپۆ واتە : ئەو هەودایانەی سەریەك دەخرێن و تێكەڵكێش دەكرێن لە چینێكدا، قاموسی ڕستە، ب٤ ، ل٢٣٥٧ .

[2] مەبەست لە كۆیلەیە ، ڕەوانییە منداڵ و دایك لەیەكتر جیا بكرێتەوە بە فرۆشتنی یان بەخشینی .

٥٣١١- من ملك ذا رحم محرم فهو حر.

(صحيح) ( حم د ت ه ك ) عن سمرة .

**٥٣١١-هەريەكێ بوو بە خاوەن كۆيلەيەك لە كەس و كارى نزيكى خۆى ، ئەو كۆيلەيە ئازادە .**

( الأرواء ١٧٤٣ )

٥٣١٢- يا عباس ! ألا تعجب من حب مغيث بريرة و من بغض بريرة مغيثا ؟.

(صحيح) ( خ د ن ه ) عن ابن عباس.

**٥٣١٢-ئەى عەبباس : ئايا سەرسام نابيت لە خۆشەويستى ( مغيث ) بۆ ( بريرە ) و ، لە رق لێبوونەوەى ( بريرە ) لە ( مغيثت )[1] .**

**[1] دوو كۆيلە بوون ، ( بريرة ) ئازاد كراو ، سەرپشك كرا سەبارەت بەمانەوەى لەگەڵ ( مغيث ) ى مێردى و ، جيابوونەوەيان ئەويش جيابوونەوەى هەڵبژارد ، جا ( مغيث ) بەرێگەكانى مەدينەدا بەدوايدا دەرۆشت و دەگريا و بۆ ئەوەى سۆزى بۆى بجوڵێت ، ئەويش رازى نەدەبوو بگەرێتەوەلاى ، جا كە پێغەمبەر( ﷺ ) ئەو ديمەنەى بينى ئە فەرموودەى فەرموو .**




٥٣١٣- اتق الله و لا تحقرن من المعروف شيئا و لو أن تفرغ من دلوك في إناء المستسقي و أن تلقى أخاك و وجهك إليه منبسط و إياك و إسبال الإزار فإن إسبال الإزار من المخيلة و لا يحبها الله و إن امرؤ شتمك و عيرك بأمر ليس هو فيك فلا تعيره بأمر هو فيه و دعه يكون وباله عليه و أجره لك و لا تسبن أحدا.

(صحيح) ( الطيالسي حب ) عن جابر بن سليم الهجيمي .

**٥٣١٣-لە خوا بترسەو هیچ چاکەیەك بەکەم مەزانە ، ئەگەر هەر ئەوەندەش بووە لە ئاوی سەتڵەکەی خۆت بکەیتەسەتڵی کەسێکە کە بۆ ئاو دەگەڕێت ، یان بە ڕوویەکی خۆشەوە ، براکەت پێشوازی بکەیت ، نەکەیت پۆشاکیشت درێژ بکەیت ، چونکە ئەوە لە خێرکردنە و ، خوا پێی خۆش نییە ، ئەگەر کەسێکیش جنێوی پێ دایت و پلاری تێگرتی بە شتێك کە تیایدا نییە ، تۆ پلاری تێ مەگرە بەشتێك کە تیایدایە ، وازی لێ بهێنە گوناهەکەی بۆ ئەو بێت و پاداشتەکەی بۆ تۆ بێت و ، هەرگیز جنێو بەکەس نەدەیت[1] .**

(الصحيحة ٧٧٠ )

٥٣١٤- إذا لبستم و إذا توضأتم فابدءوا بميامنكم.

(صحيح) ( د حب ) عن أبي هريرة .

**٥٣١٤-ئەگەر جلتان لەبەرکرد، یان دەستنوێژتان گرت لەلای ڕاستانەوە دەست پێ بکەن.**

( المشكاة ٤٠١ )

---

[1] ئەم فەرموودەیە هەندێ پێشەوای گەورەی دیکە ڕیوایەتیان کردووە ، پێشەوا ( السیوط ) باسی نەکردوون ، وەکو : ئەحمەد و ئەبو داود و نەسائی و بەغەوی و باوەردی و ئیبنو صیببان واتە بەرانی و ئەبو نوعەیم و بەیهەقی و کەسانی تر ، لەگەڵ هەندێك جیاوازی لە ووشەکان. بڕوانە( فیض القدیر ١/١٦٠ )( وەرگێڕ ).

٥٣١٥- ارفع إزارك و اتق الله.

(صحيح) ( طب ) عن الشريد بن سويد .

**٥٣١٥- پۆشاكەكەت (( شێروالەكەت )) بەرزبكەرەوە و ، لە خوا بترسە .**

(الصحيحة ١٤٤١ )

٥٣١٦- إزرة المؤمن إلى أنصاف ساقيه.

(صحيح) ( ن ) عن أبي هريرة وأبي سعيد وابن عمر ( الضياء ) عن أنس .

**٥٣١٦-جلى (( شروالى )) بڕوادار تاكو نيوەى لاقێتى**[1] .

( المشكاة ٤٣٣١ )

٥٣١٧- إزرة المؤمن إلى عضلة ساقيه ثم إلى الكعبين فما كان أسفل من ذلك ففي النار

(صحيح) ( حم ) عن أبي هريرة .

**٥٣١٧-جلى ئيماندار تاكو ماسولكەى هەر دوو قاچێتى ، ئينجا تاكو هەردوو قولە پێى، ئەوەشى لەوە بێتە خوارە وە لە دۆزەخدايە .**

( المشكاة ٤٣٣١ )

٥٣١٨- إزرة المؤمن إلى نصف الساق و لا جناح عليه فيما بينه و بين الكعبين ما كان أسفل من الكعبين فهو في النار من جر إزاره بطرا لم ينظر الله إليه.

(صحيح) ( مالك حم د ه حب هق ) عن أبي سعيد .

**٥٣١٨-پۆشاكى باوەڕدار تاكو نيوەى قاچێتى و ، هيچى لەسەر نيە لە نێوان ئەوێ و قولە پێيدا ، هەرچى لەوە خوارتربێت لە ئاگردايە ، هەريەكێ پۆشاكەكەى بەدوايدا بخشێت خۆبەگەورە زانينەوە بوونەوە ، خواى گەورە تەماشاى ناكات .**

( المشكاة ٤٣٣١ )

٥٣١٩- البسوا الثياب البيض فإنها أطهر و أطيب و كفنوا فيها موتاكم.

(صحيح) ( حم ت ن ه ك ) عن سمرة .

**٥٣١٩-جل و بەرگى سپى لەبەر بكەن ، چونكە پاكترو چاكترە و، مردووەكانيشتانى پێ كفن بكەن.**

( الجنائز ٦٣)

---

[1] ( الفاكهى ) دەڵێت : بەرپەرچدانەوەى تيايە بۆ زانايانى سەردەم كە مێزەرەى گەورە دەبەستن و پۆشاكى پان و قۆڵ بلاو درێژ لەبەر دەكەن و ، ئەم فەرموودەيان لەبير كردووە ...

٥٤٢٠- إن كنت عبدا لله فارفع إزارك.

(صحيح) ( طب هب ) عن ابن عمر .

**٥٣٢٠-ئەگەر تۆ بەندەی خوای جل و بەرگەكەت ((شرواڵەكەت)) هەڵكێشە .**

(الصحيحة ١٥٦٨ )

٥٣٢١- إن الذي يجر ثيابه من الخيلاء لا ينظر الله إليه يوم القيامة.

(صحيح) ( م ن ه ) عن ابن عمر .

**٥٣٢١-ئەو كەسەی پۆشاكەكەی لەڕووی خۆ بەگەورە زانینەوە ڕادەكێشێت ، خوای گەورە تەماشای ناكات لە ڕۆژی قیامەتدا .**

(الصحيحة النسائي ٥٣٢٧ )

٥٣٢٢- إن الله تعالى جميل يحب الجمال.

(صحيح) ( م ت ) عن ابن مسعود ( طب ) عن أبي أمامة ( ك ) عن ابن عمر ( ابن عساكر ) عن جابر وعن ابن عمر .

**٥٣٢٢-خوای گەورە جوانەو جوانی خۆشدەوێت**[1] .

(الصحيحة ١٦٢٦ )

٥٣٢٣- إن الله تعالى جميل يحب الجمال و يحب أن يرى أثر نعمته على عبده و يبغض البؤس و التباؤس.

(صحيح) ( هب ) عن أبي سعيد .

**٥٣٢٣-خوای گەورە جوانە و جوانی خۆش دەوێت، پێشی خۆشە شوێنەواری بەهرەی لەسەر بەندەكەی ببینێت و ، خۆشی لە هەژاری و خۆ بە هەژار دانان نایەت .**

(الصحيحة ١٣٢٠ )

٥٣٢٤- إن الله تعالى جميل يحب الجمال و يحب معالي الأخلاق و يكره سفسافها.

(صحيح) ( طس ) عن جابر .

**٥٣٢٤-خوای گەورە جوانە و جوانی خۆشدەوێت ، خۆشی لە ڕەوشتی بەرزیش دێت و، ڕقی لەڕەوشتی ناشرین و نزمە .**

(الصحيحة ١٦٢٦ )

٥٣٢٥- إن الله تعالى لا ينظر إلى مسبل إزاره.

(صحيح) ( حم ن ) عن ابن عباس .

---

[1] **واتە جوانی پۆشاك و جل و بەرگ .**

**٥٣٢٥-خوای گەورە تەماشای كەسێك ناكات پۆشاكەكەی لە زەوی بخشێت .**

( المشكاة ٤٣١١ )

٥٣٢٦- إن الله تعالى لا ينظر إلى من يجر إزاره بطرا.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة .

**٥٣٢٦-خوای گەورە تەماشای كەسێك ناكات لە خۆ بەزل زانینەوە جلی بەدوای خۆیدا ڕایكێشێت ،**

( المشكاة ٤٣١١ )

٥٣٢٧- إن الهدى الصالح و السمت الصالح جزء من سبعين جزءا من النبوة.

(حسن) ( طب ) عن ابن عباس .

**٥٣٢٧-ڕێبازی چاك و ڕواڵەتی چاك بەشێكە لە حەفتا بەشی پێغەمبەرایەتی[1] .**

(الروض النضير ٣٨٤ )

٥٣٢٨-إن الهدي الصالح و السمت الصالح و الاقتصاد جزء من خمسة و عشرين جزءا من النبوة.

(صحيح) ( حم د ) عن ابن عباس .

**٥٣٢٨-ڕێبازی چاك و ڕواڵەتی چاك و ، لەسەرخۆیی و هێمنی ، بەشێكە لە بیست و پێنج بەش لە پێغەمبەرایەتی[2] .**

(الروض النضير ٣٨٤ )

٥٣٢٩- إن هذه من ثياب الكفار فلا تلبسوها - يعني المعصفر -.

(صحيح) ( حم م ن ) عن ابن عمرو .

**٥٣٢٩-ئەوە لە پۆشاكی بێ باوەڕانە ، مەیپۆشە - واتە : پۆشاكی ڕەنگكراو بەڕەنگاری زەردی بە گیا گەزنە .**

(الصحيحة ١٧٠٤ )

٥٣٣٠- إن هذين حرام على ذكور أمتي حل لإناثهم - يعني الذهب و الحرير -.

(صحيح) ( حم د ن ه ) عن علي ( ه ) عن ابن عمر .

---

[1] **واتە : ئەم خەسڵەتانە خوای گەورە بەخشیویەتی بە پێغەمبەرەكانی ئێوەش شوێنكەوتوویان بن ، نەك ئەوە بگەیەنێت كە پێغەمبەرایەتی بەش بەش دەبێت ، یان ئەو كەسەی ئەوانە كۆبكاتەوە دەبێتە پێغەمبەر چونكە پێغەمبەرایەتی شتێك نییە بە هەوڵدان بەدەست بخرێت .**

[2] **ئەم فەرموودەیە لەسەنەدەكەیدا پیاوێك هەیە بەناوی ( قابوس بن ظبیان ) لاوازە . بڕوانە( فیض القدیر ٥١٠/٢ )( وەرگێڕ ) .**

**٥٣٣٠-ئەو دووانە قەدەغەن لەسەر نێرینەکانی ئومەتم و ، ڕەوان بۆ مێینەکانیان - واتە: ئاڵتوون و ئاوریشم.**

( الأرواء ٢٧٣ )

٥٣٣١- أولكلكم ثوبان ؟.

(صحيح) ( ق ن ه ) عن أبي هريرة ( حم د حب ) عن طلق .

**٥٣٣١-ئایا هەمووتان دوو پۆشاکتان هەیە[1] .**

( صحيح ابى داود ٦٣٦ )

٥٣٣٢- الإزار إلى نصف الساق أو إلى الكعبين لا خير في أسفل من ذلك.

(صحيح) ( حم ) عن أنس .

**٥٣٣٢-پۆشاك تاكو نیوەی قاچ یان تاكو هەردوو پاژنە ، لەوە خوارتر خێری تیا نییە.**

(الصحيحة ١٧٦٥ )

٥٣٣٣- الإسبال في الإزار و القميص و العمامة من جر منها شيئا خيلاء لم ينظر الله إليه يوم القيامة.

(صحيح) ( د ن ه ) عن ابن عمرو .

**٥٣٣٣-جل درێژ کردنەوە لە پۆشاك و کراس و مێزەردایە ، هەریەکێ شتێك لەوانە شۆڕکاتەوە بۆزەوی خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت تەماشایان ناکات[2] .**

( المشكاة ٤٣٣٢ )

٥٣٣٤- يا سفيان ! لا تسبل إزارك فإن الله لا يحب المسبلين .

(حسن) ( حم ه ) عن المغيرة بن شعبة.

**٥٣٣٤-ئەی سوفیان : جل و بەرگت ((شرواڵت)) شۆڕ مەکەرەوە ، چونکە خوای گەورە حەزی لەو کەسانە نییە جلیان شۆڕ دەکەنەوە سەر زەوی .**

(الصحيحة ٤٠٠٤ )

٥٣٣٥- التؤدة و الاقتصاد و السمت الحسن جزء من أربعة و عشرين جزءا من النبوة.

(صحيح) ( عبد بن حميد طب الضياء ) عن عبدالله بن سرجس .

---

[1] کاتێك پرسیاری لێکرا ئایا نوێژ دروسە لەیەك پۆشاکدا .

[2] ئەم فەرموودەیە کەسێك هەیە لە سەنەدیدا بەناوی ( عبدالعزيز بن رواد ) قسەی لەسەر کراوە لەلایەن زانایانەوە . بڕوانە (فيض القدير ٢٢٨/٣ ) ( وەرگێڕ ) .

**٥٣٣٥-هێمنى و ميانڕەوى و ، ڕواڵەتى جوان ، بەشێكە لە بيست و چوار بەش لە پيغەمبەرايەتى .**

( المشكاة ٥٠٥٩ )

٥٣٣٦- خير ثيابكم البياض ألبسوها أحياءكم و كفنوا فيها موتاكم.

(صحيح) ( الدارقطني في الأفراد ) عن أنس .

**٥٣٣٦-چاكترين جلەكانتان سپيەكانە ، بيكەن بە بەرگى زيندووەكانتان و كفنى مردووەكانتانيشى پێبكەن**

( المشكاة ١٦٣٨ )

٥٣٣٧- خير ثيابكم البياض فكفنوا فيها موتاكم و ألبسوها أحياءكم و خير أكحالكم الإثمد ينبت الشعر و يجلو البصر.

(صحيح) ( ه طب ك ) عن ابن عباس .

**٥٣٣٧-چاكترين پۆشاكەكانتان پۆشاكى سپى يە ، مردووەكانتانى پێ كفن بكەن و ، لەبەرى زيندووەكانتانى بكەن ، چاكترين سوورمەيشتان( الأثمد )كلە ، برژانگ دەڕوێنێ و چاو بەهێزدەكاتەوە .**

( المشكاة ١٦٣٨ )

٥٣٣٨- ذيل المرأة شبر.

(صحيح) ( هق ) عن أم سلمة وابن عمر.

**٥٣٣٨-داميْنى ئافرەت بستێكە**[1] .

(الصحيحة ١٨٦٢ )

٥٣٣٩- ذيلك ذراع.

(صحيح) ( ه ) عن أبي هريرة

**٥٣٣٩-داميْنت باسكێكە( ( گەزێكە ) ).**

(الصحيحة ١٨٦٤ )

٥٣٤٠-عليكم بالبياض من الثياب فليلبسها أحياؤكم و كفنوا فيها موتاكم فإنها خير ثيابكم.

(صحيح) ( حم ن ك ) عن سمرة.

---

[1] **واتە پێويستە بستێكى بەسەر زەويدا ڕاكێشێت ، وەكو دا پۆشينێكى زياتر .**

**٥٣٤٠-لەسەرتانە پۆشاكی سپی بپۆشن ، با زیندووەكانتان بیپۆشن و ، بیكەنە كفنی مردووەكانتان ، بەڕاستی چاكترین جل و بەرگتانە .**

( الجنائز ٦٣ )

٥٣٤١- عليكم بثياب البياض فليلبسها أحياؤكم و كفنوا فيها موتاكم

(صحيح) ( البزار ) عن أنس

**٥٣٤١-لەسەرتانە پۆشاكی سپی پەیدا بكەن ، با زیندووەكانتان لەبەری بكەن و ، مردووەكانتانی پێ كفن بكەن .**

( الروض ٤٠٧ )

٥٣٤٢-عليكم بثياب البيض فالبسوها و كفنوا فيها موتاكم

(صحيح) ( طب ) عن ابن عمر

**٥٣٤٢-لەسەرتانە پۆشاكی سپی لەبەربكەن و ، مردووەكانتانی پێ كفن بكەن .**

( الروض ٤٠٧ )

٥٣٤٣- كلوا و اشربوا و تصدقوا و البسوا في غير إسراف و لا مخيلة

(صحيح) ( حم ن ه ك ) عن ابن عمرو

**٥٣٤٣- بخۆن و بخۆنەوە و ، ببەخشن ، بپۆشن ، بێ زیادە ڕەوی و بێ كەشخەیی كردن .**

( المشكاة ٤٣٨١ )

٥٣٤٤- كل شيء جاوز الكعبين من الإزار في النار

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس

**٥٣٤٤-هەموو شتێك لە قولە پێ هاتە خوارەوە لە دۆزەخدایە .**

(الصحيحة ٢٠٣٧ )

٥٣٤٥- كان إذا اعتم سدل عمامته بين كتفيه

(صحيح) ( ت ) عن ابن عمر

**٥٣٤٥- پێغەمبەر ( ﷺ ) كاتێك مێزەری دەبەست شۆڕی دەكردەوە بە نێو شانیدا .**

(الصحيحة ٧١٦ )

٥٣٤٦- كان إذا لبس قميصا بدأ بميامنه

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة

**٥٣٤٦- پێغەمبەر ( ﷺ ) کاتێك کراسێکی لەبەردەکرد لەلای ڕاستەوە دەستی پێدەکرد .**

( المشكاة ٤٣٣٠ )

٥٣٤٧- كان يرخي الإزار من بين يديه و يرفعه من ورائه.

(صحيح) ( ابن سعد ) عن يزيد بن أبي حبيب مرسلا.

**٥٣٤٧- پێغەمبەر ( ﷺ ) لەکاتی ڕۆیشتندا پۆشاکەکەی لە پێشەوە شۆڕ دەکردەوە و ، لای دواوەی بەرز دەکردەوە[1] .**

(الصحيحة ١٢٣٨ )

٥٣٤٨- ما أسفل الكعبين من الإزار ففي النار.

(صحيح) ( خ ن ) عن أبي هريرة.

**٥٣٤٨-ئەوەی لە خواری قولە پێ بێت لە ئاگردایە .**

(الصحيحة ٢٠٣٧ )

٥٣٤٩- ما تحت الكعبين من الإزار ففي النار.

(صحيح)( ن ) عن أبي هريرة ( حم طب ) عن سمرة ( حم ) عن عائشة ( طب ) عن ابن عباس.

**٥٣٤٩-ئەوەی لە خواری قولە پێکانەوە بێت لە نێو ئاگردایە .**

(الصحيحة ٢٠٣٧ )

٥٣٥٠- ما خلف الكعبين ففي النار

(صحيح) ( طب ) عن ابن عمر

**٥٣٥٠-ئەوەی لە دوای قولە پێکانەوە بێت لە ئاگردایە .**

(الصحيحة ٢٠٢٧ )

٥٣٥١- من أسبل إزاره في صلاته خيلاء فليس من الله في حل و لا حرام

(صحيح) ( د ) عن ابن مسعود

**٥٣٥١-هەریەکێ پۆشاکەکەی لەناو نوێژدا درێژکاتەوە بۆ فیز و کەشخەکردن بڕوای بەهیچ حەلاڵ و حەرامێکی خوا نییە.[2]**

( صحيح ابى داود ٦٤٧ )

---

[1] لەکاتی ڕێکردندا بۆ ئەوەی پیس نەبێت .

[2] پێشەوا ئەوەوی ڕەحمەتی خوای لێ بێت فەرموویەتی بەریە لەخوا هیچ پەیوەندیەکی بە دینی خواوە نەماوە ، فیض القدير ج٦ ، ص ٦٨ ، ط٤ .

٥٣٥٢- من جر إزاره لا يريد بذلك إلا المخيلة فإن الله لا ينظر إليه يوم القيامة.

(صحيح) ( م ) عن ابن عمر.

**٥٣٥٢-هەريەكەسێك پۆشاكەكەى بەدواى خۆيدا ڕاكێشێت تەنها مەبەستيشى خۆ بەزلزانين بێت ، خواى گەورە لە ڕۆژى قيامەتدا تەماشاى ناكات .**

( الترغيب ٢٠٣٨ )

٥٣٥٣- من جر ثوبه خيلاء لم ينظر الله إليه يوم القيامة.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن ابن عمر.

**٥٣٥٣-هەريەكەسێك جل و بەرگەكەى بە فيزەوە بەدواى خۆيدا ڕاكێشێت ، خواى گەورە لە ڕۆژى قيامەتدا تەماشاى ناكات[1] .**

( الروض ٥٥٨ )

٥٣٥٤- من لبس الحرير في الدنيا لم يلبسه في الآخرة.

(صحيح) ( حم ق ن ه ) عن أنس.

**٥٣٥٤-هەريەكەسێك لە دونيادا ئاوريشم لەبەر بكات ، لە ڕۆژى دوايى لەبەرى ناكات .**

(الصحيحة ٣٨٣ )

٥٣٥٥- من لبس ثوب شهرة ألبسه الله يوم القيامة ثوبا مثله ثم يلهب فيه النار.

(حسن) ( د ه ) عن ابن عمر.

**٥٣٥٥-هەريەكەسێك پۆشاكى ناوازە و ناوبانگ لەبەر بكات[2] ، خواى گەورە لە ڕۆژى قيامەتدا پۆشاكێكى لەو شێوەى دەكاتە بەر و ئاگارى دەدا .**

( حجاب المرأة ١١٠ )

٥٣٥٦- من وطئ على إزار خيلاء وطئه في النار

(صحيح) ( حم ) عن هبيب

**٥٣٥٦-هەريەكەسێك هەنگاو بنێت پۆشاكى بە لە خۆبايى بوونەوە ، لە ئاگريشدا دەبێ هەنگاوى پێوە هەلگرێت .**

( الترغيب ٢٠٤٠ )

---

[1] ( ابن عبدالله ) دەڵێت : چەمكى فەرموودەكە وادەگەيەنێت كە ئەو كەسەى مەبەستى لەخۆ بايى بوون نەبێت ، هەڕەشەكە نايگرێتەوە ، بەلام هەر كراس و پۆشاكێك زۆر درێژ بكرێتەوە هەر بە خراپ باسكراوە .

[2] بەشێوەيەك كە ناوبانگ دەربكات لەنێو خەلكى دا .

٥٣٥٧- موضع الإزار إلى أنصاف الساقين و العضلة فإن أبيت فأسفل فإن أبيت فمن وراء الساق و لا حق للكعبين في الإزار.

(صحيح) ( ن ) عن حذيفة.

**٥٣٥٧-جێگای پۆشاك تاكو نیوەی هەردوو قاچ و ماسولكەی بەر ئەژنۆیە ، ئەگەر بەوە ڕازی نەبووی بیهێنەرە خوارترەوە ، ئەگەر نا بیهێنەرە خوارترەوە ، قولە پێكانیش مافیان نییە بەسەر شرواڵەوە .**

(الصحيحة ٢٣٦٦ )

٥٣٥٨- نهى عن الصماء و الاحتباء في ثوب واحد.

(صحيح) ( د ) عن جابر.

**٥٣٥٨-پێغەمبەر (ﷺ) شێوەی دانیشتنی ( الصماء )[1] و ( الاحتباء )[2] قەدەغە كردووە .**

( صحيح ابى داود ٤٠٨١ )

٥٣٥٩- هذا موضع الإزار فإن أبيت فأسفل فإن أبيت فلا حق للإزار فيما دون الكعبين.

(صحيح) ( حم ت ن ه ) عن حذيفة.

**٥٣٥٩-ئەمە جێگای جل و بەرگە ، ئەگەر ڕازی نابیت ، بیهێنە خوارترەوە ، ئەگەر نا نابێت پۆشاك بێتە خوار لا پاژنەوە .**

( الصحيحة ١٧٦٥ )

٥٣٦٠- لا تسبن أحدا و لا تحقرن من المعروف شيئا و لو أن تكلم أخاك و أنت منبسط إليه وجهك إن ذلك من المعروف و ارفع إزارك إلى نصف الساق فإن أبيت فإلى الكعبين و إياك و إسبال الإزار فإنه من المخيلة و إن الله لا يحب المخيلة و إن امرؤ شتمك و عيرك بما يعلم فيك فلا تعيره بما تعلم فيه فإنما وبال ذلك عليه.

(صحيح) ( د ) عن جابر بن سليم.

---

[1] واتە : سەرشانی ئاودامان كەخۆی لەنێویدا بپێچێتەوە و ، لاكانی بەرز نەكاتەوەو ، نەتوانێت هەردوو دەستی دەربهێنێت لە ژێرەوە نەبێت ، بۆیە مەترسی هەیە عەورەتی بكەوێتە دەر .

[2] مەناوی دەڵێت : دانیشێت لەسەر سمتی و پۆشاكێك بدات بەدەوری هەردوو قاچیدا ، ئەم شێوە دانیشتنەیش لەناو عەرەبدا باو بوو قەدەغەكردنیشی بەهۆی مەترسی دەركەوتنی عەورەتەوەیە .

**٥٣٦٠-جنێو بەکەس مەدە و ، هیچ چاکەیەك بەکەم مەزانە ، ئەگەر هەر ئەوەندەیش بێت لەگەڵ براکەت بە رووییەکی خۆشەوە قسەبکەیت بێگومان ئەوەش لە چاکەیە ، پۆشاکەکەشت بەرزبکەرەوە تاکو نیوەی قاچت ، ئەگەر نا تاکو هەردوو قولە پێت ، نەکەیت پۆشاکت درێژ کەیتەوە ، چونکە ئەوە خۆ بەزلزانینە و ، خوایش خۆشی نایەت لە خۆبەزلزانین ، ئەگەر کەسێکیش جنێوی پێدایت و پلاری تێگرتی بەشتێك کە دەیزانێت ، تۆ پلاری تێ مەگرە بە شتێك کە دەزانیت لەودا هەیە ، بێگومان گوناهەکەشی لەسەر ئەوە .**

(الصحيحة ١١٠٩ )

٥٣٦١- لا تركبوا الخز و لا النمار.

(صحيح) ( د ) عن معاوية.

**٥٣٦١-سوار ئاوریشم و پێستی پڵنگ مەبن لەسەری دامەنیشن[1] .**

( المشكاة ٤٣٥٧ )

٥٣٦٢- لا تمش في نعل واحدة و لا تحتب في ثوب واحد و لا تأكل بشمالك و لا تشتمل الصماء و لا تضع إحدى رجليك على الأخرى إذا استلقيت.

(صحيح) ( م ) عن جابر.

**٥٣٦٢-بەیەك تاك پێڵاوە وە مەڕۆ و ، خۆشت مە پێچەرەوە لەیەك پۆشاکدا ، بەدەستی چە پیشت مەخۆ ، بەشێوەیەکیش پۆشاك لە خۆتەوە مە پێچە کەجێگای دەستت نەمێنێ دەریبکەیت ، ئەگەرڕاشکشایت پێیەکت مەخەرە سەر پێیەکەی ترت .**

(الصحيحة ٣٤٨ )

٥٣٦٣- لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر قيل: إن الرجل يحب أن يكون ثوبه حسنا و نعله حسنة قال: إن الله جميل يحب الجمال الكبر بطر الحق و غمط الناس.

(صحيح) ( م ) عن ابن مسعود.

**٥٣٦٣-کەسێك بە ئەندازەی پارچە گەردیلەیەك لەخۆ بایی بوونی تێدا بێت ناچێتە بەهەشتەوە ، وتیان : پیاو حەزدەکات پێڵاوو جل و بەرگەکەی جوان بێت ، فەرووی : خوای گەورە جوانەو جوانی خۆشدەوێت ، پشت گوێ خستن و خۆبەزلزانین : نکۆڵی کردنە لەراستی و ، خواردنی مافی خەڵکە .**

( اصلاح المساجد ١١٥ )

---

**[1] واتە سواری پڵنگ مەبن لەسەر پێستەکەشی دامەنیشن ، چونکە ئەوە ئاکاری خۆ بە گەورە زانانە ، السراج المنير ج٢ ص٨٧٢ .**

٥٣٦٤- لا ينظر الله إلى من جر ثوبه خيلاء.

(صحيح) ( ق ت ) عن ابن عمر.

**٥٣٦٤-خوای گەورە تەماشای کەسێك ناکات جل و بەرگی بەفیزەوە بە دوای خۆیدا ڕاکێشێت لەڕووی خۆبەزلزانینەوە .**

(الصحيحة ٢٦٨٢ )

٥٣٦٥- لا ينظر الله يوم القيامة إلى من جر إزاره بطرا.

(صحيح) ( حم خ ) عن أبي هريرة.

**٥٣٦٥-خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا تەماشای کەسێك ناکات پۆشاکەکەیبە فیزەوە ڕاکێشابێت بەدوای خۆیدا .**

( صحيح ابن ماجة ٣٥٧٣ )

٥٣٦٦- يا جابر ! إذا كان واسعا فخالف بين طرفيه و إذا كان ضيقا فاشدده على حقويك.

(صحيح) ( ق د ) عن جابر .

**٥٣٦٦-ئەی جابر ! ئەگەر پان و بەرین بوو هەردوو چمکەکەی بەیەکدا بدە ، ئەگەریش تەنگ بوو بیبەستە بەناو گەڵتەوە .**

( صحيح ابى داود ٦٣٤ )

٥٣٦٧- احفظ عورتك إلا من زوجتك أو ما ملكت يمينك قيل: إذا كان القوم بعضهم في بعض؟ قال: إن استطعت أن لا يرينها أحد فلا يرينها قيل: إذا كان أحدنا خاليا ؟ قال: الله أحق أن يستحيا منه من الناس.

(حسن) ( حم ع ك هق ) عن بهز بن حكيم عن أبيه عن جده .

**٥٣٦٧-عەورەتت بپارێزە لەخێزانەکەت و کەنیزەکەکەت حەڵاڵەکەت نەبێت ، وترا : ئەگەر خەڵکەکە لەنێو یەکتردا بوون ؟ فەرمووی : ئەگەر توانیت کەسێك نەیبینێت با کەس نەیبینێ ، وترا : ئەگەر یەکێکمان بەتەنها بوو ؟فەرمووی : خوای گەورە لە پێشترە کە شەرمی لێ بکرێت .**

(غاية المرام ٧٠ )

٥٣٦٨- إن الفخذ عورة.

(صحيح) ( ك ) عن جرهد .

**٥٣٦٨-ڕان عەورەتە((شەرمگەیە)).**

( المشكاة ٣١١٢ )

٥٣٦٩- ما بين السرة و الركبة عورة

(حسن) ( ك ) عن عبدالله بن جعفر

**٥٣٦٩-لە نێوان ناوك و ئەژنۆدا شەرمگەیە .**

( الأرواء ٢٧١ )

٥٣٧٠- لا تكشف فخذك و لا تنظر إلى فخذ حي و لا ميت

(صحيح) ( د ) عن علي

**٥٣٧٠-ڕانت دەرمەخە و ، تەماشای ڕانی زیندوو و مردووش مەکە[1] .**

(الصحيحة ١٧٠٦ )

٥٣٧١- إنا نهينا أن ترى عوراتنا

(صحيح) ( ك ) عن جابر بن صخر .

**٥٣٧١-ئێمە لێمان قەدەغەکراوە شەرمگەمان ببینرێت .**

(الصحيحة ١٧٠٦ )

٥٣٧٢- خذ عليك ثوبك و لا تمشوا عراة

(صحيح) ( د ) عن المسور بن مخرمة .

**٥٣٧٢- پۆشاکەکەت لەبەرکە و ، بەرووتی مەگەڕێ .**

(الصحيحة ١٧٠٦ )

٥٣٧٣- غط فخذك فإن الفخذ عورة

(صحيح) (ك)عن محمد بن عبدالله بن جحش

**٥٣٧٣-ڕانت دا پۆشە بێگومان ڕان شەرمگەیە .**

( الأرواء ٦٦ )

٥٣٧٤- غط فخذك فإن فخذ الرجل من عورته

(صحيح) ( ك ) عن ابن عباس

---

[1] **ئەم فەرموودەیە لە ( صحيح الجامع ) دایە و ، مامۆستامان لاوازی کردووە لە ( ضعيف ابى داود و الأوراء ) دا ، بەلام بەهەندێك وشەی جیا جیا لەچەند ڕیوایەتێکدا .**

**٥٣٧٤-ڕانت دا پۆشە بێگومان ڕانی پیاو عەورەتە .**

( الأرواء ٦٦ )

٥٣٧٥- فخذ المرء المسلم من عورته.

(صحيح) ( طب ) عن جرهد.

**٥٣٧٥-ڕانی پیاوی موسڵمان بوشێکە لە شەرمگەی .**

( الأرواء ٦٦ )

٥٣٧٦- الفخذ عورة.

(صحيح) ( ت ) عن جرهد وابن عباس.

**٥٣٧٦-ڕان شەرمگەیە .**

( الأرواء ٢٦٩ )

٥٣٧٧- لِيَم نهيت أن أمشي عريانا.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس.

**٥٣٧٧-قەدەغە کراوە بەڕووتی بگەڕێم .**

(الصحيحة ٢٣٧٨ )

٥٣٧٨- نهيت عن التعري.

(صحيح) ( الطيالسي ) عن ابن عباس.

**٥٣٧٨-خۆ ڕووتکردنەوەم لێ قەدەغە کراوە.**

(الصحيحة ٢٣٧٨ )

٥٣٧٩- لا ينظر الرجل إلى عورة الرجل و لا تنظر المرأة إلى عورة المرأة و لا يفض الرجل إلى الرجل في ثوب واحد و لا تفض المرأة إلى المرأة في الثوب الواحد.

(حسن) ( حم م د ت ) عن أبي سعيد وروى ( ه ) صدره.

**٥٣٧٩-نابێت پیاو تەماشای شەرمگەی پیاو بکات و ، ژنیش نابێت تەماشای شەرمگەی ژن بکات ،دروستیش نییە دوو[1] پیاو پێکەوە بچنە ژێر یەك پۆشاکەوە ، یان دوو ئافرەت پێکەوە بچنە ژێر یەك پۆشاکەوە .**

( الأرواء ١٨٦٥ )

---

[1] **پیاو :واتە کەسی نێرینەی پێگەیشتوو ، یان چاکە و خراپە بفامێنێ .**

٥٣٨٠- يا أسماء ! إن المرأة إذا بلغت المحيض لم يصلح أن يرى منها شيء إلا هذا و هذا - و أشار إلى وجهه و كفيه -.

(حسن) ( د ) عن عائشة.

**٥٣٨٠-ئەی ئەسما ! ئافرەت کەگەیشتە کاتی بێ نوێژی ( حەیز ) دروست نیە جگە لە ئەوە و ، ئەوە – واتە : دەست و ڕوخساری – هیچ شوێنێکی تری ببینرێت .**

( المشكاة ٤٣٧٢ )

٥٣٨١- يا جرهد ! غط فخذك فإن الفخذ عورة.

(صحيح) ( حم د ت حب ك ) عن جرهد .

**٥٣٨١-ئەی ( جرهد ) ! ڕانت داپۆشە ، چونکە ڕان شەرمگەیە .**

( الأرواء ٦٦ )

٥٣٨٢- أحل الذهب و الحرير لأناث أمتي و حرم على ذكورها.

(صحيح) ( حم ن ) عن أبي موسى .

**٥٣٨٢-ئاڵتوون و ئاوریشم ڕەوایە بۆمێینەکانی ئومەتم وقەدەغەیە لەسەر نێرینەکانی.**

( الأرواء ٢٧٧ )

٥٣٨٣- إن كنتم تحبون حلية الجنة و حريرها فلا تلبسوها في الدنيا.

(صحيح) ( حم ن ك ) عن عقبة بن عامر .

**٥٣٨٣-ئەگەر حەز لە خشڵ و ئاوریشمی بەهەشت دەکەن ، لە دونیادا بەکاریان مەهێنن .**

(الصحيحة ٣٣٨ )

٥٣٨٤- الذهب و الحرير حل لإناث أمتي و حرام على ذكورها.

(صحيح) ( طب ) عن زيد بن أرقم وواثلة.

**٥٣٨٤-ئاڵتوون وئاوریشم ڕەوایە بۆمێینەکانی ئومەتم و،قەدەغەیە لەسەر نێرینەکانی.**

(الصحيحة ١٨٦٥ )

٥٣٨٥- إنما يلبس الحرير في الدنيا من لا خلاق له في الآخرة.

(صحيح) ( حم ق د ن ه ) عن عمر .

**٥٣٨٥-کەسێك لە دونیادا ئاوریشم لەبەردەکات ،کە لە دوارۆژدا لێ بێ بەش بێت.**

( الأرواء ٢٧٨ )

٥٣٨٦- حرم لباس الحرير و الذهب على ذكور أمتي و أحل لإناثهم.

(صحيح) ( ت ) عن أبي موسى .

**٥٣٨٦-لەبەرکردنی ئاوریشم و ئاڵتوون قەدەغەکراوە لەسەر نێرینەکانی ئوممەتم و ، ڕەوایە بۆ مێینەکانیان .**

(غاية المرام ٧٨ )

٥٣٨٧- الحرير ثياب من لا خلاق له.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عمر .

**٥٣٨٧-ئاوریشم پۆشاکی کەسێکە بێ بەش بێت (( لەدواڕۆژدا )) .**

(غاية المرام ٨٠ )

٥٣٨٨- من كان يؤمن بالله و اليوم الآخر فلا يلبس حريرا و لا ذهبا.

(صحيح) ( حم ك ) عن أبي أمامة.

**٥٣٨٨-هەریەکێ بڕوای بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە با ئاوریشم و ئاڵتوون نەپۆشن (( ناسك و ئەستورو تەنك )).**

(الصحيحة ٣٣٧ )

٥٣٨٩- نهى عن الديباج و الحرير و الإستبرق.

(صحيح) ( ه ) عن البراء.

**٥٣٨٩- پێغەمبەر ( ﷺ ) هەموو جۆرەکانی ئاوریشمی قەدەغەکردووە .**

( المشكاة ١٥٢٦ )

٥٣٩٠- ويل للنساء من الأحمرين: الذهب و المعصفر.

(حسن) ( هب ) عن أبي هريرة.

**٥٣٩٠-وەی بۆ ئافرەتان لە ئاڵتوون و پۆشاکی ڕەنگکراو بەگیا گەزنە[1] .**

(الصحيحة ٣٣٩ )

٥٣٩١- لا تلبسوا الحرير فإنه من لبسه في الدنيا لم يلبسه في الآخرة.

(صحيح) ( م ) عن ابن الزبير.

---

[1] واتە ئەوانەی خۆیان دەرازێننەوە بە ئاڵتوون و خشڵ و پۆشاکی ڕەنگاو ڕەنگ و بۆنخۆش و خۆیان ڕوت دەکەنەوە فیزو کەشخەی پێوە دەکەن، فيض القدير ج٦ ،ص٤٧٨ .

**٥٣٩١-ئاوریشم لەبەر مەکەن ، چونکە هەرکەسێك لە دوونیا لەبەری بکات لە دواڕۆژدا لەبەری ناکات .**

( الأرواء ٢٧٨ )

٥٣٩٢- لا ينبغي هذا للمتقين - يعني الحرير -.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن عقبة بن عامر.

**٥٣٩٢-ئەمە ناگونجێت بۆ کەسێك لە خوا بترسێت - واتە : ئاوریشم - .**

( المشكاة ٧٥٩)

٥٣٩٣- يا فاطمة ! أيسرك أن يقول الناس فاطمة بنت محمد في يدها سلسلة من نار ؟ !.

(صحيح) ( حم ن ك ) عن ثوبان.

**٥٣٩٣-ئەی فاتیمە ! ئایا پێت خۆشە بڵێن فاتیمەی کچی موحەممەد زنجیرەیەکی ئاگرین لە دەستی دایە .**

(الصحيحة ٤١١ )

٥٣٩٤- كان أحب الثياب إليه الحبرة

(صحيح) ( ق د ن ) عن أنس

**٥٣٩٤-چاکترین پۆشاك بەلای پێغەمبەرەوە (ﷺ) ، حیبەرە بوو[1] .**

( المشكاة ٤٣٠٤ )

٥٣٩٥- كان أحب الثياب إليه القميص.

(صحيح) ( د ت ك ) عن أم سلمة.

**٥٣٩٥-چاکترین پۆشاك بەلای پێغەمبەرەوە (ﷺ) کراس بوو .**

( المشكاة ٤٣٢٨ )

٥٣٩٦- نهى عن الْمُفَدَّمِ.

(صحيح) ( ه ) عن ابن عمر .

**٥٣٩٦-پێغەمبەر (ﷺ) پۆشاکی سوری تۆخی ڕەنگکراو گیا گەزنەی قەدەغە دەکرد .**

(الصحيحة ٢٣٩٥ )

٥٣٩٧- نهى عن المياثر الحمر و القسي.

(صحيح) ( خ ت ) عن البراء.

---

[1] **پۆشاکێکی یەمەنی یە .**

**٥٣٩٧- پێغەمبەر (ﷺ) دۆشەكی زین كەلە ئاوریشم دروستكرابێت و پۆشاكی ئاوریشمی جۆری( القسی )[1] قەدەغە كردووە .**

( المشكاة ٤٣٥٨ )

٥٣٩٨- نهى عن الميثرة الأرجوان

(صحيح) ( ت ) عن عمران

**٥٣٩٨- پێغەمبەر (ﷺ) زینێكی قەدەغەكردووە كەلە ئاوریشمی سور درووست دەكرێت .**

(الصحيحة ٢٣٩٦ )

٥٣٩٩- لا أركب الأرجوان و لا ألبس المعصفر و لا ألبس القميص المكفف بالحرير ألا و طيب الرجال ريح لا لون له ألا و طيب النساء لون لا ريح له.

(صحيح) ( حم د ك ) عن عمران بن حصين.

**٥٣٩٩-سواری زینێك نابم لە ئاوریشمی سوربێت و ، پۆشاكی ڕەنگكراو بە گیا گەزنە لەبەر ناكەم و ، كراسێك لەبەرناكەم فەقیانەكانی و قەراغەكانی لە ئاوریشم چنرابن ، ئاگاداربن گوڵاوی پیاوان بۆنی هەیە و ڕەنگی نییە ، گوڵاوی ژنانیش ڕەنگی هەیە و بۆنی نییە .**

( المشكاة ٤٣٥٤ )

## بابەتی ئەنگوستیلە

٥٤٠٠- إنا قد اتخذنا خاتما و نقشنا فيه نقشا فلا ينقش أحد على نقشه

(صحيح) ( خ ن ه ) عن أنس .

**٥٤٠٠-ئێمە ئەنگوستیلەیەكمان هەڵبژاردووە و نقێمێكمان لەسەری هەڵكەندووە ، با كەس لەو نقێمە هەڵنەكەنێ .**

(الصحيحة ٣٥٥١ )

٥٤٠١- إني قد اتخذت خاتما من فضة و نقشت عليه محمد رسول الله فلا ينقش أحد على نقشه

(صحيح) ( حم ق ) عن أنس .

**٥٤٠١-من ئەنگوستیلەیەكم هەڵبژاردووە لە زیو وە نەخشی ( محمد رسول الله ) م لەسەر هەڵكەندووە باكەس ئەو نەخشە هەڵنەكەنێت لەسەر ئەنگوستیلەی خۆی .**

(الصحيحة ٣٣٠٠ )

---

[1] ئەم پۆشاكە خەتی ئاوریشمی تێدایە ، السراج المنير ج٢ ، ص٨٧٧ .

٥٤٠٢- كان يتختم بالفضة

(صحيح) ( طب ) عن عبدالله بن جعفر

**٥٤٠٢- پێغەمبەر ( ﷺ ) ئەنگوستیلەی زیوی لە پەنجە دەکرد .**

٥٤٠٣- كان يتختم في يساره

(صحيح) ( م ) عن أنس (صحيح) ( د ) عن ابن عمر

**٥٤٠٣- پێغەمبەر ( ﷺ ) ئەنگوستیلەی دەکردە پەنجەیەکی دەستی چەپی .**

( الأرواء ٨١٢ )

٥٤٠٤- كان يتختم في يمينه.

(صحيح) ( خ ت ) عن ابن عمر ( م ن ) عن أنس ( حم ت ه ) عن عبدالله بن جعفر.

**٥٤٠٤- پێغەمبەر ( ﷺ ) ئەنگوستیلەی دەکردە پەنجە تووتەی[1] دەستی چەپی .**

( الأرواء ٨١٢ )

٥٤٠٥- كان يجعل فصه مما يلي كفه.

(صحيح) ( ه ) عن أنس وابن عمر.

**٥٤٠٥- پێغەمبەر ( ﷺ ) نقێمی ئەنگوستیلەی دەکردە پەنجەی بەلای لەپی دەستیەوە .**

( المشكاة ٤٣٨٣ )

٥٤٠٦- ما لي أرى عليك حلية أهل النار - يعني خاتم الحديد -.

(صحيح) ( ٣ ) عن بريدة.

**٥٤٠٦-ئەوە چییە خشلی خەڵکی دۆزەخت پێوە دەبینم - واتە : ئەنگوستیلەی ئاسن .**

( صحيح ابى داود ٤٢٢٣ )

٥٤٠٧- نهى عن التختم بالذهب.

(صحيح) ( ت ) عن عمران بن حصين.

**٥٤٠٧- پێغەمبەر ( ﷺ ) لە پەنجەکردنی ئەنگوستیلەی ئاڵتوونی قەدەغە کردوە .**

( المشكاة ٤٤٠٦ )

٥٤٠٨- نهى عن خاتم الذهب.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة.

**٥٤٠٨- پێغەمبەر ( ﷺ ) ئەنگوستیلەی ئاڵتوونی قەدەغەدەکردوە[2] .**

(الصحيحة ١٢٤٢ )

---

[1] **السراج المنير ج٢ ، ص٨٧٨ ، ط٣ .**

[2] **لەسەر پیاوان .**

٥٤٠٩- نهى عن خاتم الذهب و عن خاتم الحديد.

(صحيح) ( هب ) عن ابن عمرو.

**٥٤٠٩- پێغەمبەر ( ﷺ ) ئەنگوستیلەی ئاڵتوون و ئاسنی قەدەغەدەكردوە.**

(الصحيحة ١٢٤١ )

٥٤١٠- لا ينبغي لأحد أن ينقش على نقش خاتمي هذا.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عمر.

**٥٤١٠-نابێت كەس وەكو نەخشی ئەنگوستیلەكەی منی هەبێت .**

( صحيح النسائي ٥٢١٦ )

٥٤١١- لا ينقش أحد على نقش خاتمي هذا.

(صحيح) ( م ه ) عن ابن عمر.

**٥٤١١-با كەستان وەكو نەخشی ئەنگوستیلەكەی من هەڵنەكەنێت .**

( الأرواء ٨١٠ )

٥٤١٢- يعمد أحدكم إلى جمرة من نار فيجعلها في يده.

(صحيح) ( م ) عن ابن عباس.

**٥٤١٢-كەسی واتان هەیە دەچێت ژیلەمۆیەك هەڵدەگرێت و دەیكاتە دەستی خۆی[1] .**

( المشكاة ٤٣٨٥ )

## بابەتی نەعل

٥٤١٣- أحفهما جميعا أو انعلهما جميعا و إذا لبست فابدأ باليمنى و إذا خلعت فابدأ باليسرى

(صحيح) ( حب ) عن أبي هريرة .

**٥٤١٣-یان هەردوكیان فڕێدە ، یان هەردوكیان لە پێ بكە ، ئەگەر لە پێت كرد لای ڕاست دەست پێ بكە و ، بۆ داكەندنیش بە لای چەپەوە دەست پێ بكە .**

(الصحيحة ١١١٧ )

٥٤١٤- إذا انتعل أحدكم فليبدأ باليمنى و إذا خلع فليبدأ باليسرى لتكون اليمنى أولهما تنعل و آخرهما تنزع.

(صحيح) ( حم م د ت ه ) عن أبي هريرة .

---

[1] بەو كەسەی فەرموو كە ئەنگوستیلەی ئاڵتوونی لەدەست كرد .

**٥٤١٤-كە يەكێكتان ويستى ((نەعل)) پێڵاو لە پێ بكات با بە لاى ڕاستەوە دەست پێ بكات ، ئەگەر ويستيشى دايانكەنێت با بەلاى چەپ دەست پێ بكات ، دەبێ يەكەم جار لاى ڕاست لە پێ بكەيت و لەداكەندنيشيا لە كۆتاييدا داييكەنيت .**

(الروض ١٠٤٢ )

٥٤١٥- إذا انقطع شسع أحدكم فلا يمش في نعل واحدة حتى يصلح شسعه و لا يمشي في خف واحد و لا يأكل بشماله و لا يحتب بالثوب الواحد و لا يلتحف الصماء

(صحيح) ( م د ) عن جابر .

**٥٤١٥-ئەگەر قەيتانى پێڵاوى يەكێكتان قرتا، بابەتاكێكەوە نەڕوات ، تاكوقەيتانى تاكەكەى تر چاك دەكاتەوە،با بەيەك تاكێكيشەوە بە ڕێگادا نەڕوات ، بەدەستى چەپى نەخوات و، لە پۆشاكێكدا خۆى نە پێچێتەوە بەشێوەيەك كە ڕێگاى دەستى نەبێت دەرى بكات.**

( المشكاة ٤٤١٢ )

٥٤١٦- إذا انقطع شسع نعل أحدكم فلا يمش في الأخرى حتى يصلحها.

(صحيح) ( خد م ن ) عن أبي هريرة ( طب ) عن شداد بن أوس ..

**٥٤١٦- ئەگەر قەيتانى پێڵاوى يەكێكتان قرتا ، بابەتاكەكەى ترەوە نەڕوات تاكو چاكى دەكاتەوە .**

( صحيح النسائى ٥٣٦٩ )

٥٤١٧- استكثروا من النعال فإن الرجل لا يزال راكبا ما دام منتعلا.

(صحيح) ( حم تخ م ن ) عن جابر ( طب ) عن عمران بن حصين ( طس ) عن ابن عمرو.

**٥٤١٧-بەزۆرى پێڵاو لە پێ بكەن ، چونكە پياو پێڵاو لە پێدا بێت وەكو ئەوەيە سوار بوو بێت[1] .**

(الصحيحة ٣٤٤ )

٥٤١٨- كان يحب التيامن ما استطاع في طهوره و تنعله و ترجله و في شأنه كله

(صحيح) ( حم ق ) عن عائشة

**٥٤١٨- پێغەمبەر (ﷺ) لە دەستنوێژ و لە پێڵاو لەپێ كردن و قژ داهێنان و هەموو كارەكانيدا پێ خۆش بوو بەلاى ڕاست دەست پێ بكات .**

( صحيح النسائى ٥٢٤٠ )

---

[1] بەهۆى كەمى ماندويى و سەلامەتى پێ لە دڕك و ...

٥٤١٩- المنتعل بمنزلة الراكب.

(صحيح) ( سمويه ) عن جابر.

**٥٤١٩- پێڵاو لە پێ وەكو سوارە وايە .**

(الصحيحة ٣٤٥ )

٥٤٢٠- المنتعل راكب.

(صحيح) ( ابن عساكر ) عن أنس.

**٥٤٢٠- پێڵاو لە پێ سوارە .**

(الصحيحة ٣٤٥ )

٥٤٢١- نهى أن يمس الرجل ذكره بيمينه و أن يمشي في نعل واحدة و أن يشتمل الصماء و أن يحتبي في ثوب ليس على فرجه منه شيء.

(صحيح) ( ن ) عن جابر.

**٥٤٢١- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی كردووە پیاو كۆئەندامی پیاوەتی خۆی بەدەستی ڕاستی بگرێت و ، بەیەك تاكە پێڵاومو بە ڕێگەدا بڕوات و ، پۆشاكێك لەخۆیەوە بپێچێت جێگای دەست دەرهێنانی نەبێت ، یان بەشێوەیەك بێت ئەندامەكانی شەرمی دانە پۆشێت.**

( المشكاة ٤٤١١ )

٥٤٢٢- نهى أن يمشي الرجل في نعل واحدة أو خف واحدة.

(صحيح) ( حم ) عن أبي سعيد.

**٥٤٢٢- پێغەمبەر(ﷺ)قەدەغەی كردووە كەسێك بەیەك تاك پێڵاوەوە یان یەك خوفەوە بڕوات.**

(المشكاة ٤٤١١)

٥٤٢٣- نهى أن ينتعل الرجل و هو قائم.

(صحيح) ( ت الضياء ) عن أنس.

**٥٤٢٣- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی كردووە پیاوبەڕاوەستانەوە پێڵاو لە پێ بكات[1] .**

(الصحيحة ٧١٨ )

٥٤٢٤- لا يمش أحدكم في نعل واحدة و لا خف واحد لينعلهما جميعا أو ليخلعهما جميعا.

(صحيح) ( ق د ت ه ) عن أبي هريرة.

---

[1] **ئەم فەرمانە بۆ ئامۆژگارییە ، چونكە بەدانیشتنەوە ئاسانترە ، ئەگەر نا بە پێشەوە لە پێی بكات هەر دروستە هەندێ لەو پێڵاوانەی پیاوان دەوترێت ( شحاطة ) و ( قبقاب ) .**

**٥٤٢٤-کەستان با بەیەك تاکە پێڵاوەوە یان یەك تاك خوفەوە نەڕوات ، یان هەردووکیان لە پێ بکات ، یان هەردوکیان دایانبکەنێت .**

(الصحيحة ٣٤٨ )

٥٤٢٥- كان يلبس النعال السبتية و يصفر لحيته بالورس و الزعفران.

(صحيح) ( ق د ) عن ابن عمر.

**٥٤٢٥-پێغەمبەر (ﷺ) پێڵاو سەبتی[1] لە پێ دەکرد ،ڕیشیشی ڕەنگ دەکرد بەڕووەکی وەرس و زافەران.**

( المشكاة ٤٤٥٣ )

٥٤٢٦- أكثروا من هذه النعال فإن الرجل لا يزال راكبا ما انتعل.

(صحيح) ( د ) عن جابر .

**٥٤٢٦-بەردەوام پێڵاو لە پێ بکەن چونکە پیاو پێڵاوی لە پێدابێت وەکو ئەوەیە سواربێت.**

(الصحيحة ٣٤٥ )

## بابەتی سەر داهێنان

٥٤٢٧- أما كان يجد هذا ما يسكن به رأسه ؟ أما كان يجد هذا ما يغسل به ثيابه ؟.

(صحيح) ( حم د حب ك ) عن جابر .

**٥٤٢٧-ئایا ئەو کەسە هیچی دەست نەدەکەوت قژی خۆی پێ دابهێنێ[2] ، ئایا ئەو کەسە هیچی دەست نەدەکەوت جلەکانی پێ بشوات .**

(الصحيحة ٩٣ )

٥٤٢٨- إن أحسن ما غيرتم به هذا الشيب: الحناء و الكتم.

(صحيح) ( حم ٤ حب ) عن أبي ذر .

**٥٤٢٨-چاکترین شت نیشانەی پیری پێ بگۆڕن : خەنە و کەتەمە[3] .**

(الصحيحة ١٥٠٩ )

---

[1] واتە : خۆشە کراو ((دەباغ کراو)) یان ئەوجۆرەی مووەکەی لابراوە .

[2] وەکو چەور کردن و شانە کردن .

[3] جۆرە ڕووەکێکە .

٥٤٢٩- إن اليهود و النصارى لا يصبغون فخالفوهم.

(صحيح) ( ق د ن ه ) عن أبي هريرة .

**٥٤٢٩-جولەكە و گاورەكان (( ڕەنگ )) بۆیاخ ناكەن بۆیە پێچەوانەكەیان بكەن.**

(غاية المرام ١٠٥ )

٥٤٣٠- غيروا الشيب و لا تشبهوا باليهود و النصارى.

(صحيح) ( حم حب ) عن أبي هريرة.

**٥٤٣٠-سپێتی سەر و ڕیش بگۆڕن و ، خۆتان مەچوێنن بە جولەكەو گاورەكان .**

(الصحيحة ٨٣٦ )

٥٤٣١- غيروا الشيب و لا تقربوه السواد

(صحيح) ( حم ) عن أنس

**٥٤٣١-نیشانەی پیری بگۆڕن و ، بەلاَم ڕەنگی ڕەشی توخن نەخەن .**

(الصحيحة ٤٩٦ )

٥٤٣٢- غيروا رأسه بشيء و اجتنبوا السواد

(صحيح) ( م د ن ه ) عن جابر

**٥٤٣٢- ڕەنگی سپێتی سەری بگۆڕن و[1] ، خۆتان لە ڕەش بپارێزن .**

(غاية المرام ١٠٦)

٥٤٣٣- الشيب نور المؤمن لا يشيب رجل شيبة في الإسلام إلا كانت له بكل شيبة حسنة و رفع بها درجة.

(حسن) ( هب ) عن ابن عمرو

**٥٤٣٣-مووی سپی ڕوناكی ئیمانداره ، هەركەسێك لە ئیسلامدا موویەكی سپی بێت ئەستەمە بەهەر تاڵە موویەك چاكەیەكی بۆ نەنوسرێت و ، پلەیەك بەرز دەبێتەوە .**

(الصحيحة ١٢٤٣ )

٥٤٣٤- غيروا الشيب و لا تشبهوا باليهود

(صحيح) ( حم ن ) عن الزبير ( ت ) عن أبي هريرة

**٥٤٣٤-سپێتی سەر و ڕیش بگۆڕن و ، با لە جولەكەنەكەن .**

(الصحيحة ٨٣٦ )

---

[1] **دەربارەی أبي قُحافة ی باوكی ابوبكری صدیق فەرمووی . السراج المنير ج٢ ص٨٨٢ .**

٥٤٣٥- كان يأمر بتغيير الشعر مخالفة للأعاجم.

(حسن) ( طب ) عن عتبة.

**٥٤٣٥-پێغەمبەر(ﷺ)فەرمانی دەکرد بە گۆڕینی مووی سپی ،بەمەبەستی جیاوازی لەگەڵ عەجەمەکاندا[1].**

(الصحيحة ٢١١٤ )

٥٤٣٦- لا تنتفوا الشيب ما من مسلم يشيب شيبة في الإسلام إلا كانت له نورا يوم القيامة

(صحيح) ( د ) عن ابن عمر

**٥٤٣٦-مووی سپی هەڵمەکێشن ، هەرموسڵمانێك سەرو ریشی سپی بێت لە ئیسلامدا ، بۆی دەبێتە نورو ڕوناکی لە ڕۆژی قیامەتدا .**

( المشكاة ٤٤٥٨ )

٥٤٣٧- ما من مسلم يشيب شيبة في الإسلام إلا كتب الله له بها حسنة و حط عنه بها خطيئة

(صحيح) ( د ) عن ابن عمرو

**٥٤٣٧-هەر موسڵمانێك نیشانەی پیری لێ دەرکەوێت لەئیسلامدا حەتمەن خوای گەورە بەوە چاکەیەکی بۆ دەنوسێت و ، خراپەیەکی پێ دەسڕێتەوە بۆی .**

( صحيح ابى داود ٤٢٠٢ )

٥٤٣٨-٥٤٣٨- من شاب شيبة في الإسلام كانت له نورا يوم القيامة

(صحيح) ( ت ن ) عن كعب بن مرة

**٥٤٣٨- هەرکەسێك نیشانەی پیری لێ دەرکەوێت لە ئیسلامدا. بۆی دەبێتە نورو ڕووناکی لەرۆژی قیامەتدا.**

(الصحيحة ١٢٤٤)

٥٤٣٩- من شاب شيبة في سبيل الله كانت له نورا يوم القيامة

(صحيح) ( حم ت ن حب ) عن عمرو بن عبسة

**٥٤٣٩- هەرکەسێك نیشانەیەکی پیری لێ دەرکەوێت لە پێناو خوادا. بۆی دەبێتە نورو ڕووناکی لە ڕۆژی قیامەتدا.**

(الصحيحة ١٢٤٤)

---

[1] **واتە گۆڕینی ڕەنگی سپی سەرو ریش بەخەنە نەك بە ڕەنگی ڕەش .**

٥٤٤٠- نهى عن نتف الشيب.

(صحيح) ( ت ن ه ) عن ابن عمرو.

**٥٤٤٠- پێغەمبەر (ﷺ) هەڵکەندنی مووی سپی قەدەغە کردووە[1].**

(المشكاة ٤٤٥٨)

٥٤٤١- يكون في آخر الزمان قوم يخضبون بالسواد كحواصل الحمام لا يريحون رائحة الجنة.

(صحيح) (د ن) عن ابن عباس.

**٥٤٤١- لە کۆتایی ڕۆژگاردا کەسانێك پەیدا دەبن بەڕەنگی بۆیاخی سەرو ڕیشیان دەکەن، وەکو جیقڵدانی چۆلەکە، بۆنی بەهەشت ناکەن.**

(المشكاة ٤٤٥٢)

٥٤٤٢- نهى عن الوسم في الوجه و الضرب في الوجه.

(صحيح) ( حم م ت ) عن جابر.

**٥٤٤٢- پێغەمبەر (ﷺ) خاڵ کردن و لێدانی دەم و چاوی قەدەغە کردووە.**

(الارواء ٢٢٤٧)

٥٤٤٣- نهى عن الوشم.

(صحيح) ( حم ) عن أبي هريرة.

**٥٤٤٣- پێغەمبەر (ﷺ) خاڵ کوتانی قەدەغە کردووە.**

(غاية المرام ٩٤)

٥٤٤٤-لا تشمن و لا تستوشمن.

(صحيح) ( خ ن ) عن أبي هريرة.

**٥٤٤٤- نەخاڵ بوکتە و، نە داوا بکە بۆت بکوترێت.**

(الصحيح النسائى ٥١٠٦)

٥٤٤٥-٥٤٤٥- لعن الله الواصلة و المستوصلة و الواشمة و المستوشمة.

(صحيح) ( حم ق ) عن ابن عمر.

**٥٤٤٥- نەفرینی خوا لەو کەسەبێت قژ دەخاتە سەر قژی خۆی یان داوا دەکات قژی بۆ بخرێتە سەر قژی ، هەروەها خاڵکوت و خاڵ بۆ کوتراو.**

(المشكاة ٤٤٣٠)

---

[1] **لە ڕیش و سەر.**

٥٤٤٦- لعن الله الواشمات و المستوشمات و النامصات و المتنمصات و المتفلجات للحسن المغيرات خلق الله.

(صحيح) ( حم ق) عن ابن مسعود .

**٥٤٤٦- نەفرینی خوا لـە خـاڵ کـوت و خـاڵ بـۆ کـوتـراو، ئـەو ئافرەتـانـەش بـرۆ باریـك دەكەنـەوە بـۆ ئـافرەتی تـر و ئـەو ئافرەتـانـەش بـرۆی بـۆ باریـك دەكرێتـەوە، ئـەو ئافرەتـانەش دەستکاری ددانیان دەكەن و جوانی و دروستکراوی خوا دەگۆڕن.**

(غاية المرام ٩٤)

٥٤٤٧- أحفوا الشوارب و اعفوا اللحى.

(صحيح) ( م ت ن ) عن ابن عمر (صحيح) ( عد ) عن أبي هريرة.

**٥٤٤٧- بەرسمێڵتان بگرن و کورتی[1] بکەنەوە. ڕیشتان بهێڵنەوە.**

(جلباب المرأة ١٨٥)

٥٤٤٨- احلقوه كله أو اتركوه كله.

(صحيح) ( د ن ) عن ابن عمر .

**٥٤٤٨- هەمووی بتاشن یان هەمووی بهێڵرەوە[2].**

(الصحيحة ١١٢٣)

٥٤٤٩- إذا كان لأحدكم شعر فليكرمه.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة (صحيح) ( هب ) عن عائشة .

**٥٤٤٩- ئەگەر کەسێکتان قژی هەبوو با ڕێزی لێ بگرێت[3].**

(الصحيحة ٥٠٠)

٥٤٥٠- اذهبوا به - يعني بأبي قحافة - إلى بعض نسائه فليغيره بشيء و جنبوه السواد.

(صحيح) ( حم م ) عن جابر .

**٥٤٥٠- بیبەن- واتە: ئەبو قوحافە- بۆ لای یەکێك لە ژنەکانی با سپێتی سەری بگۆڕێت و بەلای ڕەشی نزیك مەخەن.**

(غاية المرام ١٠٦)

---

[1] مەناوی دەڵێت : بەلام تاشینی سمێڵ بەتەواوی مەکروهە لەسەر بۆچونی پەسەند بە لای شافیعیەکانەوە و مالیك فەرموویەتی بیدعەیە و پێویستە لەو کەسە بدرێت وا دەکات.

[2] قژی سەر.

[3] بە شۆردن و چاککردنەوە و شانە کردنەوە واتە : ئەگەر قژی هێشتنەوە و درێژی کرد.

٥٤٥١- أعفوا اللحى و جزوا الشوارب و غيروا شيبكم و لا تشبهوا باليهود و النصارى.

(صحيح) ( حم ) عن أبي هريرة .

**٥٤٥١- ڕیش بهێڵنەوەو، سمێڵ كورت بكەنەوەو، نیشانەی پیری بگۆڕن و، خۆتان مەچوێنن بە جولەكە و گاورەكان.**

(حجاب المرأة ٩٤)

٥٤٥٢- أكرم شعرك و أحسن إليه.

(حسن)( ن ) عن أبي قتادة .

**٥٤٥٢- ڕێز لە قژت بگرە و چاكی ڕابگرە.**

(الصحيحة ٥٠٠)

٥٤٥٣- أكرموا الشعر.

(صحيح) ( البزار ) عن عائشة.

**٥٤٥٣- ڕێز لە موو ((قژ)) بگرن.**

(الصحيحة ٥٠٠)

٥٤٥٤- إن اتخذت شعرا فأكرمه.

(حسن)( هب ) عن جابر.

**٥٤٥٤- ئەگەر قژت هێشتەوە ڕێزی لێ بگرە.**

(الصحيحة ٦٦٦)

٥٤٥٥- إنما هلكت بنو إسرائيل حين اتخذ هذه نساؤهم - يعني قصة من شعر -.

(صحيح) ( ق ٣ ) عن معاوية ..

**٥٤٥٥- بەنی ئیسرائیل ئەو كاتە لە نێو چوون ژنەكانیان ئاوایان دەكرد- واتە :بڕینی قژ-.**

(غاية المرام ١٠٠)

٥٤٥٦- إنه قد لعن الموصولات.

(صحيح) ( ق ) عن عائشة .

**٥٤٥٦- نەفرین كراوە لەوانەی قژی خەڵكی دەخەنە سەر قژی خۆیان.**

(الترغيب ٢١٠٢)

٥٤٥٧- انهكوا الشوارب و أعفوا اللحى.

(صحيح) ( خ ) عن ابن عمر .

**٥٤٥٧- سمێڵ كورت بكەنەوە و، ڕیش بهێڵنەوە.**

(المشكاة ٤٤٢١)

٥٤٥٨- أيما امرأة زادت في رأسها شعرا ليس منه فإنه زور تزيد فيه.

(صحيح) ( ن ) عن معاوية .

**٥٤٥٨- هەر ئافرەتێك قژێكی تر بخاتە سەر قژی خۆی، ئەو زیادەیە درۆ و دەلەسەیە.**

(الصحيح النسائى ٥٠٩٣)

٥٤٥٩- جزوا الشوارب و أرخوا اللحى خالفوا المجوس.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة .

**٥٤٥٩- سمێڵ كورت بكەنەوە و، ڕیش درێژ بكەن و، پێچەوانەی لە ئاگر پەرستەكان بكەن.**

(الضعيفة ٢١٠٧)

٥٤٦٠- خالفوا المشركين أحفوا الشوارب و أوفوا اللحى.

(صحيح) ( ق ) عن ابن عمر .

**٥٤٦٠- جیاوازبن لەگەڵ بتپەرستان و، بەرسمێڵ بكەن و، ڕیش بهێڵنەوە.**

(الارواء ٧٦)

٥٤٦١- قصوا الشوارب و اعفوا اللحى.

(حسن) ( حم ) عن أبي هريرة.

**٥٤٦١- سمێڵ ببڕن و، ڕیش بهێڵنەوە.**

(الضعيفة ٤٠٥٧)

٥٤٦٢- من كان له شعر فليكرمه.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة.

**٥٤٦٢- هەركەسێك قژی هەیە با ڕێزی لێ بگرێت.**

(الصحيحة ٥٠٠)

٥٤٦٣- من لم يأخذ من شاربه فليس منا.

(صحيح) ( حم ت ن الضياء ) عن زيد بن أرقم.

**٥٤٦٣- هەركەسێك سمێلی نەگیرێت، لە ئێمە نییە.**

(المشكاة ٤٤٣٨)

٥٤٦٤- نهى عن الترجل إلا غبا.

(صحيح) ( حم ٣ ) عن عبدالله بن مغفل.

**٥٤٦٤- پێغەمبەر (ﷺ) سەر شانە كردنی قەدەغە كردووە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نەبێت[1].**

(الصحيحة ٥٠١)

٥٤٦٥- وفروا اللحى و خذوا من الشوارب .........

(صحيح) ( طس ) عن أبي هريرة.

**٥٤٦٥- ڕیش بهێڵنەوە و، لە سمێڵیش لێی بگرن.**

(الضعيفة ٤٧٤٩)

٥٤٦٦- وفروا عثانينكم و قصوا سبالكم.

(حسن) ( هب ) عن أمامة.

**٥٤٦٦- ریشتان ((ڕدێنتان)) بهێڵنەوە و، سمێڵتان ببڕن.**

(الصحيحة ١٢٤٥)

## بابەتی گوڵاو

٥٤٦٧- إذا استعطرت المرأة فمرت على القوم ليجدوا ريحها فهي زانية.

(حسن) ( ٣ ) عن أبي موسى .

**٥٤٦٧- ئەگەر ئافرەت خۆی بۆنخۆش بكات و بەلای كەسانێكدا تێپەڕبێت بۆ ئەوەی بۆنە خۆشەكەی هەڵمژن، ئەو ئافرەتە داوێن پیسە[2].**

(المشكاة ١٠٦٥)

٥٤٦٨- أطيب الطيب المسك.

(صحيح) ( حم م د ن ) عن أبي سعيد .

**٥٤٦٨- بۆخۆشترین گوڵاو میسكە[3].**

(الصحيحة ٤٨٦)

---

[1] مەناوی دەڵێت ئەوە سوننەتە ، مەبەستیش ئەوەیە گرنگی زۆری پێ نەدرێت واتە نەكرێتە هیوایەت.

[2] واتە : ڕووبەڕوی داوێن پیسی دەچێت چونكە هۆكارەكانی دروستكردووە....

[3] (ابن القيم) دەفەرموێت : ئەو كەسە بەهەڵەدا چووە عەنبەری پێش میسك خستووە.

٥٤٦٩- إن خير طيب الرجال ما ظهر ريحه و خفي لونه و خير طيب النساء ما ظهر لونه و خفي ريحه.

(صحيح) ( ت ) عن عمران بن حصين .

**٥٤٦٩- چاكترين گوڵاوی پیاوان ئەوەيە بۆنی هەبێت و ڕەنگی ديار نەبێت، چاكترين گوڵاوی ئافرەتانيش ئەوەيە ڕەنگی ديار بێت و بۆنی پياومان بێت.**

(المشكاة ٤٤٤٣)

٥٤٧٠- أيما امرأة استعطرت ثم خرجت فمرت على قوم ليجدوا ريحها فهي زانية و كل عين زانية.

(حسن) ( حم ن ك ) عن أبي موسى .

**٥٤٧٠- هەر ئافرەتێك خۆی بۆنخۆش بكات و بەلای كەسانێكدا تێپەربێت بۆ ئەوەی بۆنی بكەن، ئەوە ئافرەتێكی داوێن پيسە و، هەموو چاوێكيش زيناكارە[1].**

(المشكاة ١٠٦٥)

٥٤٧١- طيب الرجال ما ظهر ريحه و خفي لونه و طيب النساء ما ظهر لونه و خفي ريحه .

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة ( طب الضياء ) عن أنس.

**٥٤٧١- گوڵاوی پياوان ئەوەيە بۆنی هەبێت و ڕەنگی كپ بێت، گوڵاوی ژنانيش ئەوەيە ڕەنگی هەبێت و بۆنی كپ و مات بێت.**

(المشكاة ٤٤٤٣)

٥٤٧٢- كل عين زانية و المرأة إذا استعطرت فمرت بالمجلس فهي زانية.

(صحيح) ( حم ت ) عن أبي موسى.

**٥٤٧٢- هەموو چاوێك زيناكارە، ئافرەتيش خۆی بۆن خۆش بكات و بەلای كۆڕێكدا تێپەڕبێت زيناكارە.**

(المشكاة ١٠٦٥)

٥٤٧٣- كان له سكة يتطيب منها.

(صحيح) ( د ) عن أنس.

**٥٤٧٣- پێغەمبەر (ﷺ) جۆرە گوڵاوێكی هەبوو سوككەی پێ دەوترا خۆی پێ بۆنخۆش دەكرد.**

(المشكاة ٤٤٤٤)

---

[1] **واتە: هەموو چاوێك سەيری قەدەغەكراو بكات لە ژن و پياو پشكی خۆی (زينا) ی كردووە.**

٥٤٧٤- كان لا يرد الطيب.

(صحيح) ( حم خ ت ن ) عن أنس.

**٥٤٧٤- پێغەمبەر ( ﷺ ) گوڵاوی بەسەر بەخشدا نەدەدایەوە.**

(المشكاة ٣٠١٧)

٥٤٧٥- كان يعجبه الريح الطيبة.

(صحيح) ( د ك ) عن عائشة.

**٥٤٧٥- پێغەمبەر ( ﷺ ) حەزی لە بۆنی خۆش دەكرد.**

(الصحيحة ٢١٣٦)

٥٤٧٦- من خير طيبكم المسك.

(صحيح) ( ن ) عن أبي سعيد.

**٥٤٧٦- میسك لە چاكترین گوڵاوەكانتانە.**

(الصحيح النسائى ١٩٠٦)

٥٤٧٧- من عرض عليه ريحان فلا يرده فإنه خفيف المحمل طيب الريح.

(صحيح) ( م د ) عن أبي هريرة.

**٥٤٧٧- هەركەسێك رێحانەی پێ بدرێت با نەیگێرێتەوە، چونكە سووكە بۆ هەڵگرتن و بۆنیشی خۆشە.**

(المشكاة ٣٠١٦)

٥٤٧٨- من عرض عليه طيب فلا يرده فإنه خفيف المحمل طيب الرائحة.

(صحيح) ( حم ن ) عن أبي هريرة.

**٥٤٧٨- هەر كەسێك گوڵاوی پیدرا با رەتینەكاتەوە، چونكە هەڵگرتنی سووكە و بۆنیشی خۆشە.**

(المشكاة ٣١١٦)

٥٤٧٩- المسك أطيب الطيب.

(صحيح) ( م ت ) عن أبي سعيد.

**٥٤٧٩- میسك چاكترین گوڵاوە.**

(صحيح الترمذى ٩٩١)

٥٤٨٠- إن الملائكة لا تحضر الجنب و لا المضمخ بالخلوق حتى يغتسلا.

(حسن) ( طب ) عن ابن عباس .

**٥٤٨٠- فریشتەكان ناچنە لای كەسێك لەشی گران بێت، یان خۆی لەگولاوگرتبێت، تاكو خۆیان نەشۆن.**

(الصحيحة ١٨٠٤)

**٥٤٨١-** نهى أن يتزعفر الرجل.

(صحيح) ( ق ٣ ) عن أنس.

**٥٤٨١- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی كردووە لەسەر پیاو زاڤەران لە خۆیی و پۆشاكی بدات.**

(المشكاة ٤٤٣٤)

**٥٤٨٢-** الكحل وتر.

(صحيح) ( تمام ) عن أنس.

**٥٤٨٢- (( سورمە )) كل بە تاك بەكاربهێنرێت.**

(الصحيحة ١٢٦٠)

## بابەتی سوننەتەكانی فیترەت

**٥٤٨٣-** إن من الفطرة: المضمضة و الاستنشاق و السواك و قص الشوارب و تقليم الأظفار و نتف الإبط و الاستحداد و غسل البراجم و الانتضاح بالماء و الاختتان.

(حسن) ( حم ش د ه ) عن عمار بن ياسر .

**٥٤٨٣- لە (( فیترەتە )) سروشتە ئاو لە دەم و لووت ڕادان و، سواك كردن و، بەرسمێڵ كردن و، نینۆك كردن، هەڵكێشانی تووكی بن باڵ، تاشینی بەر و، شتنی چرچ و لۆچی لەش و، خۆ پاككردنەوە بە ئاو، خەتەنە كردن.**

(الصحيح ابی داود ٤٤)

**٥٤٨٤-** خمس من الفطرة: الختان و الاستحداد و قص الشارب و تقليم الأظفار و نتف الإبط.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة .

**٥٤٨٤- پێنج شت هەیە لە (( فیترەتن )) سروشتن، خەتەنە كردن وە بەر تاشین و، بەر سمێڵ كردن و، نینۆك كردن، و هەڵكێشانی تووكی بن باڵ.**

(الارواء ٧٢)

٥٤٨٥- عشر من الفطرة: قص الشارب و إعفاء اللحية و السواك و استنشاق الماء و قص الأظفار و غسل البراجم و نتف الإبط و حلق العانة و انتقاص الماء .

**٥٤٨٥- دەشت لە (( فيترەتە )) سروشتە : بەر سمێڵ كردن و، هێشتنەوەی ریش و، سیواك كردن و، ئاو لەلوت ڕادان و، نینۆك كردن و، ، شۆردنی چرچ و لۆچی لەش، هەڵكەندنی تووكی بن باڵ و، بەرتاشین وە خۆپاككردنەوە بە ئاو.**

(الصحيح ابي داود ٤٣)

٥٤٨٦- الفطرة قص الأظفار و أخذ الشارب و حلق العانة.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عمر.

**٥٤٨٦- (( فيترەت )) سروشت نینۆك كردن و بەر سمێڵ كردن بەر تاشین.**

(الصحيح ابن داود ٤٣)

٥٤٨٧- من الفطرة حلق العانة و تقليم الأظفار و قص الشارب.

(صحيح) ( خ ) عن ابن عمر.

**٥٤٨٧-لە سروشت و فيترەتە بەرتاشین و نینۆك كردن و بەر سمێڵ كرد.**

٥٤٨٨- اختتن إبراهيم و هو ابن ثمانين سنة بالقدوم.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة .

**٥٤٨٨- ئیبراهیم لە هەشتا ساڵاندا خەتەنەی كرد لە ناوچەی قەدوم.**

(الصحيحة ٧٢٥)

٥٤٨٩- اخفضي و لا تنهكي فإنه أنضر للوجه و أحظى عند الزوج.

(حسن) ( طب ك ) عن الضحاك بن قيس .

**٥٤٨٩- خەتەنە بكە و كەمی ببڕە[1]، چونكە بۆ جوانی ڕوومەت چاكترە لەلای هاوسەر پەسەند ترە.**

(الصحيحة ٧٢١)

٥٤٩٠- إذا ختنت فلا تنهكي فإن ذلك أحظى للمرأة و أحب إلى البعل.

(حسن) (هق) عن أم عطية .

---

[1] **ئەوەی بە (أم عطية ) ی فەرموو كە كچانی خەتەنە دەكرد.**

**٥٤٩٠- ئەگەر خەتەنەت كرد زۆرى مەبڕە، چونكە ئەوە چاكترە بۆ ئافرەت و، خۆشترە بەلاى مێردەوە.**

(الصحيحة ٧٢١)

**٥٤٩١**- إذا خفضت فأشمي و لا تنهكي فإنه أحسن للوجه و أرضى للزوج .

(حسن) (خط) عن علي .

**٥٤٩١- ئەگەر خەتەنەت كرد كەمێكى ببڕە، چونكە ئەوە چاكترە بۆ جوانى ڕوومەت و، پەسەندترە بەلاى مێردەوە.**

(الصحيحة ٧٢١)

**٥٤٩٢**- إذا خفضت فأشمي و لا تنهكي فإنه أسرى للوجه و أحظى عند الزوج.

(حسن) (طس) عن أنس .

**٥٤٩٢- كە خەتەنەت كرد كەمێكى لێ ببڕە و هەڵكى مەكە، چونكە بۆ ڕوومەت جوانترە و بەلاى مێرديشەوە خۆشترە.**

(الصحيحة ٧٢١)

**٥٤٩٣**- لا تنهكي فإن ذلك أحظى للمرأة و أحب إلى البعل.

(صحيح) ( د ) عن أم عطية.

**٥٤٩٣- زيادەڕەوى مەكە لەبڕيندا، چونكە ئەوە چاكترە بۆ ئافرەت و، مێرديش ئەوەى پێ خۆشترە.**

(الارواء ٧٢١)

**٥٤٩٤**- ألق عنك شعر الكفر ثم اختتن.

(حسن) ( حم د ) عن عثيم بن كليب .

**٥٤٩٤- مووى بێباوەڕى بتاشە و خەتەنە بكە**[1].

---

[1] ئەو كەسەى موسڵمان بويت هاتيتە لامان.

## بابەتی وێنەکان

٥٤٩٥- إن الذين يصنعون هذه الصور يعذبون يوم القيامة فيقال لهم: أحيوا ما خلقتم.

(صحيح) ( ق ن ) عن ابن عمر .

**٥٤٩٥- لە ڕاستیدا ئەوانەی وێنە دروست دەکەن[1]، لە ڕۆژی قیامەتدا ئەشکە نجە دەدرێن و، پێیان دەوترێت: ئەوانەی دروستان کردووە زیندووی بکەنەوە.**

٥٤٩٦- أتاني جبريل فقال: إني كنت أتيتك البارحة فلم يمنعني أن أكون دخلت عليك البيت الذي كنت فيه إلا أنه كان على الباب تماثيل و كان في البيت قرام ستر فيه تماثيل و كان في البيت كلب فمر برأس التمثال الذي في البيت فليقطع فيصير كهيئة الشجرة و مر بالستر فليقطع فيجعل وسادتين منبذتين توطئان و مر بالكلب فليخرج.

(صحيح) ( حم د ت هق ) عن أبي هريرة .

**٥٤٩٦- جیبریل هاتە لام و ووتی: من دوێنێ ھاتمە سەردانت، ھیچیش ڕێگرنەبوو لەوەی بێمە لات لەو ماڵەی کەتیایدا بووی، ئەوە نەبێت کە پەیکەرێك لەبەر دەرگاکە بوو، لە ماڵەکەیشدا پەردەیەك ھەبوو وێنەی لەسەر بوو، ھەروەھا ماڵەکە سەگێکی تیا بوو، بۆیە فەرمان بکە با سەری ئەو پەیکەرە ببڕێت، تاکو وەکو درەختی لێ بێت، فەرمانیش بکە پەردەکە ببڕدرێت و بکرێنە دوو ڕاخەری فڕەدراو پێی بخرێنە سەر، فەرمانیش بکە سەگەکە دەربکرێت.**

(الصحيحة ٣٥٦)

٥٤٩٧- أشد الناس عذابا عند الله يوم القيامة: الذين يضاهون بخلق الله.

(صحيح) (حم ق ن ) عن عائشة .

**٥٤٩٧- سەختترین سزا لەلای خودا لە ڕۆژی قیامەت بۆ کەسانێکە بە وێنەکانیان کارەکانی خۆیان بەراورد بکەن لەگەڵ کاری خوای گەورە.**

(غاية المرام ١٢١)

٥٤٩٨- أشد الناس عذابا يوم القيامة: المصورون يقال لهم: أحيوا ما خلقتم.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عمر .

---

[1] **وێنەی گیاندار**

**٥٤٩٨- سەختترین سزا لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر وێنەکێشەکان، پێیان دەوترێت: ئەوەی دروستان کرد زیندووی بکەنەوە.**

(غاية المرام ١٢١)

**٥٤٩٩-** أشد الناس عذابا يوم القيامة رجل قتل نبيا أو قتله نبي أو رجل يضل الناس بغير علم أو مصور يصور التماثيل.

(حسن) ( حم ) عن ابن مسعود .

**٥٤٩٩- سەختترین سزا و ئەشکە نجە لەڕۆژی قیامەتدا بۆ پیاوێکە پێغەمبەرێکی کوشتبێت یان پێغەمبەرێك ئەوی کوشتبێت، یان بۆ پیاوێکە خەڵکی بەرەو نەفامی گومڕا کردبێت، یان وێنەکێشێك پەیکەر دروست بکات.**

(الصحيحة ٢٨١)

**٥٥٠٠-** أما علمت أن الملائكة لا تدخل بيتا فيه صورة و أن من صنع الصور يعذب يوم القيامة فيقال: أحيوا ما خلقتم ؟.

(صحيح) ( خ ) عن عائشة .

**٥٥٠٠- ئایا نەتزانیوە فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە وێنەی تیا بێت، وە ئەو کەسەی وێنە بکێشێت ئەشکە نجە دەدرێت لە ڕۆژی قیامەتدا و، ئینجا دەوترێت: ئەوەی دروستان کرد زیندووی بکەنەوە؟**

(الصحيحة ١٥٤٨)

**٥٥٠١-** إن أشد الناس عذابا يوم القيامة: المصورون.

(صحيح) (حم م ) عن ابن مسعود .

**٥٥٠١- وێنە کێشان سەختترین سزایان لەسەرە لەڕۆژی قیامەتدا**[1].

(الصحيحة ٣٦٤)

**٥٥٠٢-** إن أصحاب هذه الصور يعذبون يوم القيامة فيقال لهم: أحيوا ما خلقتم.

(صحيح) ( مالك حم ق ن ه ) عن عائشة (صحيح) ( ق ن ) عن ابن عمر .

---

[1] قەدەغە کردن ئەو وێنانەش دەگرێتەوە کە ڕادەخرێت و بایەخی پێ نادرێت ، وەکو پەردە و سەرین و قاپ و .... ، هەرکەسیش وا تێ گەیشتووە کە ئەو وێنانە ناگرێتەوە بێ بایەخ و فرێدراون بە هەڵە گەیشتووە لە مەسەلەکە.

**٥٥٠٢- خاوەنی ئەم وێنانـە لـەڕۆژی قیامەتـدا سـزا دەدرێـن و پێیـان دەوترێـت: ئـەوەی دروستـان کردووە زیندوویـان بکەنەوە.**

(غاية المرام ١٢٢)

٥٥٠٣- إن البيت الذي فيه الصور لا تدخله الملائكة.

(صحيح) ( مالك ق ) عن عائشة .

**٥٥٠٣- ئەو ماڵەی وێنەی تیادا بێت فریشتە ناچێتە ناوی یەوە.**

(غاية المرام ١٢٢)

٥٥٠٤- إن الله تعالى لم يأمرنا فيما رزقنا أن نكسو الحجارة و اللبن و الطين.

(صحيح) ( م د ) عن عائشة .

**٥٥٠٤- خوای گەورە فەرمانی پێ نەکردووین لەو ڕۆزییەی پێی بەخشیوین، بەردو خشت و قوڕ دا پۆشین[1].**

(غاية المرام ١٣٦)

٥٥٠٥- إن من أشد الناس عذابا يوم القيامة الذين يشبهون بخلق الله.

(صحيح) ( م ن ه ) عن عائشة .

**٥٥٠٥- سەخترین سزا لە ڕۆژی قیامەتـدا لەسـەر ئەوانـەی کـە کارەکانیـان دەچـوێنن بـە کارەکانی خوای گەورە.**

(صحيح النسائي ٥٣٥٧)

٥٥٠٦- إن الله يعذب المصورين بما صوروا.

(صحيح) ( الشيرازي خط ) عن ابن عباس .

**٥٥٠٦- خوای گەورە سزای وێنەکێشان دەدات لەسەر وێنەکانیان.**

(غاية المرام ١٥٦)

٥٥٠٧- إن الملائكة لا تدخل بيتا فيه تماثيل أو صورة.

(صحيح) ( حم ت حب ) عن أبي سعيد .

**٥٥٠٧- فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە پەیکەر یان وێنەی تێدابێت.**

(غاية المرام ١٩١)

---

[1] ئەمەی فەرموو: عائیشە ڕەزای خوای لێ بێت کاتێك بینی پەردەیەکی دابو بەسەر دەرگاکدا ، ئەویش دڕاندی ، ئەو کارەش ئەوە دەگەیەنێت ئەو جۆرە خەرجییانە بە زیادەڕەوی دادەنرێت.

٥٥٠٨- إن أولئك إذا كان فيهم الرجل الصالح فمات بنوا على قبره مسجدا و صوروا فيه تلك الصورة أولئك شرار الخلق عند الله يوم القيامة.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن عائشة .

**٥٥٠٨- ئەوانەی ئەگەر پیاو چاكێكیان تیا بمردایە (( سوژدەگایەك )) مزگەوتێكیان لەسەر گۆڕەكەی دروست دەكرد و، ئەو وێنەیان تیا دروست دەكرد، ئەوانە خراپترین خەڵكن لەلای خوا لەڕۆژی قیامەتدا.**

(احكام الجنائز)

٥٥٠٩- إنه ليس لنبي أن يدخل بيتا مزوقا.

(صحيح) ( د ) عن علي ( حم ه حب ك ) عن سفينة .

**٥٥٠٩- دروست نییە بۆ هیچ پێغەمبەرێك بچێتە ماڵێكەوە نەخشكاری تیا كرابێت.**

(المشكاة ٣٢٢١)

٥٥١٠- الصورة الرأس فإذا قطع الرأس فلا صورة .

(صحيح) ( الإسماعيلي في معجمه ) عن ابن عباس.

**٥٥١٠- وێنە سەرە، جا ئەگەر سەری وێنەكە بڕدرا وێنە نامێنی[1].**

(الصحيحة ١٩٢١)

٥٥١١- قاتل الله قوما يصورون ما لا يخلقون.

(صحيح) ( الطيالسي الضياء ) عن أسامة.

**٥٥١١- نەفرینی خوا لە كەسانێك وێنەی شتانێك دەكێشن كە دروستی ناكەن.**

(الصحيحة ٩٩٦)

٥٥١٢- قال الله تعالى: و من أظلم ممن ذهب يخلق خلقا كخلقي فليخلقوا حبة أو ليخلقوا ذرة أو ليخلقوا شعيرة.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة.

**٥٥١٢- خوای گەورە دەفەرموێت: كێ لەو كەسە ستەمكارترە بڕوات دروستكراوێك دروست بكات وەكو دروستكراوی من، ئەگەر دەتوانێت با تۆیەك یان گەردێك یان موویەك دروست بكەن.**

(غاية المرام)

---

**[1] مەناوی دەڵێت : وێنە كێشانی ئاژەڵ قەدەغەیە ، بەڵام ئەگەر سەری نەبوو قەدەغە نیە ، چونكە بە بێ سەر وێنەی پێ ناوترێت.**

٥٥١٣- قال لي جبريل: إنا لا ندخل بيتا فيه كلب و لا تصاوير.

(صحيح) ( خ ) عن ابن عمر( م ) عن عائشة ( م د ) عن ميمونة ( حم ) عن أسامة بن زيد وبريدة.

**٥٥١٣- جيبريل پێى ووتم: ئێمە ناچينە ماڵێكەوە سەگ و وێنەى تيادا بێت.**

(الترغيب ٣١٠٦)

٥٥١٤- كل مصور في النار يجعل له بكل صورة صورها نفس فتعذبه في جهنم.

(صحيح) ( حم م ) عن ابن عباس.

**٥٥١٤- هەموو وێنە كێشێك لە ئاگردايە بەهەموو وێنەيەك دروستى كردووە گيانێك دروست دەكرێت و سزاى دەدات لە دۆزەخدا.**

(غاية المرام ١٦٥)

٥٥١٥- ليس لي أن أدخل بيتا مزوقا.

(صحيح) ( حم طب ) عن سفينة.

**٥٥١٥- بۆم نييە بچمە ماڵێكەوە ڕازاوە پڕ لەنەخش و نيگار بێت.**

(المشكاة ٣٢٢١)

٥٥١٦- ما أنا و الدنيا و ما أنا و الرقم.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عمر.

**٥٥١٦- من لەكوێ و دونيا لەكوێ، من لەكوێ و نەخش و نيگار لەكوێ[1].**

(الصحيحة ٢٤١٢)

٥٥١٧- من أشد الناس عذابا يوم القيامة الذين يصورون هذه الصور.

(صحيح) ( خ ) عن عائشة.

**٥٥١٧- سەختترين سزا لەڕۆژى قيامەت بۆ ئەو كەسانەيە ئەو وێنانە دەكێشن.**

(الترغيب ٣٠٥٣)

٥٥١٨- من صور صورة عذبه الله بها يوم القيامة حتى ينفخ فيها و ليس بنافخ و من تحلم كلف أن يعقد شعيرتين و ليس بعاقد و من استمع إلى حديث قوم يفرون منه صب في أذنيه الآنك يوم القيامة.

(صحيح) ( حم د ت ) عن ابن عباس.

---

[1] **بە فاتيمەى فەرموو: كاتێك بينى پەردەيەكى جوان و ڕازێنراو بە دەرگاكەوەيە.**

**٥٥١٨- هەركەسێك وێنەیەك بكێشێت، خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا سزای دەدات تاكو گیانی بە بەردا بكات و نایشتوانی ، هەركەسێكیش بەدرۆ خەون دروست بكات ناچار دەكرێت كە دەبێ دوو دەنكە جۆ گرێ بدات بەیەكەوە و هەرگیز بۆشی گری نادرێت ، هەركەسیش گوێ بۆ قسەی كەسانێك بكرێت كە ئەوان لە دەستی ڕابكەن لە ڕۆژی قیامەتدا قورقوشم دەكرێتە هەردوو گوێچكەی .**

(غاية المرام ١٢١)

٥٥١٩- من صور صورة في الدنيا كلف أن ينفخ فيها الروح يوم القيامة و ليس بنافخ.

(صحيح) ( حم ق ت ) عن ابن عباس.

**٥٥١٩-هەر كەس لە دونیادا گیانلەبەرێك بكێشێت لە ڕۆژی قیامەتداداوای لێ دەكرێت گیان بكات بەبەریدا هەرگیز ناتوانێ.**

٥٥٢٠- نهى أن تستر الجدر.

(صحيح) ( هق ) عن علي بن الحسين مرسلا.

**٥٥٢٠- پێغەمبەر دیوار دا پۆشینیماڵەكانی قەدەغە دەكرد.**

(الصحيحة ٢٣٨٤)

٥٥٢١- نهى عن الصورة.

(صحيح) ( ت ) عن جابر.

**٥٥٢١- پێغەمبەر (ﷺ) وێنەی قەدەغە دەكرد.**

(الصحيحة ٤٢٤)

٥٥٢٢- لا تدخل الملائكة بيتا فيه تماثيل أو تصاوير.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة.

**٥٥٢٢- فریشتەكان ناچنە ماڵێكەوە پەیكەر و وێنەی تیابێت.**

(غاية المرام ١١٨)

٥٥٢٣- لا تدخل الملائكة بيتا فيه صورة إلا رقم في ثوب.

(صحيح) ( حم ق د ن ) عن أبي طلحة.

**٥٥٢٣- فريشتەكان ناچنە ماڵێكەوە وێنەی تیا بێت، مەگەر نەخشێك لە پۆشاكێكدا بێت[1].**

(غاية المرام ١١٩)

٥٥٢٤- لا تدخل الملائكة بيتا فيه كلب و لا صورة.

(صحيح) ( حم ق ت ن ه ) عن أبي طلحة.

**٥٥٢٤- فريشتەكان ناچنە ماڵێكەوە سەگ و وێنەی تیادا بێت.**

(غاية المرام ١١٩)

٥٥٢٥- يا عائشة ! حولي هذا فإني كلما دخلت فرأيته ذكرت الدنيا.

(صحيح) ( حم ن ) عن عائشة.

**٥٥٢٥- ئەی عائیشە! ئەوە بگوێزەرەوە، چونكە من هەموو كاتێك دێمە ژوورەوە و دەیبینم دونیام دێتەوە یاد.**

(المشكاة ٥٢٢٥)

٥٥٢٦- و ما أنا و الدنيا و ما أنا و الرقم

(صحيح) ( د ) عن ابن عمر.

**٥٥٢٦- من لەكوێ و دونیا لەكوێ، من لە كوێ و نەخش و نیگار لەكوێ.**

(الصحيحة ٢٤١٢)

٥٥٢٧- لا تدع تمثالا إلا طمسته و لا قبرا مشرفا إلا سويته.

(صحيح) ( م ن ) عن علي.

**٥٥٢٧- هەر چی پەیكەر هەیە لەناوی بدە، هەرچی گۆڕی بەرزكراوەیش هەیە لەگەڵ زەوی تەختی بكەرەوە.**

(الجنائز ٢٠٧)

---

[1] هەندێك لە زانایان بە وێنەی بچوك لێكیانداوەتەوە لەسەر پۆشاك بێت ، هەندێكیشیان بە وێنەی ڕەوا لێكیان داوەتەوە وەكو دارو درەخت و بەردو ...



## بابەتی سەلام

٥٥٢٨- إذا مر رجال بقوم فسلم رجل من الذين مروا على الجلوس و رد من هؤلاء واحد أجزأ عن هؤلاء و عن هؤلاء.

(صحيح) ( حل ) عن أبي سعيد .

**٥٥٢٨- ئەگەر چەند پیاوێك بەلای کەسانێکدا تێپەڕین، کەسێك لەوانەی تێدەپەڕن سڵاو بکات لەوانەی دانیشتوون و یەکێکیش لەوان وەڵام بداتەوە بەسە لە جیاتی ئەوان و ئەوانی تر.**

(الصحيحة ١٤١٢)

٥٥٢٩- تسليم الرجل بإصبع واحدة يشير بها فعل اليهود.

(صحيح) ( ع طس هب ) عن جابر .

**٥٥٢٩- سڵاو کردنی پیاو بەیەك پەنجە كە ئاماژەی پێ بکات کردەوەی جولەکەیە[1].**

(الصحيحة ١٧٨٣)

٥٥٣٠- كان يمر بالصبيان فيسلم عليهم.

(صحيح) ( خ ) عن أنس.

**٥٥٣٠- پێغەمبەر (( ﷺ )) بەلای منالآندا تێپەڕ دەبوو سەلامی لێ دەکردن[2].**

(الصحيحة ١٢٧٨)

---

[1] بەیهەقی دەڵێت: قەدەغەکردنی ئەو کارە لەوانەیە مەبەست تەنها ئاماژەکردن بێت بە بێ قسەکردن.

[2] مەناوی دەڵێت : بۆ ئەوەی ڕایان بهێنێ لەسەر ڕەوشتەکانی شەریعەت هەروەها داماڵینی پۆشاکی خۆبەزل زانینە ئەوەش ڕەفتاری خۆ بەکەم زانینەو ، نەرم و نیانیە.

٥٥٣٢١- كان يمر بنساء فيسلم عليهن.

(صحيح) ( حم ) عن جرير.

**٥٥٣١- پێغەمبەر (( ﷺ )) بەلای ئافرەتاندا تێدەپەڕی و سڵاوی لێدەکردن.**

(الصحيحة ٢١٣٩)

٥٥٣٢- ليسلم الراكب على الراجل و ليسلم الراجل على القاعد و ليسلم الأقل على الأكثر فمن أجاب السلام فهو له و من لم يجب فلا شيء له.

(صحيح) ( حم خد ) عن عبدالرحمن بن شبل.

**٥٥٣٢- با سوار سڵاو لە پیادە بکات، و پیادە سڵاو لە دانیشتوو بکات و، کەم سڵاو لەزۆر بکات و، هەرکەسیش وەڵام بداتەوە بۆ خۆیەتی و، هەرکەسیش وەڵام نەداتەوە بێ بەش دەبێت لە پاداشت[1].**

(الصحيحة ٢١٩٩)

٥٥٣٣- لا تقل عليك السلام فإن عليك السلام تحية الموتى و لكن قل: السلام عليك.

(صحيح) ( ٣ ك ) عن جابر بن سليم.

**٥٥٣٣- ئەگەر سەلامت کرد مەڵێ ( عليك السلام )، چونکە ئەوە سڵاوی مردوانە، بەڵکو بڵێ ( السلام عليك ).**

(الصحيحة ١٤٠٣)

٥٥٣٤- يجزي عن الجماعة إذا مروا أن يسلم أحدهم و يجزي عن الجلوس أن يرد أحدهم.

(صحيح) ( د ) عن علي.

**٥٥٣٤- کۆمەڵێك کە تێپەڕدەبن بەسە یەکێکیان سڵاو بکات، دانیشتوانیش بەسە یەکێکیان وەڵام بدەنەوە.**

(الصحيحة ١١٤٨)

٥٥٣٥- يسلم الراكب على الماشي و الماشي على القائم و القليل على الكثير.

(صحيح) ( ت ) عن فضالة بن عبيد.

**٥٥٣٥- سوار سڵاو لە پیادە دەکات و، پیادە لە ڕاوەستاو، کەم لە زۆر.**

(الصحيحة ١١٤٥)

---

[1] **لەوانەشە گوناهبار بێت ئەگەر لە خۆڕایی وەڵام نەداتەوە.**

٥٥٣٦- يسلم الراكب على الماشي و الماشي على القاعد و القليل على الكثير.

(صحيح) ( حم ق د ت ) عن أبي هريرة.

**٥٥٣٦- سوار سڵاو دەكات لە پیادە و، پیادەش لە دانیشتو ، كەمیش لە زۆر.**

(الصحيحة ١١٤٥)

٥٥٣٧- يسلم الصغير على الكبير و المار على القاعد و القليل على الكثير.

(صحيح) ( خ د ت ) عن أبي هريرة.

**٥٥٣٧- بچووك سڵاو لە گەورە دەكات و، پیادە لە دانیشتوو، كەم لە زۆر.**

(الصحيحة ١١٤٩)

٥٥٣٨- إذا اصطحب رجلان مسلمان فحال بينهما شجر أو حجر أو مدر فليسلم أحدهما على الآخر و يتباذلوا السلام.

(صحيح) ( هب ) عن أبي الدرداء .

**٥٥٣٨- ئەگەر دوو پیاوی موسڵمان بوون بە هاوڕێ و دار و بەرد و خانو یان تەپۆڵكە گڵ[1] بووە بەربەست لە نێوانیاندا، با سڵاو لەیەكتر بكەنەوە.**

(الصحيحة ٣٩٦٢)

٥٥٣٩- إذا دخلتم بيتا فسلموا على أهله فإذا خرجتم فأودعوا أهله بسلام.

(صحيح) (هب) عن قتادة مرسلا .

**٥٥٣٩- ئەگەر چوونە ماڵێكەوە سڵاو لە دانیشتوانی بكەن، ئەگەر دەریش چوون خوا حافیزی لەخەڵكەكەی بكەن بە سڵاوكردن.**

(المشكاة ٤٦٥١)

٥٥٤٠- إذا لقي أحدكم أخاه فليسلم عليه فإن حالت بينهما شجرة أو حائط أو حجر ثم لقيه فليسلم عليه.

(صحيح) ( د ه هب ) عن أبي هريرة .

**٥٥٤٠- ئەگەر كەسێكتان براكەی بینی با سڵاوی لێ بكات، ئەگەر دار و دیوار و بەردیش كەوتە نێوانیان و، پێی گەیشتەوە با سڵاوی لێ بكات.**

(الصحيحة ١٨٦)

---

[1] **بەواتای خانوو یان گوند یان تەپۆڵكە دەوترێ : (( ما رأيت في الوَبَر و المَدَر مثله )) لەناو رەشماڵ نشین و گوندنشیندا وێنەی ئەوم نەدیووە ، قاموسی رستە، ب١ ، ل٢٤٦٧.**

٥٥٤١- إذا لقي الرجل أخاه المسلم فليقل: السلام عليكم و رحمة الله.

(صحيح) ( ت ) عن رجل من الصحابة .

**٥٥٤١- ئەگەر پیاوێك چاوی كەوت بە برا موسڵمانەكەی با بڵێت:( السلام عليكم ورحمه الله ).**

(الصحيحة ١٤٠٣)

٥٥٤٢- إذا لقيتم المشركين في الطريق فلا تبدءوهم بالسلام و اضطروهم إلى أضيقها.

(صحيح) ( ابن السني ) عن أبي هريرة .

**٥٥٤٢- ئەگەر بتپەرستانتان بینی لەڕێگە و بان دەستپێشخەری لە سلاو لێ كردنیان مەكەن، ناچاریشیان بكەن با تەنگەتاوبن.**

(الصحيحة ١٤١١)

٥٥٤٣- اعبدوا الرحمن و أطعموا الطعام و أفشوا السلام تدخلوا الجنة بسلام.

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة .

**٥٥٤٣- خوا بپەرستن و، خواردن ببەخشن و، سڵاو بڵاو بكەنەوە، بەئاسوودەیی دچنە بەهەشت.**

(الصحيحة ٥٧٩)

٥٥٤٤- أفش السلام و أطعم الطعام و صل الأرحام و قم بالليل و الناس نيام و ادخل الجنة بسلام.

(صحيح) ( حم حب ك ) عن أبي هريرة .

**٥٥٤٤- سڵاو بڵاوبكەرەوە[١]، خواردن ببەخشە و، پەیوەندی خزمایەتی ببەستە و، هەستە بۆ شەونوێژ لەكاتێكدا خەڵكی خەوتوون، دەچیتە بەهەشتەوە بە ئاسوودەیی.**

(الصحيحة ٢٦٩)

٥٥٤٥- أفشوا السلام بينكم تحابوا.

(صحيح) ( ك ) عن أبي موسى .

**٥٥٤٥- سڵاو لەنێوان خۆتاندا بڵاوبكەنەوە، یەكترتان خۆش دەوێت[٢].**

(الترغيب ٢٦٩٤)

٥٥٤٦- أفشوا السلام تسلموا.

(صحيح) ( خد ع حب العقيلي ) عن البراء .

---

[١] **بۆ هەموو موسڵمانان بیاناسی یان نەیاناسی.**

[٢] **مەناوی دەڵێت: بەرژەوەندییەكی گەورەی تێدایە لە كۆبونەوەی دڵەكان و پشتگیری كردنی موسوڵمانە لە یەكتر.**

**٥٥٤٦- سڵاو بڵاوبكەنەوە سەلامەت دەبن[1].**

(الصحيحة ١٤٩٣)

٥٥٤٧- أفشوا السلام كي تعلوا.

(صحيح) ( طب ) عن أبي الدرداء .

**٥٥٤٧- سڵاو بڵاوە پێ بكەن با بەرزبنەوە[2].**

(الترغيب ٢٧٠١)

٥٥٤٨- أفشوا السلام و أطعموا الطعام و كونوا إخوانا كما أمركم الله.

(صحيح) ( ه ) عن ابن عمر .

**٥٥٤٨- سڵاو بڵاوبكەنەوە و، خواردن ببەخشن و، ببنە برا وەكو خواى گەورە فەرمانی پێكردوون.**

(الصحيحة ١٥٠١)

٥٥٤٩- أفش السلام و ابذل الطعام و استحي من الله تعالى كما تستحيي رجلا من رهطك ذا هيئة و ليحسن خلقك و إذا أسأت فأحسن فإن الحسنات يذهبن السيئات.

(صحيح) ( طب ) عن أبي أمامة .

**٥٥٤٩- سڵاو بڵاوبكەرەوە و، خواردن بدە و، شەرمیش لە خوا بكە وەكو چۆن لە پیاوێكی كۆمەڵەكەی خۆت شەرم دەكەیت، با ڕەوشتیشت جوان بێت و، ئەگەر خراپەت كرد چاكەی بەدوادا بكە، چونكە چاكە خراپە لادەبات.**

(الصحيحة ٣٥٥٩)

٥٥٥٠- إن اليهود إذا سلم عليكم أحدهم فإنما يقول: السام عليكم فقولوا: و عليكم.

(صحيح) ( د ت ) عن ابن عمر .

**٥٥٥٠- جولەكەكان ئەگەر كەسێكیان سڵاوتان لێ بكەن پێتان دەڵێن: خوا بتانكوژێت، جائێوەش بڵێن: ئێوەیش.**

(الارواء ١٢٧١)

٥٥٥١- إن أولى الناس بالله من بدأهم بالسلام.

(صحيح) ( د ) عن أبي أمامة .

---

[1] لە یەك دابڕان و قسە پێكەوە نەكردن خۆشەویستی بەردەوام دەبێت.

[2] مەناوی دەڵێت : چونكە ئەگەر وا بكەن یەكتریان خۆش دەوێت و ، یەكێتی تان تیا دروست دەبێت.

**٥٥٥١- له پێشترینی کەسانێك له لای خوای گەورە ئەوانەن کە لە پێشدا سلاوتان لێ دەکەن.**

(المشكاة ٤٦٤٦)

٥٥٥٢- إن موجبات المغفرة بذل السلام و حسن الكلام.

(صحيح) ( طب ) عن هانئ بن يزيد .

**٥٥٥٢- یەکێك لە هۆکارەکانی لێخۆشبوون: سڵاو کردن و قسەی جوانە.**

(الصحيحة ١٠٣٥)

٥٥٥٣- حق المسلم على المسلم ست: إذا لقيته فسلم عليه و إذا دعاك فأجبه و إذا استنصحك فانصح له و إذا عطس فحمد الله فشمته و إذا مرض فعده و إذا مات فاتبعه.

(صحيح) ( خد م ) عن أبي هريرة .

**٥٥٥٣- مافی موسڵمان لەسەر موسڵمان شەشە: ئەگەر پێ گەیشتی سڵاوی لێ بکە، ئەگەر بانگێشتی کردی وەڵامی بدەرەوە، ئەگەر داوای ئامۆژگاری لێ کردی ئامۆژگاری بکە، ئەگەر پژمی و سوپاسی خوای کرد پێی بڵێ: خوا بەزەیی پێتا بێتەوە، ئەگەریش نەخۆشیش کەوت سەردانی بکە و، ئەگەر مرد دوای تەرمەکەی بکەوە.**

(الصحيحة ١٨٣٢)

٥٥٥٤- خمس من حق المسلم على المسلم: رد التحية و إجابة الدعوة و شهود الجنازة و عيادة المريض و تشميت العاطس إذا حمد الله.

(صحيح) ( ه ) عن أبي هريرة .

**٥٥٥٤- پێنج شت هەیە مافی موسڵمان بەسەر موسڵمانە وە: وەڵام دانەوەی سەلام و، بەدەم چوونەوەی داواکاریەکەی[1] و، ئامادەبوونی ئەسپەردەکردنی تەرمەکەی و، سەردانی نەخۆش و، ئەگەر لەلاتدا بپژمێت و بڵێت( الحمد لله ) پێی ووتی:( یرحمك الله ).**

(الصحيحة ١٨٣٢)

٥٥٥٥- السلام اسم من أسماء الله وضعه الله في الأرض فأفشوه بينكم فإن الرجل المسلم إذا مر بقوم فسلم عليهم فردوا عليه كان له عليهم فضل درجة بتذكيره إياهم السلام فإن لم يردوا عليه رد عليه من هو خير منهم و أطيب.

(صحيح) ( البزار هب ) عن ابن مسعود.

---

**[1] بۆ ئاهەنگی ژن گواستنەوە بۆ سەر سفرە خوانەکەی بەمەرجێ بێ شەرعی تێدا نەبێت ئەگەر ناشەرعی تێدا بوو نابێ بچیت.**

**٥٥٥٥- سەلام ناوێکە لەناوەکانی خوای گەورە لەسەر زەویدا دایناوە، ئێوەش بڵاوی بکەنەوە لەنێوان خۆتاندا، چونکە پیاوی موسڵمان کاتێك بەلای کەسانێکدا تێپەڕدەبێت و سڵاوی لێ کردن و، وەڵامی دایەوە پلەیەکی چاکەی بەسەرەیانەوە هەیە بەوەی سڵاوی یادخستنەوە، خۆ ئەگەر وەڵامیشی نەدەنەوە، کەسێکی لەوان چاکتر وەڵامی دەداتەوە[1].**

(الصحيحة ١٨٩٤)

٥٥٥٦- السلام قبل السؤال فمن بدأكم بالسؤال قبل السلام فلا تجيبوه.

(صحيح) ( ابن النجار ) عن ابن عمر.

**٥٥٥٦- سڵاو کردن پێش پرسیار کردن، ئەگەر کەسێکیش پرسیاری لێکردن پێش سڵاو کردن وەڵامی مەوەنەوە.**

(الصحيحة ٨١٦)

٥٥٥٧- للمؤمن على المؤمن ست خصال: يعوده إذا مرض و يشهده إذا مات و يجيبه إذا دعاه و يسلم عليه إذا لقيه و يشمته إذا عطس و ينصح له إذا غاب أو شهد.

(صحيح) ( ت ن ) عن أبي هريرة.

**٥٥٥٧- بڕوادار شەش خەسڵەتی هەیە بەسەر بڕوادار: سەردانی دەکات کە نەخۆش کەوت و، ئامادەی تەرمەکەی دەبێت کاتێك بمرێت و، دچێت بەدەم بانگێشتیەوە و، کە چاوی پێ کەوت سڵاوی لێ دەکات و ، داوای دروودو میهرەبانی بۆ دەکات کە بپژمێت و، ئامۆژگاری بۆ دەکات کاتێك ئامادە نەبێت یان ئامادە بێت.**

(المشكاة ٤٦٣٠)

٥٥٥٨- ما حسدتكم اليهود على شيء ما حسدتكم على السلام و التأمين.

(صحيح) ( حم ه ) عن عائشة.

**٥٥٥٨- جولەکە بەهیچ شتێك ئێرەیی پێ نەبردوون ئەوەندەی بە سەلام و ئامین کردنتان.**

(الترغيب ٥١٥)

٥٥٥٩- ليس منا من تشبه بغيرنا لا تشبهوا باليهود و لا بالنصارى فإن تسليم اليهود الإشارة بالأصابع و تسليم النصارى الإشارة بالأكف.

(صحيح) ( ت ) عن ابن عمرو.

---

[1] **فریشتە بەرێزەکان.**

**٥٥٥٩- له ئێمه نییه كەسێك خۆی وەك كەسانی نەیاری ئێمه لێ بكات، خۆتان مەچوێنن به جولەكه و گاورەكان، چونكه سڵاو كردنی جولەكەكان ئاماژەیه بـه پەنجه و، سڵاو كردنی گاورەكان ئاماژە كردنه به دەست[1].**

(الصحيحة ٢١٩٤)

٥٥٦٠- من بدأ بالسلام فهو أولى بالله و رسوله.

(صحيح) ( حم ) عن أبي أمامة.

**٥٥٦٠- هەركەسێك يەكەم جار سەلام بكات ئەو له پێشترە به خوا و پێغەمبەرەكەی.**

(المشكاة ٤٦٤٦)

٥٥٦١- من بدأ بالكلام قبل السلام فلا تجيبوه.

(صحيح) ( طس حل ) عن ابن عمر.

**٥٥٦١- هەركەسێك قسه بكات پێش سڵاوكردن وەڵامی مەدەنەوە.**

(الصحيحة ٨١٦)

٥٥٦٢- و الذي نفسي بيده لا تدخلون الجنة حتى تؤمنوا و لا تؤمنوا حتى تحابوا أولا أدلكم على شيء إذا فعلتموه تحاببتم ؟ أفشوا السلام بينكم.

(صحيح) ( حم م د ت ه ) عن أبي هريرة.

**٥٥٦٢- سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەسته، ناچنه بەهەشتەوه تاكو باوەڕ نەهێنن، باوەڕیش ناهێنن تاكو يەكترتان خۆش نەوێت، ئایا شتێكتان پێ پیشان بدەم ئەگەر بیكەن يەكترتان خۆش بوێت؟ سڵاو لەنێوان خۆتاندا بڵاوبكەنەوە.**

(الارواء ٧٦٩)

٥٥٦٣- لا تأذنوا لمن لم يبدأ بالسلام.

(صحيح) ( هب الضياء ) عن جابر.

**٥٥٦٣- مۆڵەت مەدەن به كەسێك سەرەتا سڵاو نەكات[2].**

(الصحيحة ٨١٧)

٥٥٦٤- لا تبدءوا اليهود و لا النصارى بالسلام و إذا لقيتم أحدهم في طريق فاضطروه إلى أضيقه.

(صحيح) ( حم م د ت ) عن أبي هريرة.

---

[1] **واته : سڵاوكردن تەنها به ئاماژە بەبێ قسەكردن.**

[2] **واته : كەسێك داوای مۆڵەت بكات بۆ هاتنه ژوورەوه يان دانیشتن يان خواردن پێش سەلامكردن.**

**٥٥٦٤- ئێوە یەكەم جار سڵاو مەكەن لە جولەكە و گاور، ئەگەر تووشی كەسێكیشیان بوون لە رێگەیەكدا، ناچاری بكەن بچنە قەراغەوە[1].**

(الصحيحة ٧٠٤)

٥٥٦٥- يا أيها الناس ! أفشوا السلام و أطعموا الطعام و صلوا الأرحام و صلوا بالليل و الناس نيام تدخلوا الجنة بسلام.

(صحيح) ( حم ت ه ك ) عن عبدالله بن سلام.

**٥٥٦٥- خەڵكینە ئاگادار بن! سڵاو بڵاوبكەنەوە و، خواردن ببەخشن و، پەیوەندی خزمایەتی پەیوەست بكەن و، شەونوێژ بكەن كاتێك خەڵكی لە خەودان، دەچنە بەهەشتی پەروەردگارتان بە سەلامەتی.**

(الصحيحة ٢٠٦٩)

٥٥٦٦- إذا سلم عليكم أحدا من أهل الكتاب فقولوا: و عليكم.

(صحيح) ( حم ق ت ه ) عن أنس .

**٥٥٦٦- ئەگەر كەسێك لە ئەهلی كیتاب سڵاوی لێكردن بڵێن:( وعليكم ).**

(الارواء ١٢٧٦)

٥٥٦٧- إذا سلم عليكم اليهود فإنما يقول أحدهم: السام عليك فقل: و عليك.

(صحيح) ( مالك حم ق ) عن ابن عمر .

**٥٥٦٧- ئەگەر جولەكە سڵاویان لێكردن، ئەوان پێتان دەڵێن:مردنتان لەسەر بێت، ئێوەیش بڵێن: لەسەر خۆتان بێت.**

(الارواء ١٢٧١)

٥٥٦٨- إني راكب غدا إلى يهود فمن انطلق منكم معي فلا تبدءوهم بالسلام فإن سلموا عليكم فقولوا: و عليكم

(صحيح) ( حم ه ) عن أبي عبدالرحمن الجهني ( حم ن الضياء ) عن أبي بصرة .

**٥٥٦٨- من سبەی سوار دەبم بەرەو لای جولەكەكان، هەركەسێك لە ئێوە لەگەڵمدا هات با دەستپێشخەری سڵاویان لێ نەكات، ئەگەر سڵاویشیان لێ كردن بڵێن:( وعليكم ).**

(الارواء ١٢٥٨)

---

[1] **مەناوی دەڵێت: فەرموویان لێ مەكەن بۆ ناوەڕاستی رێگەكە وەكو رێككەوتن ، نەك وەكو قورتوبی دەڵێت: ناچاریان بكەین بچنە قەراغ رێگەكە، چونكە ئەوە ئازاردانە بە بێ هۆ ، ئەوەش قەدەغەیە.**

٥٥٦٩- لا تسلموا تسليم اليهود و النصارى فإن تسليمهم إشارة بالكفوف .......

(صحيح) ( هب ) عن جابر .

**٥٥٦٩- وەكو جولەكە و گاورەكان سڵاو مەكەن، چونكە سڵاوی ئەوان تەنها ئاماژەیە بەدەست...**

(الصحيحة ١٧٨٣)

## بابەتی ڕەوشتی كۆڕەكان

٥٥٧٠- إذا جاء أحدكم إلى مجلس فأوسع له فليجلس فإنها كرامة أكرمه الله بها و أخوه المسلم فإن لم يوسع له فلينظر أوسع موضع فليجلس فيه.

(صحيح) ( خط ) عن ابن عمر .

**٥٥٧٠- ئەگەر كەسێكتان هاتە كۆڕێك و جێگە فراوان بكەن با دانیشێت ئەوە ڕێزێكە خوای گەورە و برا موسڵمانەكەی لێیان گرتووە ، ئەگەر جێگەی بۆ نەكرایەوە با ورد بێتەوە لەكوێ جێگە هەیە لەوێ دابنیشێ.**

(الصحيحة ١٣٢١)

٥٥٧١- إذا انتهى أحدكم إلى المجلس فإن وسع له فليجلس و إلا فلينظر إلى أوسع مكان يراه فليجلس فيه.

(صحيح) ( البغوي طب هب ) عن شيبة بن عثمان .

**٥٥٧١- ئەگەر كەسێكتان گەیشتە نێو كۆڕێك، ئەگەر جێگەی بۆ كرایەوە با دابنیشێت، ئەگەر نا با تەماشا بكات لە كوێ جێگە هەیە لەوێ دابنیشێت.**

(الصحيحة ١٣١٢)

٥٥٧٢- إذا انتهى أحدكم إلى المجلس فليسلم فإن بدا له أن يجلس فليجلس ثم إذا قام فليسلم فليست الأولى أحق من الآخرة.

(صحيح) ( حم د ت حب ك ) عن أبي هريرة .

**٥٥٧٢- ئەگەر كەسێكتان گەیشتە كۆڕێك با سڵاو بكات، ئەگەر پێی باش بوو با دابنیشێت، ئینجا ئەگەر هەڵسا با سڵاو بكات، چونكە سڵاوی یەكەم لە دووەم لە باشتر نییە.**

(الصحيحة ١٨٣)

٥٥٧٣- إذا جاء أحدكم فأوسع له أخوه فإنما هي كرامة أكرمه الله بها.

(صحيح) ( تخ هب ) عن مصعب بن شيبة .

**٥٥٧٣- ئەگەر کەسێکتان هات و براکەی ڕێگای بۆی کردەوە ئەوە ڕێزێکە خوای گەورە لێی گرتووە.**

(الصحيحة ١٣٢١)

٥٥٧٤- إذا دخل أحدكم إلى القوم فأوسع له فليجلس فإنما هي كرامة من الله أكرمه بها أخوه المسلم فإن لم يوسع له فلينظر أوسعها مكانا فليجلس فيه.

(صحيح) (الحارث) عن أبي شيبة الخدري .

**٥٥٧٤- ئەگەر کەسێك لەئێوە چووە نێو خەڵکەکەوە جێگەی بۆ کرایەوە با دابنیشێ ئەوە ڕێزێکی خوای گەورە برا موسڵمانەکەی لێی گرتوو، ئەگەریش جێگای بۆ دابین نەکرا، با تەماشا بکات لە کوێ جێگا هەیە تیایدا دابنیشێ.**

(الصحيحة ١٣٢١)

٥٥٧٥- إذا زار أحدكم أخاه فجلس عنده فلا يقومن حتى يستأذنه.

(صحيح) ( فر ) عن ابن عمر .

**٥٥٧٥- ئەگەر کەسێکتان سەردانی براکەی کرد با هەڵنەسێت تاکو مۆڵەتی لێ وەردەگرێ[١].**

(الصحيحة ١٨٢)

٥٥٧٦- إذا قام الرجل من مجلسه ثم رجع إليه فهو أحق به.

(صحيح) ( حم خد م د ه ) عن أبي هريرة ( حم ) عن وهب بن حذيفة .

**٥٥٧٦- ئەگەر کەسێك لە جێگاکەی هەڵسا و جارێکی تر گەڕایەوە، خۆی شایستە ترە لە جێگایە دابنیشێتەوە.**

(الصحيحة ٣٩٧٥)

٥٥٧٧- إنما المجالس بالأمانة.

(صحيح) ( أبو الشيخ في التوبيخ ) عن عثمان وابن عباس .

---

[١] مامۆستامان ووتویەتی : ئەم فەرموەیە ئاگادارکردنەوەیەکی گرنگی تێدایە ، ئەوویش ئەوەیە ئەو کەسەی سەردان دەکات، پێویستە پێش ئەوەی هەڵسێ، مۆڵەت وەربگرێت لەو کەسەی کە سەردانی کردووە، لەم ڕۆژگارەیشدا زۆر کەس بە پێچەوانەی ئەم فەرموودەوە کار دەکەن.

**٥٥٧٧- بەراستی ڕاستیدا کۆڕەکان سپاردەن[1].**

(الضعيفة ٣٢٢٤)

٥٥٧٨- إياكم و الجلوس على الطرقات فإن أبيتم إلا المجالس فأعطوا الطريق حقها غض البصر و كف الأذى و رد السلام و الأمر بالمعروف و النهي عن المنكر.

(صحيح) ( حم ق د ) عن أبي سعيد .

**٥٥٧٨- نەکەن لەسەر ڕێگاکان دابنیشن، ئەگەر هەر ناچار بوون دابنیشن ئەوا مافی ڕێگە بدەن: گرتنی چاو و، ئازار نەدانی خەڵکی و، وەڵامدانەوەی سەلام و، فەرمان بە چاکە و، قەدەغە کردنی خراپە.**

(المشكاة ٤٦٤٠)

٥٥٧٩- تحول إلى الظل ....

(صحيح) ( ك ) عن أبي حازم .

**٥٥٧٩- بگوێزەرەوە بۆ سێبەرەکە[2]....**

(الصحيحة ٨٣١)

٥٥٨٠- خير المجالس أوسعها.

(صحيح) ( حم خد د ك ه ) عن أبي سعيد ( البزار ك هب ) عن أنس .

**٥٥٨٠- چاکترین کۆڕەکان فراوانترینیانە.**

(الصحيحة ٨٣٠)

٥٥٨١- الرجل أحق بصدر دابته و أحق بمجلسه إذا رجع.

(صحيح) ( حم ) عن أبي سعيد.

**٥٥٨١- خاوەن وڵاخ شایستەترە لە پێشەوەی وڵاخەکەی خۆی سوار بێت هەروەها بە جێگەکەی خۆیشی شایستە ترە کاتێك هەڵدەستێ دەگەڕێتەوە.**

(الارواء ٤٨٧)

٥٥٨٢- الرجل أحق بمجلسه و إن خرج لحاجته ثم عاد فهو أحق بمجلسه.

(صحيح) ( ت ) عن وهب بن حذيفة.

---

[1] مەناوی دەڵێت : واتە شاردنەوەی ئەو شتانەی دەوترێت لە کۆڕەکە وەکو نهێنی ، دانیشتوانی ئەو کۆڕە بۆیان نیە باسی بکەن.

[2] ئەی ئەو کەسەی لەبەر خۆر دانیشتوی.

**٥٥٨٢- خاوەن جێگا خاوەن مافترە بە جێگای خۆی، ئەگەر بۆ کارێکی خۆیشی ڕۆیشتوو، ئینجا گەڕایەوە هەر خۆی مافدارترە بەو جێگایە.**

(الارواء ٤٨٧)

٥٥٨٣-- زر غبا تزدد حبا.

(صحيح) ( البزار طس هب ) عن أبي هريرة ( البزار هب ) عن أبي ذر ( طب ك ) عن حبيب بن مسلمة الفهري (طب ) عن ابن عمرو ( طس ) عن ابن عمرو ( خط ) عن عائشة.

**٥٥٨٣- کات لە دوای کات سەردان بکە ، خۆشەویستتر دەبیت.**

(الروض النضير ٢٧٨)

٥٥٨٤- أنت أحق بصدر دابتك مني إلا أن تجعله لي.

(صحيح) ( حم د ت ) عن بريدة .

**٥٥٨٤- تۆ بە سواربونی لای پێشەوەی وڵاخەکە مافدارتری لەمن، مەگەر خۆت بۆ منی تەرخان بکەیت.**

(الارواء ٤٨٧)

٥٥٨٥- إن الرجل أحق بصدر دابته و صدر فراشه و أن يؤم في رحله.

(صحيح) ( طب ) عن عبدالله بن حنظلة .

**٥٥٨٥- خاوەن وڵاخ مافدارترە بە سواربونی لای پێشەوەی وڵاخەکەی خۆی، هەروەها بە لای سەرەوەی جێگەکەی خۆی و، پێشنوێژی کردنیش لە ماڵی خۆیدا.**

(الصحيحة ١٥٩)

٥٥٨٦- صاحب الدابة أحق بصدرها.

(صحيح) ( حب ) عن بريدة ( حم طب ) عن قيس بن سعد وحبيب بن مسلمة ( حم ) عن عمر ( طب ) عن عصمة بن مالك الخطمي وعروة بن مغيث الأنصاري ( طس ) عن علي ( البزار ) عن أبي هريرة ( أبو نعيم ) عن فاطمة الزهراء.

**٥٥٨٦- خاوەن وڵاخ خاوەن مافترە بە سواربوونی لای بە پێشەوەی وڵاخەکەی.**

(المشكاة ٣٩١٨)

٥٥٨٧- صاحب الدابة أحق بصدرها إلا من أذن.

(صحيح) ( ابن عساكر ) عن بشير.

**٥٥٨٧- خاوەن ولاخ مافدارترە بە سوار بوونى لاى پێشەوەى ولاخەكەى، مەگەر خۆى مۆڵەت بە كەسێك بدات.**

(المشكاة ٣٩١٨)

٥٥٨٨- كان يجلس القرفصاء.

(صحيح) ( طب ) عن إياس بن ثعلبة.

**٥٥٨٨- پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر چیچكان دادەنیشێت.**

(الصحيحة ٢١٢٤)

٥٥٨٩- ما لكم و المجالس الصعدات اجتنبوا مجالس الصعدات أما لا فأدوا حقها: غض البصر و رد السلام و إهداء السبيل و حسن الكلام.

(صحيح) ( حم م ن ) عن أبي طلحة.

**٥٥٨٩- چێتان داوە لە دانیشتنى سەر رێگەكان، خۆتان دووربخەنەوە لە رێنشینى، ئەگەر نا مافى بدەن: گرتنى چاو و، وەلامدانەوەى سەلام و، رێنوێنى كردن و، گفتوگۆى جوان.**

(الصحيحة ٢٥٠١)

٥٥٩٠- ما لي أراكم عزين.

(صحيح) ( حم م د ن ) عن جابر بن سمرة.

**٥٥٩٠- ئەوە دەتانبینم بازنە بازنە و كۆمەڵ كۆمەڵ دانیشتوون.**

**( الصحيح ابن داود ٩١٨ )**

٥٥٩١- من أحب أن يتمثل له الرجال قياما فليتبوأ مقعده من النار.

(صحيح) ( حم د ت ) عن معاوية.

**٥٥٩١- هەركەسێك حەز بكات پیاوان لەخزمەتیا بە پێوە راوەستن، با جێگاى خۆى لە دۆزەخدا ئامادە بكات.**

(الصحيحة ٣٥٦)

٥٥٩٢- قوموا إلى سيدكم.

(صحيح) ( د ) عن أبي سعيد.

**٥٥٩٢- هەڵسن بەرەو لای سەرگەورەکەتان[1].**

(الصحيحة ٦٧)

٥٥٩٣- المجالس بالأمانة.

(صحيح) ( خط ) عن علي.

**٥٥٩٣- نهێنی کۆڕەکان((سپاردەن)) پێویستە بپارێزرێن.**

(الصغيفه ١٩٠٩)

٥٥٩٤- نزل ملك من السماء فكذبه بما قال لك فلما انتصرت وقع الشيطان فلم أكن لأجلس إذا وقع الشيطان.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة.

**٥٥٩٤- فریشتەیەك لە ئاسمان هاتە خوارەوە و ئەوی بەدرۆ خستەوە درۆوە کە وتبوو، جا کاتێك تو سەرکەوتی شەیتان کەوت، منیش دانەدینشتم کەشەیتان کەوت.**

(الصحيحة ٢٣٧٦)

٥٥٩٥- نهى أن يجلس الرجل بين الرجلين إلا بإذنهما.

(صحيح) ( هق ) عن ابن عمرو.

**٥٥٩٥- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردووە پیاوێك لەنێو دوو پیاو دابنیشێ مەگە مۆڵەتی بدەن.**

(الارواء ٣٨٠)

٥٥٩٦- نهى أن يجلس بين الضح و الظل و قال: مجلس الشيطان.

(صحيح) ( حم ) عن رجل.

**٥٥٩٦- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردووە کەسێك دابنیشێ لەنێوان خۆر و سێبەر[2] بێت و، فەرمووی: ئەوە جێگای شەیتانە.**

(الصحيحة ٨٣٦)

---

[1] واتە: (سعد بن معاذ) هۆکاری هەڵسانەکەشیان ئەوە بوو ، سەعدیان بە برینداری هێنا ، بۆ ئەوەی بڕیار بدات سەبارەت بە (بني قريظة) ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: هەڵسن بۆ لای سەرگەورەکەتانو لەسەر وولاخەکەی داییەزێنن ، لەوەیش بۆت دەردەکەوێت ئەو کەسە بە هەڵەدا چووە ، ئەم فەرموودە دەکاتە بەڵگە بۆ دروستی هەڵسان لە بەر پێی ئەو کەسەی سەردانت دەکات.

[2] واتە: نیوەی لەبەر خۆر و نیوەی لە سێبەر بێت.

٥٥٩٧- نهى أن يقعد الرجل بين الظل و الشمس.

(صحيح) ( ك ) عن أبي هريرة ( ه ) عن بريدة.

**٥٥٩٧- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردووە پیاوێك لەنێوان سێبەر و خۆردا دابنیشێ.**

(الصحيحة ٨٣٦)

٥٥٩٨- إذا كان أحدكم في الشمس فقلص عنه الظل و صار بعضه في الظل و بعضه في الشمس فليقم.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة .

**٥٥٩٨-ئەگەر کەسێکتان لەبەر خۆر بوو، سێبەرەکەی لەسەر لاچوو، بە شێوەیەك هەندێکی لەبەر سێبەر و هەندێکی لەبەر خۆر بوو، با هەڵسێت.**

(الصحيحة ٨٣٥)

٥٥٩٩- لا تجلسوا بين رجلين إلا بإذنهما.

(صحيح) ( د ) عن ابن عمر.

**٥٥٩٩- لە نێوان دوو پیاودا دامەنیشن تاکو مۆڵەتتان نەدەن.**

(المشكاة ٤٧٠٤)

٥٦٠٠- لا تفعلوا كما تفعل أهل فارس بعظمائها.

(صحيح) ( ه ) عن أبي أمامة.

**٥٦٠٠- ئێوەوامەکەن وەکو فارسەکان دەیانکرد لەگەڵ گەورەکانیان**[1].

(الصحيح ابي داود ٦١٥)

٥٦٠١- لا يتجالس قوم إلا بالأمانة.

(صحيح) ( المخلص ) عن مروان بن الحكم.

**٥٦٠١- کەسانێك نابێت پێکەوە دابنیشن بە سپاردەو ئەمانەتەوە نەبێت.**

(الصغيفه ١٩٩)

٥٦٠٢- لا يحل لرجل أن يفرق بين اثنين إلا بإذنهما.

(صحيح) ( حم د ت ) عن ابن عمرو.

**٥٦٠٢- ڕەوا نییە کەسێك دووکەس جیاکاتەوە ئەگەر مۆڵەتی لێیان وەرنەگرتبێت.**

(المشكاة ٤٧٠٣)

---

[1] **ئەوانەی بەدەوری میرەکەیاندا ڕادەوەستانو ، ئەویش دادەنیشت.**

٥٦٠٣- لا يقيم الرجل الرجل من مجلسه ثم يجلس فيه.

(صحيح) ( ق ت ) عن ابن عمر.

**٥٦٠٣- نابێت كەسێك كەسێكی تر هەڵسێنێت و خۆی لە جێگەكەی دابنیشێت.**

(الصحيحة ٢٢٨)

٥٦٠٤- لا يقيم الرجل الرجل من مجلسه ثم يجلس فيه و لكن تفسحوا أو توسعوا.

(صحيح) ( حم م ) عن ابن عمر.

**٥٦٠٤- نابێت كەسێك كەسێكی تر هەڵسێنێت و خۆی لە جێگەكەی دانیشێت، بەڵام جێگەی بكەنەوە و، پاڵێك بدەن.**

(المشكاة ٤٦٩٦)

٥٦٠٥- لا تصاحب إلا مؤمنا و لا يأكل طعامك إلا تقي.

(صحيح) ( حم د ت حب ك ) عن أبي سعيد.

**٥٦٠٥- تەنها هاوڕێیەتی خاوەن باوەڕدار بكە و، با پیاوی لەخوا ترس خواردنت بخوات**[1].

(المشكاة ٥٠١٨)

٥٦٠٦- إذا كان ثلاثة جميعا فلا يتناجى اثنان دون الثالث.

(صحيح) ( حم ) عن أبي هريرة .

**٥٦٠٦- ئەگەر سێ كەس بەیەكەوە بوون، بادووانیان بەچپە و لەنێوان خۆیاندا بەجیا قسەنەكەن.**

(الصحيحة ١٤٠٣)

٥٦٠٧- إذا كانوا ثلاثة فلا يتناج اثنان دون الثالث.

(صحيح) ( مالك ق ) عن ابن عمر .

**٥٦٠٧- ئەگەر سێ كەس بوون، با دووانیان پێكەوە چپە نەكەن بەبێ سێهەم.**

(الصحيحة ١٤٠٢)

٥٦٠٨- إذا كنتم ثلاثة فلا يتناج رجلان دون الآخر حتى تختلطوا بالناس فإن ذلك يحزنه.

(صحيح) ( حم ق ت ه ) عن ابن مسعود .

**٥٦٠٨- ئەگەر سێ كەس پێكەوە بوون، با دووانیان بەجیا چپە قسە بە نهێنی نەكەن، تا ئەو كاتەی دەچنە نێو خەڵكی، چونكە بێگومان ئەو كەسە ئەوەی پێ ناخۆشە.**

(الصحيحة ٢٤٠٢)

---

[1] مەناوی دەڵێت: چونكە خواردنی دەمی یەكتر سەردەكێشێ بۆ خۆشەویستی و تێكەڵبوون.

٥٦٠٩- إذا كان اثنان يتناجيان فلا تدخل بينهما.

(صحيح) ( ابن عساكر ) عن ابن عمر .

**٥٦٠٩- ئەگەر دووكەس پێكەوە بوون بەچپە قسەيان دەكرد، مەچۆرە نێوانيانەوە.**

(الصحيحة ١٣٩٥)

٥٦١٠- لا ينتجي اثنان دون الثالث فإن ذلك يحزنه.

(صحيح) ( د ) عن ابن مسعود وابن عمر.

**٥٦١٠- با دووكەس خۆيان لە سێ يەم جيانەكەنەوەو بە چپە قسە بكەن، چونكە ئەو كارە غەمباری دەكات.**

(الصحيحة ١٤٠٢)

## بابەتی مۆڵەت وەرگرتن

٥٦١١- اخرجي إليه فإنه لا يحسن الاستئذان فقولي له: فليقل: السلام عليكم أأدخل ؟.

(صحيح) ( حم ) عن رجل من بني عامر .

**٥٦١١- بڕۆ[١] بۆ لای چونكە ئەو نازانێ مۆڵەت وەردەگرێت پێدان بكات و، پێی بڵێ: با بڵێت:( السلام عليكم ) ئەرێ بێمە ژوورەوە[٢].**

(الصحيحة ١١٧٠)

٥٦١٢- إذا استأذن أحدكم ثلاثا فلم يؤذن له فليرجع.

(صحيح) ( مالك حم ق د ) عن أبي موسى وأبي سعيد معا ( طب الضياء ) عن جندب البجلي .

**٥٦١٢- ئەگەر كەسێك لە ئێوە سێ جار داوای مۆڵەتی كرد[٣] و، مۆڵەتی پێ نەدرا با بگەڕێتەوە.**

(الصحيحة ٣٤٧٤)

٥٦١٣- إنما جعل الاستئذان من أجل البصر.

(صحيح) ( حم ق ت ) عن سهل بن سعد .

---

[١] ئەی خزمەتكار.

[٢] پیاوێك ويستی بچێتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و ، ووتی: ئايا بێمە ژوورەوە ، ئيتر پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی فەرموو.

[٣] بە هێواشی سێ جار لە دەرگا بدرێت.

**٥٦١٣- لە ڕاستیدا مۆڵەت وەرگرتن لە پێناوی تەماشا كردندا دانراوە[١].**

(المشكاة٣٥١٥)

٥٦١٤- رسول الرجل إلى الرجل إذنه.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة.

**٥٦١٤- نێردراوی كەسێك بۆ لای كەسێك مۆڵەت پێدانیەتی.**

(الارواء ١٩٥٥)

٥٦١٥- قل: السلام عليكم أأدخل ؟.

(صحيح) ( د ) عن رجل من بني عامر ( طب ) عن كلدة بن حنبل الغساني.

**٥٦١٥- بڵێ:( السلام عليكم ) ئایا بێمە ژوورەوە؟**

(الصحيحة ٨١٨)

٥٦١٦- كان إذا أتى باب قوم لم يستقبل الباب من تلقاء وجهه و لكن من ركنه الأيمن أو الأيسر و يقول: السلام عليكم السلام عليكم.

(صحيح) ( حم د ) عن عبدالله بن بسر.

**٥٦١٦- پێغەمبەر (ﷺ) كاتێك دەچوە بەربابەتی كەسێك بەرامبەر دەرگاكە ڕانەدەوەستا، بەڵكو لەلای ڕاست یان لەلای چەپی دەرگاكە ڕادەوەستا و، دەیفەرموو:( السلام عليكم، السلام عليكم ).**

(المشكاة ٤٦٧٣)

٥٦١٧- الاستئذان ثلاث فإن أذن لك و إلا فارجع.

(صحيح) ( م ت ) عن أبي موسى وأبي سعيد .

**٥٦١٧- مۆڵەت وەرگرتن سێ جارە، ئەگەر نا بگەڕێرەوە.**

(الصحيحة ٣٤٧٤)

٥٦١٨- كان بابه يقرع بالأظافير.

(صحيح) ( الحاكم في الكنى ) عن أنس.

**٥٦١٨- بابەتی پێغەمبەر (ﷺ) بە نینۆك لێ دەدرا[٢].**

(الصحيحة ٣٤٧٤)

---

[١] واتە: ڕێگە پێدان بۆ ئەوەیە لەدەرەوە ئەوانەی ناو ماڵ نەبینرێن.

[٢] لە ڕووی ڕەوشت جوانی و ڕێز گرتن لە پێغەمبەر (ﷺ) وەكو زەمەحشەری دەڵێت.

٥٦١٩- لو علمت أنك تنظر لطعنت بها في عينك إنما جعل الاستئذان من أجل البصر.

(صحيح) ( حم ق ت ن ) عن سهل بن سعد.

**٥٦١٩- ئەگەر بمزانیایە تەماشا دەكەیت شتێكم دەچەقاندە ناو چاوت، مۆڵەت وەرگرتن هەر خۆی لەبەر تەماشا نەكردنە.**

(الترغيب ٢٧٣٠)

٥٦٢٠- هكذا فإنما الاستئذان من النظر.

(صحيح) ( د ) عن سعد.

**٥٦٢٠- ئاوها، چونكە بێگومان مۆڵەت وەرگرتن لە پێناو تەماشا كردنە.**

(الصحيح ابي داود ٥١٧٤)

٥٦٢١- أيما رجل كشف سترا فأدخل بصره من قبل أن يؤذن له فقد أتى حدا لا يحل أن يأتيه و لو أن رجلا فقأ عينه لهدرت و لو أن رجلا مر على باب لا سترة عليه فرأى عورة أهله فلا خطيئة عليه إنما الخطيئة على أهل الباب.

(صحيح) ( حم ت ) عن أبي ذر .

**٥٦٢١- هەر پیاوێك پەردەیەك لاببات و،لێو، تەماشا بكات پێش ئەوەی رێگەی پێ بدەن، ئەوە تاوانێكی ناڕەوای ئەنجامداوە، ئەگەر كەسێكیش لەو جێگەیەدا چاوی دەرپەڕێنرێت بە فیڕۆ دەڕوات، ئەگەر كەسێكیش بەلای دەرگایەكدا تێپەڕێت كە پەردەی پێوە نەبێت شەرمگەی دانیشتووەكانی بینی ئەوە تاوانی ئەو نییە بەڵكو تاوانی دانیشتوانی ئەوماڵەیە.**

(الترغيب ٢٧٢٨)

## بابەتی تەوقەكردن و دەست لەمل كردن

٥٦٢٢- إذا تصافح المسلمان لم تفرق أكفهما حتى يغفر لهما.

(صحيح) ( طب ) عن أبي أمامة .

**٥٦٢٢- ئەگەر دوو موسڵمان پێكەوە تەوقەبكەن، دەستیان لە یەكتر جیا نابێتەوە كە خوای گەورە لێیان خۆش دەبێت.**

(الصحيحة ٥٢٤)

٥٦٢٣- إني لا أصافح النساء.

(صحيح) ( ت ن ه ) عن أميمة بنت رقيقة .

**٥٦٢٣- من تەوقە لەگەڵ ئافرەتان ناكەم.**

(الصحيحة ٥٢٨)

٥٦٢٤- لا أمس أيدي النساء.

(صحيح) ( طس ) عن عقيلة بنت عبيد.

**٥٦٢٤- من دەست لەدەستی ئافرەتان نادەم.**

(الصحيحة ٥٢٨)

٥٦٢٥- أيما مسلمين التقيا فأخذ أحدهما بيد صاحبه فتصافحا و حمدا الله تعالى جميعا تفرقا و ليس بينهما خطيئة.

(صحيح) ( حم الضياء ) عن البراء .

**٥٦٢٥- هەر دوو موسڵمانێك بەیەكتر بگەن و، تەوقە بكەن و، سوپاسی خوا بكەن پێكەوە، كاتێك لێك جیا دەبنەوە گوناهیان پێوە نەماوە.**

(الصحيحة ٥٢٤)

٥٦٢٦- كان إذا لقيه أحد من أصحابه فقام معه قام معه فلم ينصرف حتى يكون الرجل هو الذي ينصرف عنه و إذا لقيه أحد من أصحابه فتناول يده ناوله إياها فلم ينزع يده منه حتى يكون الرجل هو الذي ينزع يده منه و إذا لقي أحدا من أصحابه فتناول أذنه ناوله إياها ثم لم ينزعها حتى يكون الرجل هو الذي ينزعها عنه.

(صحيح) ( ابن سعد ) عن أنس.

**٥٦٢٦- پێغەمبەر (ﷺ) كاتێك یەكێك لە هاوەڵانی پێی دەگەشت لەگەڵی ڕادەوەستا و، بەجێی نەدەهێشت تاكو خۆی پێغەمبەر (ﷺ) ی بەجێنەهێشتایە، كاتێك یەكێك لە هاوەڵانیشی دەستی پێغەمبەری (ﷺ) بگرتایە بۆ تەوقەكردن، پێغەمبەر (ﷺ) دەستی ئەوی بەرنەدەدا تاكو خۆی دەستی پێغەمبەر(ﷺ) بەرنەدایە، كاتێكیش یەكێك لە هاوەڵانی بیویستایە قسەیەك بە نهێنی بچپێنێت بە گوێی پێغەمبەردا (ﷺ) گوێی لانەدەدا تاكو ئەو هاوەڵە خۆی دوورنەكەوتایەتەوە.**

(المشكاة ٥٨٢٤)

٥٦٢٧- كان إذا لقيه الرجل من أصحابه مسحه و دعا له.

(صحيح) ( ن ) عن حذيفة.

**٥٦٢٧- پێغەمبەر (ﷺ)كەيەكێك لە هاوەڵان پێى دەگەيشت تەوقەى لەگەڵ دەكرد و نزاى بۆدەكرد.**

(الصحيح ابي داود ٢٤٤)

٥٦٢٨- لأن يطعن في رأس أحدكم بمخيط من حديد خير له من أن يمس امرأة لا تحل له.

(صحيح) ( طب ) عن معقل بن يسار.

**٥٦٢٨- ئەگەر دەرزييەكى ئاسنين بچەقێندرێت بەسەرى يەكێكتاندا، ئەوە چاكترە بۆى لەوەى دەستى لە ئافرەتێكى بێگانە بدات.**

(الصحيحة ٢٢٦)

٥٦٢٩- ما من مسلمين يلتقيان فيتصافحان إلا غفر لهما قبل أن يتفرقا.

(صحيح) ( حم د ت ه الضياء ) عن البراء.

**٥٦٢٩- هيچ دوو موسڵمانێك نييە بەيەك بگەن و تەوقە بكەن پێش ئەوەى لێك جيابېنەوە خوا لێيان خۆش نەبێت.**

(الصحيحة ٥٢٤)

٥٦٣٠- ما من مسلمين يلتقيان فيسلم أحدهما على صاحبه و يأخذ بيده لا يأخذ بيده إلا لله فلا يفترقان حتى يغفر لهما.

(صحيح) ( حم ) عن البراء.

**٥٦٣٠-هيچ دوو موسڵمانێك كە بەيەكتر بگەن و تەوقە بكەن لەگەڵ يەكتردا، لەبەر خوا و پێش ئەوەى لە يەكتر جيابنەوە خوا لێيان خۆش نەبێت.**

(الصحيحة ٥٢٤)

# بابەتى پژمين و باوێشك

٥٦٣١- إذا تثاءب أحدكم فليرده ما استطاع فإن أحدكم إذا قال: ها ضحك منه الشيطان.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة .

**٥٦٣١- كە يەكێكتان باوێشك دەدات هەتا دەتوانێت با بيگێڕێتەوە ، چونكە كاتێك دەڵێن ها[1]، شەيتان پێدەكەنێ.**

(الصحيح الترمذى ٢٧٤٦)

٥٦٣٢- إذا تثاءب أحدكم فليضع يده على فيه فإن الشيطان يدخل مع التثاؤب.

(صحيح) ( حم ق د ) عن أبي سعيد .

**٥٦٣٢- ئەگەر كەسێكتان باوێشكى دا با دەستى بە دەميەوە بگرێت، چونكە شەيتان لەگەڵ دەم كردنەوەى باوێشكدا دەچێتە ژوورەوە.**

(المشكاة ٤٧٣٧)

٥٦٣٣- إذا تثاءب أحدكم في الصلاة فليكظم ما ستطاع فإن الشيطان يدخل.

(صحيح) ( م د ) عن أبي سعيد .

**٥٦٣٣- ئەگەر كەسێكتان لەنێو نوێژدا باوێشكى دا هەتا دەتوانێت، با بيگێڕێتەوە ، چونكە بەڕاستى شەيتان دەچێتە ژوورەوە.**

(الضعيفة ٢٤٢٠)

٥٦٣٤- إذا عطس أحدكم فحمد الله فشمتوه و إذا لم يحمد الله فلا تشمتوه.

(صحيح) ( حم خد م ) عن أبي موسى .

**٥٦٣٤- ئەگەر كەسێكتان پژمى و، ووتى:( الحمد لله ) پێى بڵێن:( يرحمكم الله ) خودا بەزەيى پێدا بێتەوە، ئەگەر واينەووت، ئێوەش واى پێ مەڵێن.**

(الصحيحة ٣٠٩٤)

٥٦٣٥ إذا عطس أحدكم فليشمته جليسه فإن زاد على ثلاث فهو مزكوم و لا يشمت بعد ثلاث.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة .

---

[1] واتە : ئەوەندە باوێشك دەدات تاكو دەنگى هاهاى لێ ى دەردەچێت.

**٥٦٣٥- ئەگەر كەسێكتان پژمی با ئەو كەسەی لەلای دانیشتووە داوای سۆزی و بەزەیی خوای بۆ بكات، بەلام ئەگەر لە سێ جار زیاتر پژمی ئەوە هەلامەتی هەیە و، هیچی پێ مەلێن.**

(الصحيحة ١٣٣٠)

٥٦٣٦- إذا عطس أحدكم فليضع كفيه على وجهه و ليخفض صوته.

(صحيح) ( ك هب ) عن أبي هريرة .

**٥٦٣٦- ئەگەر كەسێكتان پژمی با هەردوو دەستی بخاتە سەر ڕوخساری و دەنگی نزم كاتەوە.**

(المشكاة ٤٧٣٨)

٥٦٣٧- إذا عطس أحدكم فليقل: الحمد لله رب العالمين و ليقل له: يرحمك الله و ليقل هو: يغفر الله لنا و لكم.

(صحيح) ( طب ك هب ) عن ابن مسعود ( حم ٣ ك هب ) عن سالم بن عبيد الأشجعي .

**٥٦٣٧- ئەگەر كەسێكتان پژمی، با بلێت:( الحمد لله الرب العالمين ) و، با پێی بوترێت:( يرحمك الله )و، ئەويش بلێت:( يغفر الله لنا ولكم ) خوا لە ئێوەش خۆش بێت.**

(المشكاة٤٧٤١)

٥٦٣٨- إذا عطس أحدكم فليقل: الحمد لله على كل حال و ليقل له من حوله: يرحمك الله و ليقل هو لمن حوله: يهديكم الله و يصلح بالكم.

(صحيح) ( حم ت ن ك ) عن أبي أيوب ( ه ك هب ) عن علي .

**٥٦٣٨- ئەگەر كەسێكتان پژمی، با بلێت:( الحمد لله على كل حال ) ئەوەی لەدەوورو بەريشيەتی با پێی بلێت:( يرحمك الله ) ئەويش بەوان بلێت:( يهديكم الله و يصلح بالكم )خوا ڕێنمونيتان بكات و سەر ئە نجامتان چاك بكات.**

(الارواء ٧٧٢)

٥٦٣٩- إذا عطس أحدكم فليقل: الحمد لله فإذا قال فليقل له أخوه أو صاحبه: يرحمك الله فإذا قال له: يرحمك الله فليقل: يهديكم الله و يصلح بالكم.

(صحيح) ( حم خ ه ) عن أبي هريرة .

**٥٦٣٩- ئەگەر كەسێكتان پژمی با بلێت:( الحمد لله ) وە برا دينيەكەی پێی بلێت:( يرحمك الله ) ئەويش بلێت:( يهديكم الله و يصلح بالكم ).**

(الصحيحة ٢٣٨٧)

٥٦٤٠- إن الله تعالى يحب العطاس و يكره التثاؤب.

(صحيح) ( خ د ت ) عن أبي هريرة .

**٥٦٤٠- خوای گەورە پژمینی پێ خۆشە و باوێشكی پێ خۆش نییە.**

(المشكاة ٤٧٣٢)

٥٦٤١- العطاس من الله و التثاؤب من الشيطان فإذا تثاءب أحدكم فليضع يده على فيه و إذا قال: آه آه فإن الشيطان يضحك من جوفه و إن الله عز و جل يحب العطاس و يكره التثاؤب.

(صحيح) (ت ابن السني في عمل اليوم والليلة ) عن أبي هريرة.

**٥٦٤١- پژمین لە خواوەیە، باوێشك لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر كەسێكتان باوێشكی دا، بادەستی بخاتە سەر دەمی، ئەگەریش بڵێ: ئاە ئاە، شەیتان لە ناخی یەوە پێی پێدەكەنێت، خوای گەورەیش پژمینی پێ خۆشەو باوێشكی پێ خۆش نییە.**

(الارواء ٧٧٩)

٥٦٤٢- ثلاث كلهن حق على كل مسلم: عيادة المريض و شهود الجنازة و تشميت العاطس إذا حمد الله.

(صحيح) ( خد ) عن أبي هريرة .

**٥٦٤٢- سێ شت هەیە مافە بەسەر هەموو موسڵمانێكەوە: سەردانی نەخۆش و، بەرێكردنی تەرم، داوای ڕەحمەت كردن بۆ ئەو كەسەی دەپژمێت ئەگەر سوپاسی خوای كرد.**

(الصحيحة ١٨٠٠)

٥٦٤٣- شمت أخاك ثلاثا فما زاد فإنما هي نزلة أو زكام.

(صحيح) ( ابن السني أبو نعيم في الطب ) عن أبي هريرة.

**٥٦٤٣- سێ جار بە براكەت بڵێ:( يرحمك الله )ئەگەر لەوە زیاتر پژمی، ئەوە درمی هەیە یان هەڵامەتە.**

(المشكاة ٤٧٤٣)

٥٦٤٤- إن الله يحب العطاس و يكره التثاؤب فإذا عطس أحدكم فحمد الله كان حقا على كل مسلم سمعه أن يقول له: يرحمك الله و أما التثاؤب فإنما هو من الشيطان فإذا تثاءب أحدكم فليرده ما استطاع فإن أحدكم إذا قال: ها ضحك منه الشيطان.

(صحيح) ( حم خ د ت ) عن أبي هريرة .

**٥٦٤٤- خوای گەورە پژمینی پێ خۆشەو ڕقی لە باوێشکە، جا ئەگەر کەسێکتان پژمی و، وتی:( الحمد لله ) پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك گوێی لێبەتی پێی بڵێت:( یرحمك الله ). بەڵام بێگومان باوێشك لەشیتانەوەیە، بۆیە ئەگەر کەسێکتان باوێشکی دا هەتا دەتوانێت با بیگێڕێتەوە، چونکە ئەگەر کەسێکتان بڵێت: ها، شەیتان پێی پێدەکەنێت.**

(الارواء ٧٧١)

٥٦٤٥- كان إذا عطس حمد الله فيقال: له: يرحمك الله فيقول: يهديكم الله و يصلح بالكم.

(صحيح) ( حم طب ) عن عبدالله بن جعفر.

**٥٦٤٥- کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) دەپژمی دەیفەرموو:( الحمد لله )و، پێی دەوترا:( یرحمك الله )و، دەیفەرموو:( یهدیکم الله ویصلح بالکم ).**

(الصحيحة ٢٣٨٧)

٥٦٤٦- كان إذا عطس وضع يده أو ثوبه على فيه و خفض بها صوته.

(صحيح) ( د ت ك ) عن أبي هريرة.

**٥٦٤٦- کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) دەپژمی یان دەستی یان پۆشاکەکەی دەخستە سەر دەمی و، دەنگی خۆی پێ نزم دەکردەوە [1].**

(الروض ١١٠٩)

٥٦٤٧- للمسلم على المسلم أربع خلال: يشمته إذا عطس و يجيبه إذا دعاه و يشهده إذا مات و يعوده إذا مرض.

(صحيح) ( حم ه ك ) عن أبي مسعود.

**٥٦٤٧- موسڵمان چوار مافی هەیە بەسەر موسڵمانەوە: داوای میهرەبانی خوای بۆ بکات لەکاتی پژمەدا و، وەڵامی بانگێشتی بداتەوە و، ئامادەی تەرمەکەی بێت ئەگەر مرد و، سەردانی بکات کە نەخۆش کەوت.**

(الصحيحة ٢١٥٤)

٥٦٤٨- يشمت العاطس ثلاثا فما زاد فهو مزكوم.

(صحيح) ( ه ) عن سلمة بن الأكوع.

---

[1] (التوربشتی) دەڵێت: ئەمە ڕەوشتێکی جوانە لەگەڵ دانیشتوانی دەوروبەر، چونکە خەڵکی حەز لە دەنگی پژمین ناکەن.

**٥٦٤٨- سێ جار (يرحمك الله) بەو كەسە دوترێت بپژمێت، لەوە زیاتر هەڵمەتی هەیە.**

(المشكاة ٤٧٤٣)

## بابەتی تف كردن بەلای ڕاستدا

٥٦٤٩- إذا أردت أن تبزق فلا تبزق عن يمينك و لكن عن يسارك إن كان فارغا فإن لم يكن فارغا فتحت قدمك.

(صحيح) ( البزار ) عن طارق بن عبدالله .

**٥٦٤٩- ئەگەر ویستت تف بكەیت بەلای ڕاستتدا تف مەكە، بەڵكو بەلای چەپتدا ئەگەر چۆڵ بوو، ئەگەر چۆڵ نەبوو بیكەرە ژێر پێت.**

(الصحيحة ١٢٢٣)

٥٦٥٠- إذا تنخم أحدكم فلا يتنخمن قبل وجهه و لا عن يمينه و ليبصقن عن يساره أو تحت قدمه اليسرى.

(صحيح) ( خ ه ) عن أبي هريرة وأبي سعيد .

**٥٦٥٠- ئەگەر كەسێكتان تف و بەڵغەمی فڕێدا، با بەرانبەر خۆی، یان بەلای ڕاستدا فڕ ێنەدات، بەڵكو بەلای چەپدا، یان بۆ ژێر پێی چەپی.**

(الصحيحة ١٢٧٤)

٥٦٥١- إذا تنخم أحدكم و هو في المسجد فليغيب نخامته لا تصيب جلد مؤمن أو ثوبه فتؤذيه.

(صحيح) ( حم ع ابن خزيمة هب الضياء ) عن سعد .

**٥٦٥١- ئەگەر كەسێكتان بەڵغەمی فڕێدا و لە مزگەوت بوو با بیشارێتەوە، نەوەك لە پێست و جل و بەرگی موسڵمانێك بدات و ئازاری پێ بگەیەنێت.**

(الصحيحة ١٢٦٥)

## بابەتی قەدەغەکردنی ووتنی : خەڵکی لەناوچوون

٥٦٥٢- إذا سمعت الرجل يقول: هلك الناس فهو أهلكهم.

(صحيح) ( مالك حم خد م د ) عن أبي هريرة .

**٥٦٥٢- ئەگەر بیستت پیاوێك وتی: خەڵكی لەناوچوون ئەوە ئەو لە هەموویان زیاتر لەناو چووە[1].**

(الصحيحة ٣٠٧٤)

٥٦٥٣- إذا قال الرجل: هلك الناس فهو أهلكهم.

(صحيح) ( حم م د ) عن أبي هريرة .

**٥٦٥٣- ئەگەر پیاوێك وتی: خەڵكی تیاچوون، ئەوە ئەو لە ناوی بردووە.**

(الصحيحة ٣٠٧٤)

## بابەتی ئەوەی ئافرەتان بۆیان نییە بەناوەڕاستی ڕێگەدا بڕۆن

٥٦٥٤- استأخرن فإنه ليس لكن أن تحققن الطريق عليكن بحافات الطريق.

(صحيح) ( د ) عن أسيد الأنصاري .

**٥٦٥٤- دواکەون، چونکە بۆتان نییە ناوەڕاستی ڕێگە بگرن، بەڵکو بەقەراغی ڕێگەدا بڕۆن.**

(الصحيحة ٨٥٤)

٥٦٥٥- ليس للنساء وسط الطريق.

(صحيح) ( هب ) عن أبي عمرو ابن حماس وأبي هريرة.

**٥٦٥٥- ئافرەتان بۆیان نییە بە ناوەڕاستی ڕێگەدا بڕۆن[2].**

(الصحيحة ٨٥٤)

---

[1] ((فهو أهلكهم )) ئەو لە هەموویان زیاتر لەناوچووە ، بەلام ئەگەر بەسەر بخوێنرێتەوە بڵێی (( فهو أهلكم )) واتە ئەو لە ناوی بردوون ، بەهەر دوو شێوەکە دروستە.

[2] هەتا دوچاری زەحمەت و نارەحەتی نەبن.

## بابەتی ئەوەی هاتووە دەربارەی چوونە دەرەوەی ئافرەتان

٥٦٥٦- قد أذن الله لكن أن تخرجن لحوائجكن.

(صحيح) ( ق ) عن عائشة.

**٥٦٥٦- خوای گەورە ڕێگەی داون بۆ پێویستیەکانتان بچنە دەرەوە.**

(الصحيحة ٣١٤٨)

## بابەتی گرتنی چاو

٥٦٥٧- اصرف بصرك.

(صحيح) ( حم م ٣ ) عن جرير .

**٥٦٥٧- چاوت وەرگێرە بۆ لایەکی تر.**

(غاية المرام ١٨٨)

٥٦٥٨- إن الله تعالى كتب على ابن آدم حظه من الزنا أدرك ذلك لا محالة فزنا العين النظر و زنا اللسان المنطق و النفس تمنى و تشتهي و الفرج يصدق ذلك أو يكذبه.

(صحيح) ( ق د ن ) عن أبي هريرة .

**٥٦٥٨- خوای گەورە پشکی ئادەمیزادی لە زیناکردن لەسەری نووسیوە ئەستەمە پێی نەگات، جا زیناکردنی چاو تەماشا کردنە و، زیناکردنی زمان قسەکردنە و، دەرونیش ئاوات دەخوازێ و حەز دەکات، داميێنيش بەڕاستی دەگێرێ یان بە درۆی دەخاتەوە[1].**

(الارواء ٢٤٢٨)

٥٦٥٩- إن المرأة إذا أقبلت أقبلت في صورة شيطان فإذا رأى أحدكم امرأة فأعجبته فليأت أهله فإن الذي معها مثل الذي معها.

(صحيح) ( ت حب ) عن جابر .

---

[1] **(الطيبي) دەڵێت: ئەم شتانە ناوی زینای لێ نراوە ، چونکە پێشەکین بۆی، بە ڕاست گێران و بە درۆ و دورخستنەوەشیان لە لای داميێنە.**

**٥٦٥٩- ئافرەت كە دێت لەوێنەی شەیتاندا خۆی دەنوێنێت ، جا ئەگەر كەسێكتان ئافرەتێكی بینی و حەزی لێكرد، با بێتە لای هاوسەرەكەی خۆی، چونكە ئەوەی لەلای ئەو هەیە، لەلای ئەمیش هەیە.**

(الصحيحة ٢٣٥)

٥٦٦٠- إن المرأة تقبل في صورة شيطان و تدبر في صورة شيطان فإذا رأى أحدكم امرأة أعجبته فليأت أهله فإن ذلك يرد ما في نفسه.

(صحيح) ( حم م د ) عن جابر .

**٥٦٦٠- ئافرەت لەوێنەی شەیتاندا دیت و دەڕوات[1]، بۆیە ئەگەر كەسێكتان ئافرەتێكی بینی دڵی بۆی چوو، بابچێتە لای خێزانەكەی خۆی، چونكە ئەو شتەی لە دەروونیدا دروست بووە دەیڕەوێنێتەوە.**

(الصحيحة ٢٣٥)

٥٦٦١- رأيت شابا و شابة فلم آمن من الشيطان عليهما.

(صحيح) ( حم ت ) عن علي.

**٥٦٦١- كوڕ و كچێكی[2] لاوم بینی و، دڵنیا نیم لەوەی شەیتان زەرەریان لێ نەدات.**

(حجاب المرأة المسلمة ٢٧)

٥٦٦٢- زنا العينين النظر.

(صحيح) ( ابن سعد طب ) عن علقمة بن الحويرث.

**٥٦٦٢- زیناكردنی چاو تەماشاكردنە.**

(الارواء ٢٤٢٨)

٥٦٦٣- العينان تزنيان و اليدان تزنيان و الرجلان تزنيان و الفرج يزني..

(صحيح) (حم طب) عن ابن مسعود..

**٥٦٦٣- هەردوو چاو و هەردوو دەست و هەردوو قاچ زینا دەكەن، داوێنیش زینا دەكات.**

(الارواء ٤٢٨)

---

[1] مەناوی دەڵێت: واتە لە سیفەتی شەیتان، چونكە ئافرەتی جوان وەكو شەیتان هەوڵی گومڕا كردن و ئارەزوو جوڵاندن دەدات.

[2] كوڕە لاوەكە ( الفضل بن عباس ) بوو ئافرەتە لاوەكەش ئافرەتێك بوو لە هۆزی ( خثعم ) هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ)( الفضل ) یش سەیری دەكرد ، ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) ملی ( فضل ) ی سوڕدا بەو لاكەی تردا ، كە پرسیاری لێكرا : بۆ واتكرد؟ ئەوەی فەرموو.

٥٦٦٤- كتب على ابن آدم نصيبه من الزنا مدرك ذلك لا محالة فالعينان زناهما النظر و الأذنان زناهما الاستماع و اللسان زناه الكلام و اليد زناها البطش و الرجل زناها الخطا و القلب يهوى و يتمنى و يصدق ذلك الفرج و يكذبه.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة.

**٥٦٦٤- ئادەمیزاد پشکی زیناکردنی لەسەر نووسراوە، بێگومان پێی دەگات، زینـای چـاو تەماشاکردنە و، زینای گوێ بیستنە و، زینـای زمـان قـسەکردنە و، زینـای دەسـت دەسـت درێژی کردنە و، زینای قاچ هەنگاو نانە و، دڵیش ئاوات دەخوازێ هەواداری دەکـات ئـیتر داوێن ئەوەیە ڕاست دەگێڕێ یان بەدرۆی دەخاتەوە.**

(السنة ١٩٣)

٥٦٦٥- لا تباشر المرأة المرأة فتنعتها لزوجها كأنه ينظر إليها.

(صحيح) ( حم خ د ت ) عن ابن مسعود.

**٥٦٦٥- دروست نییە ئافرەت ئافرەتی تـرروو بـەڕوو ببینـێ و باسـی بکـات بـۆ مێردەکـەی وەکو ئەوەی تەماشای بکات.**

(المشكاة ٣٠٩٩)

٥٦٦٦- يا علي ! لا تتبع النظرة النظرة فإن لك الأولى و ليست لك الآخرة.

(صحيح) ( حم د ت ك ) عن بريدة.

**٥٦٦٦- ئەی عەلی! بە دوای یەکدا تەماشا مەکە، چونکە یەکەمیان بۆ تۆیە و دووەمیـان بۆ تۆ نییە.**

(حجاب المرأة ٣٤)

## بابەتی ڕیگە پاككردنەوە

٥٦٦٧- اعزل الأذى عن طريق المسلمين.

(صحيح) ( م ه ) عن أبي برزة .

**٥٦٦٧- ڕێگەی موسڵمانان لە کۆسپ پاك بکەرەوە.**

(المشكاة ١٩٠٦٣)

٥٦٦٨- أمط الأذى عن الطريق فإنه لك صدقة.

(صحيح) ( خد ) عن أبي برزة .

**٥٦٦٨- كۆسپ و دڕك و بەرد لەسەر ڕێگە لابدە، ئەوە خێرە بۆ تۆ.**

(الصحيحة ١٥٥٨)

٥٦٦٩- كان على الطريق غصن شجرة يؤذي الناس فأماطها رجل فأدخل الجنة.

(صحيح) ( ه ) عن أبي هريرة.

**٥٦٦٩- چڵە دارێك لەسەر ڕێگايەك بوو، ئازارى خەڵكى دەدا، پياوێك لايبرد و بەوە چووە بەهەشتەوە.**

(الصحيح ابن ماجة ٣٦٨٢)

٥٦٧٠- كف شرك عن الناس فإنها صدقة منك على نفسك.

(صحيح) ( ابن أبي الدنيا في الصمت ) عن أبي ذر.

**٥٦٧٠- خراپە و ئازاردانت لە خەڵكى دوور بخەرەوە، ئەوە چاكەيە كە لەگەڵ خۆت دەيكەيت...**

(الصحيحة ١٤٩٠)

٥٦٧١- كل سلامى من الناس عليه صدقة كل يوم تطلع فيه الشمس تعدل بين الاثنين صدقة و تعين الرجل على دابته فيحمل عليها أو ترفع له عليها متاعه صدقة و الكلمة الطيبة صدقة و كل خطوة تخطوها إلى الصلاة صدقة و دل الطريق صدقة و تميط الأذى عن الطريق صدقة.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة.

**٥٦٧١- هەموو جوومگەيەك[1] لەخەڵكى چاكەيە خێرێكى لەسەرە، هەموو ڕۆژێك خۆرى لەسەر هەڵدێت، دادگەرى لەنێوان دوو كەسدا بكەيت چاكەيە، يارمەتى پياوێك دەدەيت بارەكەى بۆ باردەكەيت، يان قسەيەكى نەرم و نيان دەكەيت، هەمووى خێر و چاكەيە بۆت، هەموو هەنگاوێكيش هەڵيدەنێى بەرەو نوێژ خێر و چاكەيە، ڕێگە پيشاندان و دڕك لادان لەسەر ڕێگەيش خێر و چاكەيە.**

(الصحيحة ١٠٢٥)

٥٦٧٢- لقد رأيت رجلا يتقلب في الجنة في شجرة قطعها من ظهر الطريق كانت تؤذي الناس.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة.

**٥٦٧٢- پياوێكم بينى لە نێو بەهەشتدا دەگەڕا، بەهۆى بڕينى درەختێكەوە كە لە چەقى ڕێگەدا ئازارى خەڵكى دەدا.**

(المشكاة ١٩٠٥)

---

[1] **لە سێ سەد و شەست جومگەكە.**

٥٦٧٣- مر رجل بغصن شجرة على ظهر طريق فقال: و الله لأنحين هذا عن المسلمين لا يؤذيهم فأدخل الجنة

(صحيح) ( حم م ) عن أبي هريرة.

**٥٦٧٣- پیاوێك بەلای چڵە دارێكدا تێپەڕبوو چەقی ڕێگەیەكدا، ووتی: دەبێ ئەم چڵە دارە لابەرم لەسەر ڕێگای موسڵمانان با ئازاریان نەدات و، لەسەر ئەوە خرایە بەهەشتەوە.**

(المشكاة١٩٠٤)

٥٦٧٤- من آذى المسلمين في طرقهم وجبت عليه لعنتهم.

(صحيح) ( طب ) عن حذيفة بن أسيد.

**٥٦٧٤- هەركەسێك ئازاری موسڵمانان بدات لە ڕێگەكانیاندا، نەفرینی ئەوانی بۆ مسۆگەر دەبێت.**

(الصحيحة ١٢٩٤)

٥٦٧٥- من أخرج من طريق المسلمين شيئا يؤذيهم كتب الله له به حسنة و من كتب له عنده حسنة أدخله بها الجنة.

(صحيح) ( طس ) عن أبي الدرداء.

**٥٦٧٥- هەركەسێك شتێكی لەسەر ڕێگەی موسڵمانان لابرد كە ئازاری دەدان، چاكەیەكی بۆ دەنوسرێت، هەركەسیش لە لای خوا چاكەیەكی بۆ بنوسرێت پێی دەچێتە بەهەشتەوە.**

(الصحيحة ٢٣٠٦)

٥٦٧٦- من أماط أذى عن طريق المسلمين كتب له حسنة و من تقبلت منه حسنة دخل الجنة.

(صحيح) ( خد ) عن معقل بن يسار.

**٥٦٧٦- هەركەسێك دار و بەردێك لەسەر ڕێگای موسڵمانان لابدات، خوای گەورە چاكەیەكی بۆ دەنووسێت، هەركەسیش چاكەیەكی بۆ بنووسرێت دەچێتە بەهەشتەوە.**

(الصحيحة ٢٣٠٥)

٥٦٧٧- من رفع حجرا عن الطريق كتب له حسنة و من كانت له حسنة دخل الجنة.

(صحيح) ( طب ) عن معاذ.

**٥٦٧٧- هەركەسێك بەردێك لابدات لەسەر ڕێگەیەك لابەرێت چاكەیەكی بۆ دەنووسرێت، هەركەسیش چاكەیەكی هەبێت دەچێتە بەهەشتەوە.**

(الصحيحة ٢٣٠٥)

٥٦٧٨- نح الأذى عن طريق المسلمين.

(صحيح) ( ع حب ) عن أبي برزة.

**٥٦٧٨- دار و بەرد لەسەر ڕێگای موسڵمانان لابدە.**

(الصحيحة ٢٣٧٢)

٥٦٧٩- نزع رجل لم يعمل خيرا قط غصن شوك عن الطريق إما كان في شجرة مقطعة فألقاه و إما كان موضوعا فأماطه فشكر الله له بها فأدخله الجنة.

(صحيح) ( د حب ) عن أبي هريرة.

**٥٦٧٩- پیاوێك كە هەرگیز چاكەی نەكردبوو لەژیانیدا، چڵە دارێكی دڕكاوی لەسەر ڕێگایەك لا برد، یان لە پەلی درەختێكی بڕاو بوو فڕێیدا، یان هەر لەسەر ڕێگەكە دانرا بوو لایبرد، خوای گەورە بەو كارەی خستیە بەهەشتەوە.**

(الصحيح ابي داود ٥٢٥٤)

## بابەتی چاكترینی خەڵكی

٥٦٨٠- أفضل الناس مؤمن بين كريمين.

(صحيح) ( طب ) عن كعب بن مالك .

**٥٦٨٠- چاكترین كەس بڕوادارێكە لەنێوان باوك و دایكێكی بەخشندەدا.**

(الصحيحة ١٥٠٥)

٥٦٨١- أكرم الناس أتقاهم.

(صحيح) ( طب ) عن كعب بن مالك .

**٥٦٨١- بەخشندەترین كەس پارێزكارترینیانە.**

(الصحيحة ٣٩٩٦)

## بابەتی بەرد هاوێشتن بەی پەنجە

٥٦٨٢- إياكم و الخذف فإنها تكسر السن و تفقأ العين و لا تنكي العدو.

(صحيح) ( طب ) عن عبدالله بن مغفل .

**٥٦٨٢- نەكەن بەرد بە پەنجە بهاوێژن[1]، چونكە ددان دەشكێنێ و، چاو كوێر دەكات و، دوژمنيش نابەزێنێ.**

(المشكاة ٣٥١٦)

## با بەتى چوون بۆ لاى ئافرەتان

٥٦٨٣- إياكم و الدخول على النساء.

(صحيح) ( حم ق ت ) عن عقبة بن عامر .

**٥٦٨٣- نەكەن بچن بۆ لاى ئافرەتان[2].**

(غاية المرام ١٨٠)

٥٦٨٤- لا يدخلن رجل بعد يومي هذا على مغيبة إلا و معه رجل أو اثنان.

(صحيح) ( حم م ) عن ابن عمر.

**٥٦٨٤- لە پاش ئەمرۆ كەسێك نەبينم بچێتە لاى ئافرەتێك پياوەكەى لەلاى نەبێت، مەگەر پياوێك يان دووانى ترى لەگەڵ بێت[3].**

(الصحيحة ٣٠٨٦)

## بابەتى جل داكەندنى ئافرەت لە جێگايەك جگە لەماڵى مێردەكەى

٥٦٨٥- أيما امرأة نزعت ثيابها في غير بيتها خرق الله عز و جل عنها ستره.

(صحيح) ( حم طب ك هب ) عن أم سلمة .

---

[1] واتە: بەردى بچووك ، يان ناوك بخەيتە نێو پەنجەكانت بە پەلە پيتكە بيهاوێژيت.

[2] واتە: بەردى بچووك ، يان ناوك بخەيتە نێو پەنجەكانت بە پەلە پيتكە بيهاوێژيت واتە ئەگەر ئافرەتەكە بێگانە بوو بە تەنياش بوو.

[3] قورتوبى دەڵێت: بۆيە فەرموويەتى يەك پياو يان دوو پياو ، چونكە بەومندە گومان لادەچێت ، بەڵام لەم سەردەمەدا بە كۆمەڵێكى زۆر ئينجا گومان لا دەچێت ، چونكە خرا پە زۆر بووە.

* منيش دەڵێم: ئێمە چى بڵێين لەم سەردەمە ئەگەر قورتوبى پێش نزيكەى هەشت سەد ساڵ پێش ئێستا واى وتبێت. (وەرگێڕ).

**٥٦٨٥- هەر ئافرەتێك جلەكانی دابكەنێت لە جێگایەكدا جگە لەماڵی مێردەكەی، خـوای گەورە پەردەی لەسەر هەڵدەماڵێ.**

(الترغيب ١٧١)

٥٦٨٦- أيما امرأة وضعت ثيابها في غير بيت زوجها فقد هتكت ستر ما بينها و بين الله عز و جل.

(صحيح) ( حم ه ك ) عن عائشة .

**٥٦٨٦- هەر ئافرەتێك جلەكانی دابنێت لە هەر شوێنێكدا جگە لەماڵی مێردەكـەی، ئـەو پەردەی نێوان خۆی و خوای گەورە ئەتك كردووە.**

(الترغيب ٣٧٥٠)

٥٦٨٧- ما من امرأة تخلع ثيابها في غير بيتها إلا هتكت ما بينها و بين الله.

(صحيح) ( د ت ) عن عائشة.

**٥٦٨٧- هەر ئافرەتێـك جلـەكانی لـە جێگایەكـدا داكـەنێت، جگـە لـەماڵی مێردەكـەی، هەڵساوە بەئەتككردنی ئەوەی لەنێوان خۆی و خوای گەورە هەیە.**

(الصحيحة ٣٤٤٢)

## بـابەتـی ئەوەی دەربـارەی زەنگ هـاتووە

٥٦٨٨- الجرس مزامير الشيطان.

(صحيح) ( حم م د ) عن أبي هريرة .

**٥٦٨٨- زەنگ بلوێری شەیتانە.**

(المشكاة ٣٨٩٥)

٥٦٨٩- الركب الذي معهم الجُلْجُلْ لا تصحبهم الملائكة.

(صحيح) ( الحاكم في الكنى ) عن ابن عمر.

**٥٦٨٩- ئەو كاروانەی زەنگیان لەگەڵدا بێت، فریشتە هاوڕێیەتیان ناكەن.**

(الصحيحة ١٦٧٣)

٥٦٩٠- لا تدخل الملائكة بيتا فيه جرس.

(صحيح) ( د ) عن عائشة.

**٥٦٩٠- فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە زەنگی تیا بێت.**

(الترغيب ٣١٢٠)

٥٦٩١- لا تدخل الملائكة بيتا فيه جرس و لا تصحب ركبا فيه جرس.

(صحيح) ( ن ) عن أم سلمة.

**٥٦٩١- فریشتە ناچنە ماڵێکەوە زەنگی تیا بێت، هاوڕێیەتی کاروانێکیش ناکەن زەنگی تیا بێت.**

(الترغيب ٣١٢٠)

٥٦٩٢- لا تصحب الملائكة رفقة فيها جرس.

(صحيح) ( حم د ) عن أم حبيبة.

**٥٦٩٢- فریشتەکان هاوڕێیەتی کەسانێك ناکەن زەنگیان پێ بێت.**

(الصحيحة ١٨٧٣)

٥٦٩٣- لا تصحب الملائكة رفقة فيها جُلْجُلْ.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عمر.

**٥٦٩٣- فریشتەکان هاوڕێیەتی کەسانێك ناکەن زەنگیان پێ بێت.**

(الصحيحة ١٨٧٣)

٥٦٩٤- لا تصحب الملائكة رفقة فيها كلب و لا جرس.

(صحيح) ( حم م د ت ) عن أبي هريرة.

**٥٦٩٤- فریشتەکان هاوڕێیەتی کەسانێك ناکەن سەگ[١]، و زەنگیان پێ بێت.**

(الصحيحة ١٨٧٣)

## بابەتی ئامێرەکانی بەزم و ڕەزم

٥٦٩٥- صوتان ملعونان في الدنيا و الآخرة: مزمار عند نعمة و رنة عند مصيبة .

(صحيح) ( البزار الضياء ) عن أنس.

**٥٦٩٥- دوو دەنگ هەیە لەدونیا و لە قیامەتدا نەفرینیان لێکراوە ، بلوێرونەی لە کاتی بەهرەدا و، بالۆرەش لەکاتی کارەساتدا.**

(الصحيحة ٤٢٧)

[١] مەبەست سەگێکە کە بۆ جوانی بێت و هیچ دەوری نەبێت ، ئەگەر نا سەگی پاس و ڕاو ....دروستە.

٥٦٩٦- في هذه الأمة خسف و مسخ و قذف إذا ظهرت القيان و المعازف و شربت الخمور.

(صحيح) ( ت ) عن عمران بن حصين.

**٥٦٩٦- لەم ئوممەتەدا ڕۆچوون و، شێواندن و[1]، بەردباران و(٢)[2] ڕوو دەدات، کاتێک ئافرەتی گۆرانی بێژ و، ئامێری ژەندن پەیدا ببێت و، ئارەق بخورێتەوە.**

(الصحيحة ٢٢٠٣)

٥٦٩٧- لم أنه عن البكاء إنما نهيت عن صوتين أحمقين فاجرين صوت عند نغمة مزمار شيطان و لعب و صوت عند مصيبة خمش وجوه و شق جيوب و رنة شيطان و إنما هذه رحمة.

(صحيح) ( ت ) عن جابر.

**٥٦٩٧- من گریانم قەدەغە نەکردووە، بەڵکو دوو دەنگی گەمژەی خراپەم قەدەغە کردووە، دەنگێک لەکاتی بلوێری شەیتان و گاڵتە و گەپ دا بێت، دەنگێکیش لە کاتی کارەساتدا بێت، ڕووشاندنی ڕوومەت و یەخە دادڕین و بالۆرەی شەیتان، بەلام ئەم گریانە میهرەبانییە.**

(الصحيحة ٢١٥٧)

٥٦٩٨- ليبيتن أقوام من أمتي على أكل و لهو و لعب ثم ليصبحن قردة و خنازير.

(صحيح) ( طب ) عن أبي أمامة.

**٥٦٩٨- کەسانێک لە ئوممەتم شەو بەسەر دەبەن لە خواردنەوە و گاڵتە و گەپ، ئینجا کە ڕۆژیان لێ دەبێتەوە ، دەبنە مەیموون و بەراز.**

(الصحيحة ١٦٠٤)

٥٦٩٩- ليكونن في أمتي أقوام يستحلون الخز و الحرير و الخمر و المعازف و لينزلن أقوام إلى جنب علم تروح عليهم سارحتهم فيأتيهم آت لحاجته فيقولون له: ارجع إلينا غدا فيبعثهم الله و يقع العلم عليهم و يمسخ منهم آخرين قردة و خنازير إلى يوم القيامة.

(صحيح) ( خ د ) عن أبي عامر وأبي مالك الأشعري.

**٥٦٩٩- کەسانێک لە ئوممەتم پەیدا دەبن، ئاوریشم و مەی و مۆسیقاژەنین بەڕەوا دەزانن، کەسانێکیش دەچنە لای شاخێک، مەڕ و ماڵاتەکانیان لەلای خۆیاندایە و،**

---

[1] واتە شێواندنی هەندێ ئادەمیزادەکان بۆ وێنەی ئاژەڵ.

[2] لە ڕووی ئاسمانەوە .

**كەسێك دێتە لایان بۆ پێویستیەكی خۆی، پێی دەڵێن: سبەی وەرەوە بۆ لامان، بەڵام بۆ سبەی شاخەكە دەڕمێت بەسەریاندا و، هەندێكیشیان دەشێوێنرێن بۆ وێنەی مەیموون و بەراز تا ڕۆژی قیامەت.**

(الصحيحة ٩١)

٥٧٠٠- ليكونن في هذه الأمة خسف و قذف و مسخ و ذلك إذا شربوا الخمور و اتخذوا القينات و ضربوا بالمعازف.

(صحيح) ( ابن أبي الدنيا في ذم الملاهي ) عن أنس.

**٥٧٠٠- بێگومان لەم ئوممەتەدا ڕۆچوون و بەردباران و، شێواندن ، دروست دەبێت، كاتێك ئارەق بخۆن و ، ئافرەتی گۆانی بێژ لای خۆیان دابنێن و، ئامێری مۆسیقا ژەنین بەكاربهێنن[1].**

(المشكاة ٤٨٠٦)

## بابەتی سرودی لێخوڕینی ڕەوە و ووشتر

٥٧٠١- يا أنجشة ! رويدك سوقك بالقوارير.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن أنس.

**٥٧٠١- ئەی ئەنجەشە! لەسەرخۆ شوشە ناسكەكان لێخوڕە[2].**

(المشكاة ٤٨٠٦)

## بابەتی تەنیایی

٥٧٠٢- الراكب شيطان و الراكبان شيطانان و الثلاثة ركب.

(صحيح) ( حم د ت ك ) عن ابن عمرو.

**٥٧٠٢- یەك سوار شەیتانێكە و[3]، دوو سوار دوو شەیتانن و، سێ سوار كاروانن.**

(الصحيحة ٦٢)

---

[1] مەناوی لە ( ابن القيم )ەوە دەگێڕێتەوە: ئەوە لەم فەرموودەیە وەردەگرێت ئەم شتانە لەم ئوممەتە ڕوودەدەن و ، ئەو ئامرازانە قەدەغەن و ، ئەگەر ڕەوا بوایەن ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سەرزەنشتی نەدەكردلەسەری.

[2] مەبەست لەوە ئافرەتانە بە هۆی لاوازی و ناسكییانەوە.

[3] مەناوی دەڵێت: واتە شەیتان وەكو دز و دڕندە تەماع لە یەك كەس دەكات ، بۆیە ئەگەر بە تەنها ڕۆیشت خۆی ڕووبەڕوی شەیتان دەكاتەوە و خۆیشی وەكو شەیتان لێ كراوە بەو كارەی.

٥٧٠٣- لو يعلم الناس من الوحدة ما أعلم ما سار راكب بليل وحده.

(صحيح) ( حم خ ت ه ) عن ابن عمر.

**٥٧٠٣- ئەگەر خەڵكی ئەوەیان بزانیبا من دەیزانم دەربارەی تەنیایی، سوارێك هەرگیز شەو بە تەنها دەرنەدەچوو.**

(الصحيحة ٦١)

٥٧٠٤- الواحد شيطان و الاثنان شيطانان و الثلاثة ركب.

(صحيح) ( ك ) عن أبي هريرة.

**٥٧٠٤- یەك كەس شەیتانێكە ، دوو كەس دوو شەیتانن و، سێ كەس كاروانن.**

(الصحيحة ٦٢)

## بابەتی بە پەلە گەڕانەوە بۆ لای كەس و كار

٥٧٠٥- السفر قطعة من العذاب يمنع أحدكم طعامه و شرابه و نومه فإذا قضى أحدكم نهمته من وجهه فليعجل الرجوع إلى أهله.

(صحيح) ( مالك حم ق ه ) عن أبي هريرة.

**٥٧٠٥- گەشت بەشێكە لە سزا، خواردن و خواردنەوە و خەوتان لێ قەدەغە دەكات، بۆیە كاتێك كەسێكتان كارەكەی تەواو دەبێت با خێرا بگەڕێتەوە لای ماڵ و منداڵەكەی خۆی.**

(الروض ٧٧٤)

## بابەتی پاككردنەوەی گۆڕەپانەكان

٥٧٠٦- طيبوا ساحاتكم فإن أنتن الساحات ساحات اليهود .

(صحيح) ( طس ) عن سعد.

**٥٧٠٦- حەوشە و بەرماڵەكانتان پاككەنەوە، چونكە بۆگەن ترین شوێن بەرحەوشەی جولەكەكانە.**

(الصحيحة ٢٣٦)

## بابەتی هەڵواسینی قامچی لە ناو ماڵدا

٥٧٠٧- علقوا السوط حيث يراه أهل البيت .

(صحيح) ( حل ) عن ابن عمر.

**٥٧٠٧- قامچی لەجێگایەکدا هەڵواسن تا خانەوادە بینن**[1].

(الصحيحة ١٤٤٦)

٥٧٠٨- علقوا السوط حيث يراه أهل البيت فإنه أدب لهم .

(صحيح) ( عب طب ) عن ابن عباس.

**٥٧٠٨- بە شێوەیەك قامچی هەڵواسن خەڵکی خانەوادە ببینن، چونکە ئەوە تەمێ کردنە بۆیان.**

(الصحيحة ١٤٤٧)

## بابەتی ئەوەی دەربارەی تاوڵ هاتووە

٥٧٠٩- من لعب بالنردشير فكأنما غمس يده في لحم الخنزير و دمه.

(صحيح) ( حم م د ه ) عن بريدة.

**٥٧٠٩- هەرکەسێك بە تاوڵە یاری بکات، وەکو ئەوەیە دەستی نگرۆکردبێت لە گۆشت و خوێنی بەرازدا.**

(الارواء ٢٦٥٧)

٥٧١٠- من لعب بالنرد فقد عصى الله و رسوله.

(صحيح) ( حم د ه ك ) عن أبي موسى.

**٥٧١٠- هەرکەسێك یاری بە تاوڵە بکات، سەرپێچی فەرمانی خوا و پێغەمبەری کردووە.**

(الارواء ٢٦٥٧)

---

[1] بۆ ئەوەی بترسن و کاری نابەجێ ئەنجام نەدەن.

## بابەتی چوونە لای ئەشکە نجەدراوەکان

٥٧١١- لا تدخلوا على هؤلاء المعذبين إلا أن تكونوا باكين فإن لم تكونوا باكين فلا تدخلوا عليهم لا يصيبكم ما أصابهم.

(صحيح) ( حم ق ) عن ابن عمر.

**٥٧١١- مەچنە لای ئەو ئەشکە نجە دراوانە مەگەر بەگریانەوە ، ئەگەر نەگریان مەچنە شوێنەکانیان نەوەك ئێوەیش بە دەردی ئەوان بچن.**

(الصحيحة ١٩)

## بابەتی ئەوەی هاتووە دەربارەی گفتوگۆی شەو

٥٧١٢- لا سمر إلا لمصل أو مسافر.

(صحيح) ( حم ) عن ابن مسعود.

**٥٧١٢- گفتوگۆی شەو دروست نییە مەگەر بۆ شەو نوێژکار یان گەشتیار.**

(الصحيحة ٢٤٣٥)

## بابەتی ستایشکردن

٥٧١٣- إذا أتى الرجل القوم فقالوا له: مرحبا فمرحبا به يوم القيامة يوم يلقى ربه و إذا أتى الرجل القوم فقالوا له: قحطا فقحطا له يوم القيامة.

(صحيح) ( طب ك ) عن الضحاك بن قيس .

**٥٧١٣- ئەگەر یەکێك چوو بۆ لای کەسانێك و پێیان ووت: بەخێر هاتی، لە ڕۆژی قیامەتیشدا لەلای خوای خۆی بە خێر هاتن دەکرێت، ئەگەر بچێت و، پێی بڵێن: بەنەهامەتی هاتی، لە ڕۆژی قیامەت تووشی نەهامەتی دەبێت.**

(الصحيحة ١١٨٩)

٥٧١٤- إذا أثنى عليك جيرانك أنك محسن فأنت محسن و إذا أثنى عليك جيرانك أنك مسيء فأنت مسي.

(صحيح) ( ابن عساكر ) عن ابن مسعود .

**٥٧١٤- ئەگەر دراوسێکانت ستایشی چاکیان کردی کە تۆ چاکەکاری، کەواتە تۆ چاکەکاری، ئەگەریش پێشیان ووتی خراپەکاری، کەواتە خراپەکاری.**

(المشكاة ٤٩٨٨)

٥٧١٥- إذا سمعت جيرانك يقولون: قد أحسنت فقد أحسنت و إذا سمعتهم يقولون: قد أسأت فقد أسأت.

(صحيح) ( حم ه طب ) عن ابن مسعود (صحيح) ( ه ) عن كلثوم الخزاعي .

**٥٧١٥- ئەگەر گوێت لە دراوسێکانت بوو دەیانووت: چاکت کرد، کەواتە چاکت کردوە، ئەگەر گوێشت لێ بوو وتیان خراپت کرد کەواتە خراپت کردوە.**

(الصحيحة ١٣٢٧)

٥٧١٦- أهل الجنة من ملأ الله تعالى أذنيه من ثناء الناس خيرا و هو يسمع و أهل النار من ملأ الله تعالى أذنيه من ثناء الناس شرا و هو يسمع.

(صحيح) ( ه ) عن ابن عباس .

**٥٧١٦- بەهەشتی ئەو کەسەیە خوای گەورە گوێی پڕ کردووە لە ستاشی چاکەی خەڵکی و خۆیشی گوێی لێیە، دۆزەخیش ئەو کەسەیە خوای گەورە گوێی پڕ کردووە لە باسکردنی خراپەی خەڵکی و خۆیشی گوێی لێیە.**

(الصحيحة ١٧٤٠)

٥٧١٧- ما من عبد إلا و له صيت في السماء فإن كان صيته في السماء حسنا وضع في الأرض و إن كان صيته في السماء سيئا وضع في الأرض.

(صحيح) ( البزار ) عن أبي هريرة.

**٥٧١٧- هەموو بەندەیەك ناوبانگێکی هەیە لە ئاسماندا، جا ئەگەر ناوبانگەکەی لە ئاسمان چاك بێت بۆی لەسەر زەویشدا بۆی دەچەسپێ، ئەگەر ناوبانگەکەشی خراپ بوو لە ئاسمان لەسەر زەویش ئەو ناوبلنگەی بۆ دادەنرێت.**

(الصحيحة ٢٢٧٥)

٥٧١٨- ما من مسلم يشهد له ثلاثة إلا وجبت له الجنة قيل و اثنان ؟ قال: و اثنان.

(صحيح) ( ت ) عن عمر.

**٥٧١٨- هەر موسڵمانێك سێ کەس شایەتی چاکەی بۆ بدەن، بەهەشتی مسۆگەر دەبێت، ووتیان: ئەی دوو کەس؟ فەرمووی: دوو کەسیش.**

(الجنائز ٤٥)

٥٧١٩- من أثنيتم عليه خيرا وجبت له الجنة و من أثنيتم عليه شرا وجبت له النار أنتم شهداء الله في الأرض.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن أنس.

**٥٧١٩- هەرکەسێك ستایشی چاکەی بکەن بەهەشتی مسۆگەرە، هەرکەسێش باسی بە خراپەیدا هەڵبهێنن دۆزەخی مسۆگەرە، ئێوە شایەتی خوای گەورەن لەسەر زەویدا[1].**

٥٧٢٠- وجبت أنتم شهداء في الأرض.

(صحيح) ( ت ه حب ) عن أنس ( حم ه حب ) عن أبي هريرة.

**٥٧٢٠- بۆ مسۆگەر بوو بوو ، ئێوە شایەتەکانی خوای گەورەن لەسەر زەوی.**

(الجنائز ٤٤)

## بابەتی گلەییکردن

٥٧٢١- كان إذا بلغه عن الرجل شيء لم يقل: ما بال فلان يقول ؟ و لكن يقول: ما بال أقوام يقولون كذا و كذا.

(صحيح) ( د ) عن عائشة.

**٥٧٢١- ئەگەر هەواڵێکی پێ بگەیشتایە دەربارەی کەسێك نەیدەفەرموو: ئەوە چییە فلان کەس ئاوا دەڵێ؟ بەڵکو دەیفەرموو: ئەوە چییانە کەسانێك ئاو هاو ئاوها دەڵێن.**

(الصحيحة ٢٠٦٤)

٥٧٢٢- كان يقول لأحدهم عند المعاتبة: ما له ترب جبينه ؟.

(صحيح) ( حم خ ) عن أنس.

**٥٧٢٢- کە گلەیی لە کەسێك بردایە دەیفەرموو: ئەوە چی یەتی هەی ناوچەوانی خۆڵاوی بێت.**

(المشكاة ٥٨١١)

---

[1] **مەناوی دەڵێت: هەندێ لە زانایان دەڵێن: مەبەست لە هاوەڵانە نەك کەسانی تر.**

# بابەتی ئامۆژگاری و دڵسۆزی

٥٧٢٣- إن الدين النصيحة لله و لكتابه و لرسوله و لأئمة المسلمين و عامتهم.

(صحيح) ( حم م د ن ) عن تميم الداري ( ت ن ) عن أبي هريرة ( حم ) عن ابن عباس .

**٥٧٢٣- ئایین دڵسۆزییە[١] بۆ خوا و[٢]، پەڕاوەکەی و[٣]، پێغەمبەرەکەی و[٤]، پێشەوای[٥] موسڵمانان و، سەرجەم موسڵمانان[٦].**

(غاية المرام ٨٢٨)

٥٧٢٤- إنما الدين النصح.

(صحيح) ( أبو الشيخ في التوبيخ ) عن ابن عمر .

**٥٧٢٤- ئایین تەنها و تەنها دڵسۆزییە.**

(الارواء ٢٥)

٥٧٢٥- دعوا الناس يصيب بعضهم من بعض فإذا استنصح أحدكم أخاه فلينصحه.

(صحيح) ( طب ) عن أبي السائب .

**٥٧٢٥- لە خەڵکی گەڕێن با سوود بەیەکتر بگەیەنن[٧]، ئەگەر کەسێکیشتان داوای ئامۆژگاری لە براکەی کرد با ئامۆژگاری بکات.**

(الصحيحة ١٨٢٥)

٥٧٢٦- الدين النصيحة.

(صحيح) ( تخ ) عن ثوبان ( البزار ) عن ابن عمر .

---

[١] النصحة بە دوو واتا دێت ،أ/ دڵسۆزی ، ب/ئامۆژگاری.

[٢] مەناوی دەڵێت : بە باوەڕ پێهێنانی و هاوبەش بۆ پەیدانەکردنی و ستایشکردنی بە هەموو سیفەتەکانی گەورەیی و مەزنی و گوێڕایەڵی کردنی و خۆشەویستی و ڕق لێبوون لە پێناوی ئەودا.

[٣] بە کارکردن بە حوکمەکانی.

[٤] بە باوەڕهێنان بە ئایینەکەی و پشگیری کردنی بە زیندوویی و مردوویی و بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەی .

[٥] بە هاوکاریکردنیان لەسەر هەق و ڕاستی و گوێڕایەڵی کردنیان و ، یاد خستنەوەیان بە نەرم و نیانی و دەرنەچوون لە فەرمانیان.

[٦] بە ئامۆژگاری کردنیان و فێرکردنیان بەوەی چاکە بۆ دونیا و دواڕۆژیان.

[٧] واتە : بژێوی یەکتری دابین بکەن لە نێوان خۆیان و لە بازرگانیدا و ، وازهێنان لە نرخدانان لە کاتی خراپ بوونی بارودۆخ نەبێت.

**٥٧٢٦- ئـايين دڵسۆزييه.**

(الارواء ٢٦)

٥٧٢٧- المستشار مؤتمن.

(صحيح) ( ٤ ) عن أبي هريرة ( ت ) عن أم سلمة ( ه ) عن ابن مسعود.

**٥٧٢٧- ڕاوێژ پێكراو پێويسته ئەمين و ڕاستگۆ بێت كه ڕاوێژى پێ كرا.**

(الصحيحة ١٦٤١)

## بابەتى سوبعەت كردن

٥٧٢٨- إني لأمزح و لا أقول إلا حقا.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عمر ( خط ) عن أنس.

**٥٧٢٨- بەڕاستى من گاڵته ناكەم و قسەش ڕاست نەبێت نايڵێم.**

(المشكاة ٤٨٨٥)

٥٧٢٩- إني و إن داعبتكم فلا أقول إلا حقا.

(صحيح) ( حم ت ) عن أبي هريرة.

**٥٧٢٩- من ئەگەر چى شۆخيتان لەگەڵ دەكەم، بەڵام قسەى ڕاست نەبێت نايكەم.**

(الصحيحة ١٧٢٦)

٥٧٣٠- خذوا يا بني أرفدة حتى تعلم اليهود و النصارى أن في ديننا فسحة.

(صحيح) ( أبو عبيدة في الغريب الخرائطي في اعتلال القلوب ) عن الشعبي مرسلا.

**٥٧٣٠- وەرگرن ئەى نەوەى ئەرفەدە[1]، تاكو جولەكه و گاورەكان بزانن كه ئايينى ئێمه فراوانى تيايه[2].**

(الصحيحة ١٨٢٩)

٥٧٣١- كان يلاعب زينب بنت أم سلمة و يقول: يا زوينب ! يا زوينب ! مرارا.

(صحيح) ( الضياء ) عن أنس.

---

[1] **واته: له يارييەكەتاندا ، كاتێك بينينى به مەتاڵ و ڕمەكانيان يارى دەكرد، ئەرفەدە نازناوى حەبەشيەكانه.**

[2] **مەناوى دەڵێت هەندێك له سۆفيەكان ئەمەيان كردووه به بەڵگه لەسەر دروستبوونى هەڵپەركێ و گوێگرتن له مۆسيقا ، (ابن حجر) دەڵێت: جەماوەرى زانايان، ئەوەيان ڕەتكردوەتەوه ، چونكه يارى حەبەشيەكان به ڕمەكانيان بۆ مەشق كردن بوو لەسەر جەنگ ، بۆيه نابێته بەڵگه بۆ سەما و گاڵته و گەپ و هەڵپەركێ.**

**٥٧٣١- پێغەمبەر(ﷺ) یاری دەكرد لەگەڵ زەینەبی كچی ئومموسەلەمەی خێزانی وە چەند جار پێی دەفەرموو: هۆ زەینەبۆكە هۆ هۆ زەینەبۆكە.**

(الصحيحة ٢١٤١)

٥٧٣٢- لو أنكم إذا خرجتم من عندي تكونون على الحال الذي تكونون عليه لصافحتكم الملائكة بطرق المدينة.

(صحيح) ( ع ) عن أنس.

**٥٧٣٢- ئەگەر ئەو كاتەی لەلای من دەردەچن، لەسەر هەمان حاڵ بمێننەوە، فریشتە لە ڕێگەكانی مەدینە تەوقەتان لەگەڵ دەكەن.**

(الصحيحة ١٩٦٥)

٥٧٣٣- و هل تلد الإبل إلا النوق.

(صحيح) ( حم د ت ) عن أنس.

**٥٧٣٣- ئایا ووشتر هەر بەچكە ووشتری نابێت[1].**

(المشكاة ٤٨٨٦)

٥٧٣٤- لا يأخذن أحدكم متاع صاحبه لاعبا و لا جادا و إن أخذ عصا صاحبه فليردها عليه.

(صحيح) ( حم د ت ك ) عن السائب بن يزيد.

**٥٧٣٤- با كەستان كەل و پەلی هاوڕێكەی نەبات نەبەگاڵتە و نەبەڕاست، ئەگەر گۆچانێكی هاوڕێكەشی برد با بیداتەوە.**

(الارواء ١٥١٦)

٥٧٣٥- لا يحل لمسلم أن يروع مسلما.

(صحيح) ( حم د ) عن رجال.

**٥٧٣٥- ڕەوا نییە بۆ هیچ موسڵمانێك موسڵمانێكی تر بترسێنێ.**

(الترغيب ٢١٨٥)

٥٧٣٦- يا أبا عمير ! ما فعل النغير ؟.

(صحيح) ( حم خ ت ن ه ) عن أنس.

---

[1] **كابرایەك داوای كرد پێغەمبەر (ﷺ) سواری بكات ، ئەویش فەرمووی: باشە سوار بەچكە ووشترێكت دەكەم، پیاوەكە ووتی: چی لە بەچكە ووشتر بكەم، ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) وایفەرموو.**

**٥٧٣٦- ئەی ئەبو عومەیر! چۆلەکەکە چی بەسەر هات.**

(المشكاة ٤٨٨٤)

٥٧٣٧- يا ذا الأذنين !.

(صحيح) ( حم د ت ) عن أنس.

**٥٧٣٧- ئەی خاوەنی دوو گوێچکە!**

(المشكاة ٤٨٨٧)

## بابەتی پێکەنین

٥٧٣٨- يا أبا هريرة ! كن ورعا تكن من أعبد الناس و ارض بما قسم الله لك تكن من أغنى الناس و أحب للمسلمين و المؤمنين ما تحب لنفسك و أهل بيتك و اكره لهم ما تكره لنفسك و أهل بيتك تكن مؤمنا و جاور من جاورت بإحسان تكن مسلما و إياك و كثرة الضحك فإن كثرة الضحك فساد القلب.

(صحيح) ( ه ) عن أبي هريرة.

**٥٧٣٨- ئەی ئەبو هورەیرە! لە خوا بترسە دەبیتە خوا پەرسترین کەس، ڕازی بە بەوەی خوای گەورە پێی بەخشیوی دەبیتە دەوڵەمەندترین کەس، ئەوەشی بۆ خۆت وماڵ و منداڵەکەت حەزی پێ دەکەیت، بۆ موسڵمانان و ئیمانداریش پێت خۆش بێت، ئەوەشی بۆ خۆت و منداڵەکەت پێت ناخۆشە بۆ ئەوانیش پێت ناخۆش بێت، دەبێتە ئیماندار، دراوسێتی هەرکەسیشت کرد بە چاکی و جوانی دراوسێیەتی بکە دەبێتە موسڵمان و، نەکەی زۆر پێبکەنیت چونکە زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێ.**

(الصحيحة ٩٢٧)

٥٧٣٩- نهى عن الضحك من الضرطة.

(صحيح) ( طس ) عن جابر.

**٥٧٣٩- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردووە کەسێك بە دەنگی تڕ پێکەنێت.**

(المشكاة ٣٢٤٢)

٥٧٤٠- ويل للذي يحدث فيكذب ليضحك به القوم ويل له ويل له.

(صحيح) ( حم د ت ك ) عن معاوية بن حيدة.

**٥٧٤٠- واوەیلا بۆ ئەو کەسە درۆ دەکات بۆ ئەوەی خەڵکی پێکەنن، واوەیلا بـۆ ئـەو کەسـە واوەیلا بۆ ئەو کەسە.**

(المشكاة ٤٨٣٨)

٥٧٤١- لا تكثر الضحك فإن كثرة الضحك تميت القلب.

(صحيح) ( ه ) عن أبي هريرة.

**٥٧٤١- زۆر پێ مەکەنە، چونکە بەڕاستی پێکەنینی زۆر دڵ دەمرێنێ.**

(الصحيحة ٥٠٥)

٥٧٤٢- اتق المحارم تكن أعبد الناس و ارض بما قسم الله لك تكـن أغنـى النـاس و أحسن إلى جارك تكن مؤمنا و أحب للناس ما تحب لنفسك تكـن مـسلما و لا تكثـر الـضحك فـإن كثـرة الضحك تميت القلب.

(صحيح) ( حم ت هب ) عن أبي هريرة .

**٥٧٤٢- لە قەدەغەکراوەکان خۆت بپارێزە دەبیتـە خـوا پەرسـترین کـەس، ئەوەشـی خـوا پێی بەخشیوی پێی ڕازییە بە دەبیتە دەوڵەمەندترین کەس، چاکەش لەگەڵ دراوسێکەت بکە دەبیتە باوەڕدار، ئەوەشی بۆ خۆت پێت خۆشە بـۆ خـەڵکی پێـت خـۆش بێـت دەبیتـە موسڵمان، زۆریش پێ مەکەنە، چونکە زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێ.**

(الصحيحة ٥٠٥)

## بابەتی ناوەکان

٥٧٤٣- أحب الأسماء إلى الله عبد الله و عبد الرحمن.

(صحيح) ( م د ت ه ) عن ابن عمر .

**٥٧٤٣- خۆشەویست ترین ناو بەلای خوای گەورەوە ( عبدالله ) و ( عبدالرحمن )ە.**

(الصحيحة ٩٠٤)

٥٧٤٤- أحب الأسماء إلى الله عبد الله و عبد الرحمن و الحارث.

(صحيح) ( ع ) عن أنس .

**٥٧٤٤-خۆشەویست ترین ناو بەلای خوای گەورەوە ( عبدالله ) و( عبدالرحمن ) و ( الحارث )ە.**

(الصحيحة ٩٠٤)

٥٧٤٥- .........و أحب الأسماء إلى الله تعالى عبد الله و عبد الرحمن و أصدقها حارث و همام و أقبحها حرب و مرة.

(صحيح) ( خد د ن ) عن أبي وهب الجشمي.

**٥٧٤٥- خۆشترین ناو بەلای خوای گەورەوە ( عبدالله ) و ( عبدالرحمن )ە، ڕاستترینیشیان ( حارث ) و ( همام ) و ، ناشرینترینیشیان ( حرب ) و ( مُرَّه ) یە.**

(الارواء ١١٧٨)

٥٧٤٦- سموه بأحب الأسماء إلي: حمزة.

(صحيح) ( ك ) عن جابر.

**٥٧٤٦- ناوی بنێن[1] بەخۆشترین ناو بەلای منەوە: حەمزە[2].**

(الصحيحة ٢٨٧٨)

٥٧٤٧- أحرج اسم عند الله يوم القيامة رجل يسمى: ملك الأملاك.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة .

**٥٧٤٧- ناشرینترین ناو لەلای خوا لەڕۆژی قیامەتدا، پیاوێکە پێی دەوترێت: پادشای پادشاکان[3].**

(الصحيحة ٩١٥)

٥٧٤٨- أخنع الأسماء عند الله يوم القيامة رجل تسمى ملك الأملاك لا مالك إلا الله.

(صحيح) ( ق د ت ) عن أبي هريرة .

**٥٧٤٨- ناشرینترین ناو لەلای خوا لەڕۆژی قیامەتدا، پیاوێکە ناوی خۆی ناوە پادشای پادشاکان، خاوەندرییەتی تەنها بۆ خوایە..**

(الصحيحة ١٩١٢)

---

[1] واتە: ئەو منداڵەی لە دایك بووە.

[2] مامۆستامان دەڵێ ئەمە پێش ئەوە بووە پێغەمبەر ( ﷺ ) وەحیی بۆ دادەبەزێت کە باشترین ناو بە لای خواوە . ( عبدالله ) و ( عبدالرحمن )ە.

[3] مەناوی دەڵێت: (ابن ابي جمرة) ووتوویەتی : هەمان حوکمی هەیە بە کەسێك بوترێت (قاضي القضاة) دادوەری داوەرەکان ، ئەگەرچی ئەم نازناوە لە ڕۆژ هەڵاتدا بڵاو بوو ئینجا مەناوی دەڵێت: سەیریش ئەوەیە (العز بن جماعة) باوکی خۆی لە خەونیدا بینی و پرسیاری حاڵی لێکرد و ئەویش ووتی ، هیچ ئەوەندەی ناوەکەم زیانی نەبوو بۆم ، ئیتر ئەویش قەدەغەی کرد پێی بوترێت (قاضي القضاة) بەڵکو پێی بوترێت (قاضي المسلمين)

٥٧٤٩- إذا أبردتم إلي بريدا فابعثوه حسن الوجه حسن الاسم.

(صحيح) ( البزار ) عن بريدة.

**٥٧٤٩- کاتێك ڕەوانە کراوێکم بۆ لا دەنێرن، با ڕووخسار جوان و ناوخۆش بێت.**

(الصحيحة ١١٨٦)

٥٧٥٠- إذا بعثتم إلى رجلا فابعثوه حسن الوجه حسن الاسم.

(صحيح) ( البزار طس ) عن أبي هريرة .

**٥٧٥٠- ئەگەر پیاوێکتان نارد بۆ لام با ڕوخسار جوان و ناوخۆش بێت.**

(الصحيحة ١١٨٦)

٥٧٥١- اشتد غضب الله على من زعم أنه ملك الأملاك لا ملك إلا الله.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة ( الحارث ) عن ابن عباس .

**٥٧٥١- ئەو پەڕی تووڕەیی خوای گەورە لە کەسێکەوە وابزانێ پادشای پادشاکان، موڵك تەنها بۆ خوای گەورەیە.**

(الصحيحة ٩١٥)

٥٧٥٢- أغيظ رجل على الله يوم القيامة و أخبثه و أغيظه عليه رجل كان يسمى ملك الأملاك لا ملك إلا الله.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي هريرة .

**٥٧٥٢- ڕقنترین کەس بەلای خواوە کەسێکە ناوی خۆی نابێت پادشای پادشاکانە، موڵك تەنها بۆ خوای گەورەیە.**

(الصحيحة ٩١٣)

٥٧٥٣- إن عشت إن شاء الله لأنهين أمتي أن يسموا نافعا و أفلح و بركة.

(صحيح) ( د حب ك ) عن جابر .

**٥٧٥٣- ئەگەر ژیام بەویستی خوای گەورە، لەسەر ئوممەتەکەم قەدەغەی دەکەم ناوی ( نافع ) و ( افلح ) و ( برکە ) بنێن لە منداڵەکانیان.**

(الصحيح ابي داود ٤٩٦٠)

٥٧٥٤- إن أحب أسمائكم عند الله: عبد الله و عبد الرحمن.

(صحيح) ( م ) عن ابن عمر .

**٥٧٥٤- بەڕاستى خۆشترين ناوەكانتان لەلای خوای گەورە:( عبدالله ) و ( عبدالرحمن )ە.**

(الارواء ١١٦٢)

٥٧٥٥- تسموا باسمي و لا تكنوا بكنيتي.

(صحيح) ( حم ق ت ه ) عن أنس ( حم ق ه ) عن جابر .

**٥٧٥٥- بەناوی من ناويان بنێت، بەڵام نازناوی منيان بۆ دامەنێن.**

(الصحيحة ٢٩٤٦)

٥٧٥٦- تسموا باسمي و لا تكنوا بكنيتي فإنما أنا أبو القاسم أقسم بينكم.

(صحيح) ( م ) عن جابر .

**٥٧٥٦- بەناوی منيانەوە بكەن، بەڵام نازناوی منيان بۆ دامەنێن، چونكە من ( ابو القاسم ) دابەشدەكەم لە نێوانتاندا.**

(المشكاة ٤٧٥١)

٥٧٥٧- خير أسمائكم عبد الله و عبد الرحمن و الحارث.

(صحيح) ( طب ) عن أبي سبرة .

**٥٧٥٧- چاكترين ناوەكانتان:( عبدالله ) و ( عبدالرحمن ) و ( الحارث )ە.**

(الصحيحة ٩٠١)

٥٧٥٨- سم ابنك عبد الرحمن.

(صحيح) ( م ) عن جابر.

**٥٧٥٨- كوڕەكەت ناو بنێ ( عبدالرحمن )**

(الصحيحة ٢٩٤٦)

٥٧٥٩- سموا باسمي و لا تكنوا بكنيتي.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس.

**٥٧٥٩- بەناوی منەوە ناويان بنێن و، نازناوم بەكارمەهێنن.**

(الصحيحة ٢٩٤٦)

٥٧٦٠- سموا باسمي و لا تكنوا بكنيتي فإني إنما بعثت قاسما أقسم بينكم.

(صحيح) ( ق ) عن جابر.

**٥٧٦٠- ناوم لە خۆتان بنێن و، نازناوم لەخۆتان مەنێن، چونکە من ڕەوانەکراوم وەکو دابەشکەر دابەش بکەم لە نێوانتاندا.**

(المشكاة ٤٧٥١)

٥٧٦١- كان إذا أتاه الرجل و له اسم لا يحبه حوله.

(صحيح) ( ابن مندة ) عن عتبة بن عبد.

**٥٧٦١- کاتێك پیاوێك دەهاتە خزمەت پێغەمبەرو(ﷺ) ناوەکەی بەدڵ نەبوایە دەیگۆڕی[1].**

(الصحيحة ٢٠٩)

٥٧٦٢- كان إذا سمع بالاسم القبيح حوله إلى ما هو أحسن منه.

(صحيح) ( ابن سعد ) عن عروة مرسلا.

**٥٧٦٢- کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) گوێی لەناوێکی ناشیرین دەبوو دەیگۆڕی بۆ ناوێکی خۆشتر.**

(الصحيحة ٥٠٨)

٥٧٦٣- كان يعجبه إذا خرج لحاجته أن يسمع: يا راشد ! يا نجيح !.

(صحيح) ( ت ك ) عن أنس.

**٥٧٦٣- پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك دەردەچوو بۆ پێویستی خۆی، پێی خۆش بوو گوێی لە ئەی (راشد)ئەی (نجیح) بێت!**

(الروض ٨٦)

٥٧٦٤- كان يغير الاسم القبيح.

(صحيح) ( ت ) عن عائشة.

**٥٧٦٤- پێغەمبەر (ﷺ) ناوی ناشرینی دەگۆڕی.**

(الصحيحة ٢٠٧)

٥٧٦٥- لئن عشت إن شاء الله لأنهيهن أن يسمى رباح و نجيح و أفلح و يسار.

(صحيح) ( ه ك ) عن عمر.

**٥٧٦٥- ئەگەر لە ژیاندا مام بە ویستی خوای گەورەدەبێ قەدەغەی بکەم کە ناوی منال بنرێت (نجیح) و (افلح) و (یسار).**

(الصحيحة ٢١٤٣)

---

[1] دەیگۆڕێ بۆ ناوێکی خۆش ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) زۆر گرنگی دەدا بەوەی هەموو کەسێك ناوی خۆشی هەبێت.

٥٧٦٦- لأنهين أن يسمى بنافع و بركة و يسار.

(صحيح) ( ت ) عن عمر.

**٥٧٦٦- دەبێ قەدەغەى بكەم كە ناوى ( نافع ) و ( بركە ) و ( يسار ) بنرێت.**

(الصحيحة ٢١٤٣)

٥٧٦٧- نهى أن يجمع أحد بين اسمه و كنيته.

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة.

**٥٧٦٧- پێغەمبەر ( ﷺ ) قەدەغەى دەكرد كەسێك ناو و نازناوى ئەو لەخۆى بنێت[1].**

(المشكاة ٤٧٦٩)

٥٧٦٨- نهى أن يسمى أربعة أسماء: أفلح و يسارا و نافعا و رباحا.

(صحيح) ( د ه ) عن سمرة.

**٥٧٦٨- پێغەمبەر ( ﷺ ) چوار ناوى قەدەغە دەكرد:( افلح ) و ( يسار ) و ( نافع ) و ( رباح )[2].**

(الترغيب ٤٧٦٩)

٥٧٦٩- لا تجمعوا بين اسمي و كنيتي.

(صحيح) ( حم ) عن عم عبدالرحمن بن أبي عمرة.

**٥٧٦٩- ناو و نازناوەكەم پێكەوە بەكار مەهێنن لە يەك كەسدا.**

(المشكاة ٤٧٦٩)

٥٧٧٠- لا تزكوا أنفسكم الله أعلم بأهل البر منكم سموها زينب.

(صحيح) ( م د ) عن زينب بنت أبي سلمة.

**٥٧٧٠- خۆتان بە پاك و خاوێن دامەنێن، خواى گەورە لە ئێوە چاكتر چاكەكاران دەناسێت، ناوى بنێن زەينەب[3].**

(الصحيحة ٢١٠)

٥٧٧١- لا تسم غلامك رباحا و لا أفلح و لا يسارا و لا نجيحا يقال: أثم هو فيقال لا.

(صحيح) ( د ت ) عن سمرة.

---

[1] واتە : ناوى موحەممەد بێت و ، نازناوى ( أبو القاسم ) بێت.

[2] مەناوى دەڵێت: چونكە لەوانەيە بڵێين ( أفلح ) واتە (سەرفراز) لێرەيە : بڵێين : نەخێر ، بەوەش كەسەكە ڕەش بين بێت.

[3] ئەوان كچەكەيان ناو نابوو ( برە ) واتە : چاك ، يان چاكەكار.

**٥٧٧١- منداڵەكەت ناومەنێ (رباح) و (افلح) و (يسار) و (نجيح)، دوايى دەوترێت، ئورێ لەوێ يە؟ دەڵێن نەخێر.**

(الارواء ١١٦٣)

٥٧٧٢- لا تسم غلامك رباحا و لا يسارا و لا أفلح و لا نافعا.

(صحيح) ( د م ) عن سمرة.

**٥٧٧٢- منداڵەكەت ناومەنێ (رباح) و (افلح) و (يسار) و (نافع).**

(الارواء ١١٦٣)

٥٧٧٣- لا يقولن أحدكم: عبدي و أمتي كلكم عبيد الله و كل نسائكم إماء الله و لكن ليقل: غلامي و جاريتي و فتاي و فتاتي.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة.

**٥٧٧٣- كەستان نەڵێن: كۆيلە و بەندەكەم، هەمووتان بەندەی خوان، هەموو ئافرەتەكانيشتان بەندەی خوان، بەڵكو با بڵێت: خوڵامەكەم و كەنيزەكەكەم، يان كوڕ و كچەكەم.**

(الصحيحة ٨٠٣)

٥٧٧٤- لا يقولن أحدكم: عبدي أو أمتي و لا يقولن المملوك: ربي و ربتي و ليقل المالك: فتاي و فتاتي و ليقل المملوك: سيدي و سيدتي فإنكم المملوكون و الرب الله عز و جل.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة.

**٥٧٧٤- كەستان نەڵێن: بەندە و كۆيلەكەم، ئەوانيش نەڵێن: پەروەردگارم، با خاوەنەكە بڵێت: كوڕ و كچەكەم و، ئەوانيش بڵێن: گەورەكەم، چونكە ئێوە هەمووتان بەندەی خوای گەورەن و، پەروەدگار تەنها خودايە.**

(الصحيحة ٨٠٣)

٥٧٧٥- إنهم كانوا يسمون بأنبيائهم و الصالحين قبلهم.

(صحيح) ( حم م ت ) عن المغيرة .

**٥٧٧٥- ئەوانە ناوی پێغەمبەر و پياوچاكانی پێش خۆيان لە خۆيان دەنا.**

(الصحيحة ٣٥٨٨)

٥٧٧٦- إذا سميتم بي فلا تكنوا بي.

(صحيح) ( ت ) عن جابر .

**٥٧٧٦- ئەگەر ناوی منتان لە خۆتان نا، نازناوی من لەخۆتان مەنێن.**

(المشكاة ٤٧٧٠)

# بابەتی قەدەغە کراوەکان (المناهی)

٥٧٧٧- بئس مطية الرجل زعموا.

(صحيح) ( حم د ) عن حذيفة .

**٥٧٧٧- خراپترین قسەی کەسێك ئەوە بڵێ: وتیان[1].**

(الصحيحة ٨٦٤)

٥٧٧٨- بئسما لأحدكم أن يقول: نسيت آية كيت و كيت بل هو نسي.

(صحيح) ( حم ق ت ن ) عن ابن مسعود .

**٥٧٧٨- خراپترین قسەی کەسێکتان ئەوەیە بڵێ: ئایەتی فلان و فلانم لەبیر چوو، بەڵکو لەبیری برایەوە.**

(المشكاة ٢١٨٨)

٥٧٧٩- قال الله تعالى: شتمني ابن آدم و ما ينبغي له أن يشتمني و كذبني و ما ينبغي له أن يكذبني أما شتمه إياي فقوله: إن لي ولدا و أنا الله الأحد الصمد لم ألد و لم أولد و لم يكن لي كفوا أحد و أما تكذيبه إياي فقوله: ليس يعيدني كما بدأني و ليس أول الخلق بأهون علي من إعادته.

(صحيح) ( حم خ ن ) عن أبي هريرة.

**٥٧٧٩- خوای گەورە دەفەرموێت: ئادەمیزاد جنێوی پێدام و بۆی نییە جنێویشم پێ بدات، بە درۆیشی خستمەوە و، بۆی نییە بە درۆشمخاتەوە، جنێودانەکەی ئەوەیە دەڵێت: من کورم هەیە، منیش خوای تاك و تەنیا و بێ نیازم ، منالم نەبوو، لەکەسیش نەبووم و، هەرگیز هیچ هاوتایەکیشم نەبووە و نابێ، بە درۆخستنەوەکەشی بۆ من ئەوەیە دەڵێت: دروستم ناکاتەوە وەکو سەرەتا دروستی کردوم، ئایا دروستکردنی یەکەم جاریش ئاسانتر نییە بەلامەوە لە دوبارە دروستکردنەوەی.**

٥٧٨٠- قد كنت أكره أن تقولوا: ما شاء الله و شاء محمد و لكن قولوا: ما شاء الله ثم شاء محمد.

(صحيح) ( الحكيم ن الضياء ) عن حذيفة.

---

[1] مەناوی دەڵێت مەبەست لە قەدەغەکردنی ووتی یە.

**٥٧٨٠- من پێم ناخۆشه بڵێن: ئەوەی خوا ویستی و، موحەمەد ویستی، بەڵكو بڵێن: ئەوەی خوا ویستی و، ئینجا موحەمەد ویستی[1].**

(الصحيحة ٣٧)

٥٧٨١- قولوا: ما شاء الله ثم شئت.

(صحيح) ( طب ) عن ابن مسعود.

**٥٧٨١- بڵێن: ئەوەی ویستی خوای لەسەر بێت ، ئینجا ویستی تۆ.**

(الصحيحة ١٣٦)

٥٧٨٢- لا ترسلوا فواشيكم و صبيانكم إذا غابت الشمس حتى تذهب فحمة العشاء فإن الشياطين تبعث إذا غابت الشمس حتى تذهب فحمة العشاء.

(صحيح) ( حم م د ) عن جابر.

**٥٧٨٢- مەڕ و ماڵات و مناڵەكانتان بەڕەڵا مەكەن كاتێك خۆر ئاوا دەبێت، تا كاتی تاریكی عیشا، چونكە لەوماوەدا شەیتانەكان بڵاوەدەبنەوە، پەلەمەكەن هەتا پریسكی سەرەتای شەو دەڕەوێتەوە.**

(الارواء ٣٨)

٥٧٨٣- لا تسموا العنب الكرم و لا تقولوا خيبة الدهر فإن الله هو الدهر.

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة.

**٥٧٨٣- بە ترێ مەڵێن (كرم)كەرم، هەروەها مەڵێن ڕۆژگاری هیوا بڕاو، چونكە گۆڕینی زەمانە بەدەست خوایە.**

(الروض ٥٢٣١٢)

٥٧٨٤- لا تقولوا: الكرم و لكن قولوا: العنب و الحبلة.

(صحيح) ( م ) عن وائل.

**٥٧٨٤- مەڵێن: (كرم ) كەرم بەڵكو بڵێن ترێ و هێشوو.**

(المشكاة ٤٧٦٢)

---

**[1] مەناوی دەڵێت چونكە تێكەڵ كدرنی تیایە لەگەڵ هاوبەشیدانان ، (ابن القیم) دەڵێت: وەكو هەندێك دەڵێن : پەنا دەگرم بە خوا و تۆ، یان پێویستیم كەوتۆتە خواو تۆ ، یان كەسم نیە لە خواو تۆ زیاتر، سوێند بەخوا و بە گیانی تۆ، ئەمانە هەمووی نابەجێ و نادروستن.**

٥٧٨٥- لا تقولوا للمنافق: سيدنا فإنه إن يكن سيدكم فقد أسخطتم ربكم.

(صحيح) ( حم د ن ) عن بريدة.

**٥٧٨٥- بە دوو ڕوو مەڵێن: گەورەمان، چونکە ئەو ئەگەر سەرگەورەی ئێوە بێت، خواتان لەخۆتان تووڕە کردووە.**

(الصحيحة ٣٧٠)

٥٧٨٦- لا تقولوا: ما شاء الله و شاء فلان و لكن قولوا: ما شاء الله ثم شاء فلان.

(صحيح) ( حم د ن ) عن حذيفة.

**٥٧٨٦- مەڵێن: ئەوەی بە ویستی خوا و ویستی فلان ، بەڵکو بڵێن: بە ویستی خوا و، ئینجا بە ویستی فلان.**

(الصحيحة ١٣٧)

٥٧٨٧- لا يقل أحدكم: أطعم ربك وضئ ربك و اسق ربك و لا يقل أحد: ربي و ليقل: سيدي و مولاي و لا يقل أحدكم: عبدي و أمتي و ليقل: فتاي و فتاتي و غلامي.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة.

**٥٧٨٧- با هیچ کەسێکتان نەڵێ : خواردن بدە بە پەروەردگارت، دەستنوێژ بە پەروەردگارت بگرە ئاو بدەبە پەروەردگارت، کەسیش نەڵێن: پەروەدگارم ، بڵێ: گەورەکەم و سەرپەرشتیارەکەم، با کەسیشتان نەڵێ: بەندەکەم و کۆیلەکەم و ، با بڵێت: کوڕ و کچەکەم و خولامەکەم.**

(الصحيحة ٨٠٣)

٥٧٨٨- لا يقل أحدكم خبثت نفسي و لكن ليقل لقست نفسي.

(صحيح) ( حم ق د ن ) عن سهل بن حنيف ( حم ق ن ) عن عائشة.

**٥٧٨٨- با کەستان نەڵێ دەرونی خۆم شێواند یان پیسم کرد بەڵکو بڵێ دەروانم کێشی کردم.**

٥٧٨٩- لا يقولن أحدكم الكرم فإن الكرم الرجل المسلم و لكن قولوا: حدائق الأعناب.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة.

**٥٧٨٩- با کەستان نەڵێت:( الكرم ) واتە مێو، چونکە کەرەم[1] پیاوی موسڵمانە، بەڵکو بڵێن: باخەکانی ترێ.**

(الروض ١١٦١)

[1] عەرەبەکان لەسەردەمی نەفامیدا بەداری مێویان دەوت کەرەم واتە بەخشندە چونکە کەسی سەرخۆشیان بەبەخشندە دەزانی کە بەسەرخۆشی ماڵەکەی تەخشان و پەخشان دەکرد بەڵام لە ئیسلامدا لێیان قەدەغەکراوی پێ بڵێن ..

٥٧٩٠- لا يقولن أحدكم للعنب: الكرم فإنما الكرم: قلب المؤمن.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي هريرة.

**٥٧٩٠- كه‌ستان به ترێ نه‌ڵێن:( الكرم ) چونكه ( الكرم ):دڵی ئیمانداره[1].**

(الروض ١١٦١)

٥٧٩١- لا يقولن أحدكم: يا خيبة الدهر ! فإن الله هو الدهر.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة.

**٥٧٩١- كه‌ستان نه‌ڵێت ڕۆژگاری به‌دبه‌خت! چونكه خوای گه‌وره خۆی زه‌مانه‌یه.**

(المشكاة ٤٧٦٣)

٥٧٩٢- يقولون: الكرم و إنما الكرم: قلب المؤمن.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة.

**٥٧٩٢- ده‌ڵێن:( الكرم ) كه‌ڕم ته‌نها:دڵی باوه‌ڕداره.**

(المشكاة ٤٧٦١)

٥٧٩٣- لا تسبوا الدهر فإن الله هو الدهر.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة.

**٥٧٩٣- جنێو به ڕۆژگار مه‌ده‌ن چونكه خوای گه‌وره خۆی ڕۆژگاره.**

(المشكاة ٤٧٦٤)

٥٧٩٤- لا تسبوا الديك فإنه يوقظ للصلاة.

(صحيح) ( د ) عن زيد بن خالد.

**٥٧٩٤- جنێو به كه‌ڵه‌شێر مه‌ده‌ن، چونكه خه‌ڵكی بۆ نوێژ هه‌ڵده‌سێنێ.**

(المشكاة ٤١٣٦)

٥٧٩٥- لا تسبوا الريح فإذا رأيتم ما تكرهون فقولوا: اللهم إنا نسألك من خير هذا الريح و خير ما فيها و خير ما أمرت به و نعوذ بك من شر هذا الريح و شر ما فيها و شر ما أمرت به.

(صحيح) ( ت ) عن أبي.

**٥٧٩٥- جنێو به با مه‌ده‌ن، ئه‌گه‌ر شتێكی ناخۆشتان ببینی بڵێن: خوایه ئێمه داوای چاكه‌ی ئه‌م بایه لێ ده‌كه‌ین و، چاكترین شت كه‌تیایدایه و، چاكترین شت كه فه‌رمانی**

---

[1] مه‌ناوی ده‌ڵێت چونكه جنێودان زیانه‌كه‌یتان لێ لانادات.

**پێکراوه، پەناشت پێدەگرین له خراپەی ئەم بایەو ، خراپترین شت کە تیایدایە و، خراپترین شت کەفەرمانی پێ کراوه.**

(المشكاة ١٥١٨)

٥٧٩٦- لا تسبوا الريح فإنها من روح الله تعالى تأتي بالرحمة و العذاب و لكن سلوا الله من خيرها و تعوذوا بالله من شرها.

(صحيح) ( حم ه ) عن أبي هريرة.

**٥٧٩٦- جنێو بە با مەدەن چونکە میهرەبانی خوایە بۆ بەندەکانی، بە سۆز و سزا هەڵدەکات، بەڵام داوای چاکەکەی بکەن لە خوا و، پەنا بگرن بە خوا لە خراپەکەی.**

(المشكاة ١٥١٦)

٥٧٩٧- لا تسبوا الريح فإنها من روح الله و سلوا الله خيرها و خير ما فيها و خير ما أرسلت به و تعوذوا بالله من شرها و شر ما فيها و شر ما أرسلت به.

(صحيح) ( ن ك ) عن أبي.

**٥٧٩٧- جنێو بە با مەدەن چونکە میهرەبانی خوایە، داوای چاکەش لە خوا بکەن و، ئەو چاکەی کەتیایدایە و، چاکترین شت کە پێی ڕەوانەکراوه، پەنایش بگرن بە خوا لە خراپەی و، ئەو خراپەی کە تیایدایە و، خراپترین شت کە پێی ڕەوانە کراوه.**

(المشكاة ١٥١٨)

٥٧٩٨- لا تسبوا الشيطان و تعوذوا بالله من شره.

(صحيح) ( المخلص ) عن أبي هريرة.

**٥٧٩٨- جنێو بە شەیتان مەدەن و، پەنا بگرن بە خوا بگری لە خراپەکانی[1].**

(الصحيحة ٢٤٢٢)

٥٧٩٩- لا تسبوا تبعا فإنه كان قد أسلم.

(صحيح) ( حم ) عن سهل بن سعد.

**٥٧٩٩- جنێو بە (تبّع) مەدەن، چونکە ئەو موسڵمان بوو بوو[2].**

(الصحيحة ٢٤٢٣)

---

[1] له زمانی عەرەبیدا (الكرم) یەکێکە له ناوەکانی ترێ و ، له بەخشندەییەوە هاتووه، دەیانووت هەرکێ عارەق بخوات بەخشندە دەبێت، جا کە عارەق قەدەغە بوو ، پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کرد ئەو ناوە لە مەی بنرێت و فەرمووی: دڵی ئیماندار بەخشندەیە نەك ئەو شتە پیسە. (وەرگێر)

[2] مەناوی دەڵێت: (السيوطي) هێمای (حسن) ی بۆ بۆ داناوه و خۆیشی وا نییه، چونکە ئەم فەرموودەیە (عمرو بن جابر) لەسەنەدەکەیدایە، پیاوێکی درۆزنە. بڕوانە: فيض القدير ٦/ ٥٩ .(وەرگێر)

٥٨٠٠- لا تسبي الحمى فإنها تذهب خطايا بني آدم كما يذهب الكير خبث الحديد.

(صحيح) ( م ) عن جابر.

**٥٨٠٠- جنێو بە تا مەدە چونكە گوناهەكانی ئادەمیزاد لادەبات، وەكو چۆن موشە دەمە پیسییەكانی ئاسن لادەبات.**

(الصحيحة ١٢١٥)

٥٨٠١- لا تسبي الحمى فإنها تنفي الذنوب كما تنفي النار خبث الحديد.

(صحيح) ( ه ) عن أبي هريرة.

**٥٨٠١- جنێو بە تا مەدە ، چونكە گوناهەكان لادەبات ، وەكو چۆن ئاگر پیسیەكانی ئاسن لادەبات.**

(الصحيحة ١٢١٥)

٥٨٠٢- الريح من روح الله تأتي بالرحمة و تأتي بالعذاب فإذا رأيتموها فلا تسبوها و اسألوا الله خيرها و استعيذوا بالله من شرها.

(صحيح) ( خد ك ) عن أبي هريرة.

**٥٨٠٢- با لەلای خواوەیە میهرەبانی و سزا لەگەڵ خۆی دەهێنێ، جا كاتێك بینیتان جنێوی پێ مەدەن و، داوای چاكەی لە خوا بكەن و، پەنا بگرن بەخوا لەخراپەی.**

(المشكاة ٥١٦)

٥٨٠٣- قال الله تعالى: يؤذيني ابن آدم يسب الدهر و أنا الدهر بيدي الأمر أقلب الليل و النهار.

(صحيح) ( حم ق د ) عن أبي هريرة.

**٥٨٠٣- خوای گەورە دەفەرموێت: ئادەمیزاد ئازارم دەدات جنێو بە رۆژگار دەدات، هەموو كاروبارێكی رۆژگاریش بەدەستی منە، شەو و رۆژ هەڵدەگێڕمەوە.**

(الصحيحة ٥٣٠)

٥٨٠٤- قال الله تعالى: يؤذيني ابن آدم يقول: يا خيبة الدهر ! فلا يقولن أحدكم: يا خيبة الدهر ! فإني أنا الدهر أقلب ليله و نهاره فإذا شئت قبضتهما.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة.

**٥٨٠٤- خوای گەورە دەفەرموێت: ئادەمیزاد ئازارم دەدات، دەڵێت: رۆژگاری بەدبەخت! با كەستان ئەو قسە نەكات! چونكە من خۆم رۆژ دەگۆڕم و شەو و رۆژی هەڵدەگێڕمەوە، ئەگەر بمەوێت لایدەبەم.**

(الصحيحة ٥٣٠)

٥٨٠٥- لا تقل تعس الشيطان فإنه يعظم حتى يصير مثل البيت و يقول: بقوتي صرعته و لكن قل: باسم الله فإنك إذا قلت ذلك تصاغر حتى يصير مثل الذباب.

(صحيح) ( حم د ن ك ) عن والد أبي المليح.

**٥٨٠٥- مەڵێ: شەيتان لەناوناچێت، چونكە ئەوەندە زل دەبێت بەو قسە تاكو ئەوەندەى ماڵێكى لێ دێت و دەڵێت: بە هێزى خۆم بەزاندم، بەڵكو بڵێ: بەناوى خوا، چونكە كەوا بڵێيت بچووك دەبێتەوە تاكو دەبێتە ئەوەندەى مێشێك.**

(الكلم ٥٢٨)

٥٨٠٦- لا تلعن الريح فإنها مأمورة و إنه من لعن شيئا ليس له بأهل رجعت اللعنة عليه.

(صحيح) ( د ت ) عن ابن عباس.

**٥٨٠٦- نەفرين لەڕەشەبا مەكە بێگومان ئەو فەرمان پێكراوە، چونكە هەركەسێك نەفرين لە شتێك بكات و شايەنى نەبێت بەسەر خۆيدا دەشكێتەوە.**

(الصحيحة ٢٣٧)

٥٨٠٧- لا يسب أحدكم الدهر فإن الله هو الدهر و لا يقولن أحدكم للعنب: الكرم فإن الكرم الرجل المسلم.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة.

**٥٨٠٧-با كەستان جنێو بە ڕۆژگار نەدات چونكە خواى گەورە خۆى ڕۆژگارە، كەسيشتان بە ترێ نەڵێن (كرم) چونكە (كرم) واتە: پياوى موسڵمان.**

(الروض ١١٦١)

٥٨٠٨- إذا قاتل أحدكم أخاه فليجتنب الوجه.

(صحيح) ( حم ) عن أبي سعيد .

**٥٨٠٨- ئەگەر كەسێكتان لەگەڵ براكەى بەگژيەكدا هاتن با خۆى لە ڕووخسارى بپارێزێت.**

(الصحيحة ٨٦٢)

٥٨٠٩- اذهب فإن في البيت ثلاثة منهم غلام قد صلى فخذه و لا تضربه فإنا قد نهينا عن ضرب أهل الصلاة.

(صحيح) ( هب ) عن أبي أمامة .

**٥٨٠٩- برۆ،بەراستى سێ كەس لەمالْن: يەكێكيان لاوێكە نوێژى كردووە، بيبە و لێى نەدەيت،چونكە بەراستى ئێمە لێمان قەدەغە كراوە لە نوێژ خوێن بدەين.**

(الصحيحة ١٤٢٨)

٥٨١٠- إن أنتم قدرتم عليه فاقتلوه و لا تحرقوه بالنار فإنه إنما يعذب بالنار رب النار.

(صحيح) ( حم د ) عن حمزة بن عمرو الأسلمي .

**٥٨١٠- ئەگەر ئێوە زاڵبوون بەسەريدا بيكوژن و بە ئاگر نەيسوتێنن، چونكە تەنها پەروەردگارى ئاگر بۆى هەيە بە ئاگر ئەشكەنجە بدات.**

(الصحيحة ١٥٦٥)

٥٨١١- إنه لا ينبغي أن يعذب بالنار إلا رب النار.

(صحيح) ( د ) عن ابن مسعود ( م ) عن كعب بن مالك .

**٥٨١١- ڕەوا نييە كەس كەس بە ئاگر ئەشكەنجە بدات، جگە لە پەروەردگارى ئاگر.**

(الصحيحة ٢٥)

٥٨١٢- إني كنت أمرتكم أن تحرقوا فلانا و فلانا بالنار و إن النار لا يعذب بها إلا الله فإن أخذتموهما فاقتلوهما.

(صحيح) ( حم خ ت ) عن أبي هريرة .

**٥٨١٢- من فەرمانم پێكردن فلاْن و فلاْن بە ئاگر بسووتێنن، بەڕاستى تەنها خوا نەبێت كەس نابێ بە ئاگر ئەشكەنجەى كەس بدات، جا ئەگەر ئەو دوو كەسەتان دەستگيركردن بيانكوژن.**

(الصحيح الترمذي ١٥٧١)

٥٨١٣- نهيت عن المصلين.

(صحيح) ( طب ) عن أنس.

**٥٨١٣- لێدان و كوشتنى[1] نوێژ گەرانم لێ قەدەغە كراوە.**

(الصحيحة ٢٣٧٩)

٥٨١٤- ما أمرتكم به فخذوه و ما نهيتكم عنه فانتهوا.

(صحيح) ( ه ) عن أبي هريرة.

**٥٨١٤- ئەوەى فەرمانم پێ كردوون وەريگرن، ئەوەشى لێم قەدەغە كردن وازى لێبهێنن.**

(الارواء ١٥٥)

---

[1] السراج المنير،ج٢ ، ص٩٣٥.

٥٨١٥- نهى أن تكلم النساء إلا بإذن أزواجهن.

(صحيح) ( طب ) عن عمرو.

**٥٨١٥- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی دەكرد لەگەڵ ژناندا قسە بكرێت، مەگەر بە مۆڵەتی هاوسەرەكانیان.**

(الصحيحة ٦٥٢)

٥٨١٦- نهى أن يتعاطى السيف مسلولا.

(صحيح) ( حم د ت ك ) عن جابر.

**٥٨١٦- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی كردووە شمشێر بە ڕووتی دەستا و دەستی پێ بكرێت.**

(المشكاة ٣٥٤٧)

٥٨١٧- نهى أن يتنفس في الإناء أو ينفخ فيه.

(صحيح) ( حم د ت ه ) عن ابن عباس.

**٥٨١٧- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی دەكرد هەناسە لەناو پەرداخدا بدرێت یان فووی لێ بكرێت.**

(الارواء ٢٠٣٧)

٥٨١٨- نهى أن يضع الرجل إحدى رجليه على الأخرى و هو مستلق على ظهره.

(صحيح) ( حم ) عن أبي سعيد.

**٥٨١٨- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی دەكرد پیاو قاچێكی بخاتە سەر ئەوی تر و لەسەر پشت ڕابكشێت.**

(الصحيحة ١٢٥٥)

٥٨١٩- نهى أن يقام الرجل من مقعده و يجلس فيه آخر.

(صحيح) ( خ ) عن ابن عمر.

**٥٨١٩- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی دەكرد كەسێك لە جێگەی خۆی هەڵبسێنرێت و، كەسێكی تری تیا دابنیشێنرێت.**

(الصحيحة ١٣٠٢)

٥٨٢٠- نهى أن ينام الرجل على سطح ليس بمحجور عليه.

(صحيح) ( ت ) عن جابر.

**٥٨٢٠- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی كردووە كە پیاوێك لەسەر بانێك بخەوێت بەربەستێكی نەبێت[1].**

(الصحيحة ٨٢٦)

٥٨٢١- نهى أن ينفخ في الطعام و الشراب.

(صحيح) ( طب ) عن سهل بن سعد.

**٥٨٢١- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی دەكرد فوو بكرێت لە خواردن و خواردنەوە.**

(الضعيفة ٤٧١٥)

٥٨٢٢- نهى عن التبقر في المال.

(صحيح) ( حم ) عن ابن مسعود.

**٥٨٢٢- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی كردووە ماڵ و سامان پەرتەوازە بكرێت[2].**

(الصحيحة ١٢)

٥٨٢٣- نهى عن التكلف للضيف.

(صحيح) ( ك ) عن سلمان.

**٥٨٢٣- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی كردووە ئەركی زیاد لەسنوور بۆ میوان بكێشرێت.**

(الصحيحة ٢٣٩٢)

٥٨٢٤- نهى عن الخذف و قال: إنها لا تقتل الصيد و لا تنكي العدو و لكنها تفقأ العين و تكسر السن.

(صحيح) ( حم ق د ه ) عن عبدالله بن مغفل.

**٥٨٢٤- پێغەمبەر (ﷺ) بەرد هاویشتنی بە پەنجە قەدەغە كرد و فەرمووی: نێچیر ناكوژێت و، دوژمن نابەزێنێت، بەڵكو چاو كوێر دەكات و دان دەشكێنێ.**

(الروض ٦٥٥)

٥٨٢٥- نهى عن الدواء الخبيث.

(صحيح) ( حم د ت ه ك ) عن أبي هريرة.

---

[1] وەكو ستارە بۆ ئەوەی نەكەوێتە خوارەوە.

[2] واتە: قەدەغەی دەكرد پەرتەوازەیی هەبێت لە كەس و كارو ماڵ و سامانیدا لە چەند شوێنێكدا بۆ ئەوەی تووشی دڵە ڕاوكێ نەبێت.

**٥٨٢٥- پێغەمبەر (ﷺ) دەرمانی پیسی قەدەغە دەكرد[1].**

(المشكاة ٤٥٢٩)

٥٨٢٦- نهى عن الرقى و التمائم و التولة.

(صحيح) ( ك ) عن ابن مسعود.

**٥٨٢٦- پێغەمبەر (ﷺ) نووشتە و[2]، چاوەزار و هەلاوەسین[3]، جادووی شیرین كردنی ژن لەلای پیاوی قەدەغە دەكرد.**

(الصحيحة ٣٣١)

٥٨٢٧- نهى عن الركوب على جلود النمار.

(صحيح) ( د ن ) عن معاوية.

**٥٨٢٧- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی كردووە پێستی پڵنگ بۆ سواری ڕا بخرێت.**

(الضعيفة ٤٧)

٥٨٢٨- نهى .......عن ذبح ذوات الدر.

(صحيح) (ه ك) عن علي.

**٥٨٢٨- پێغەمبەر (ﷺ) سەربڕینی ئاژەڵی شیرداری قەدەغە دەكردووە.**

(الضعيفة ٤٧١٩)

٥٨٢٩- نهى عن الكي.

(صحيح) ( طب ) عن سعد الظفري ( ت ك ) عن عمران.

**٥٨٢٩- پێغەمبەر (ﷺ) (داخكردنی) پوشوتانی قەدەغە دەكرد[4].**

(الصحيحة ١١٥٤)

٥٨٣٠- نهى عن النعي.

(صحيح) ( حم ت ه ) عن حذيفة.

---

[1] ئارەق ، یان هەر شتێك وەكو ئەو.

[2] مەبەست لەو نوشتانەن ووشەی هاوبەش دانانی تیایە.

[3] مورویەكە هەڵدەواسرێت بۆ منداڵ بۆ ئەوەی چاو كاری تێ نەكات.

[4] چونكە لە سزادانی دۆزەخ دەچێت ، ئینجا چونكە ئازاری سەختە ، بەلام چارەسەری تری نەبێت ، ئەو نەخۆشە ناچار پەنای پێ ببرێت ، پێغەمبەر (ﷺ) سەعدی كوڕی موعازی داخكرد..

**٥٨٣٠- پێغەمبەر (ﷺ) چاوەڕوانی مردنی قەدەغە دەکرد[1].**

(الجنائز ٣٠)

٥٨٣١- نهى عن النفخ في الطعام و الشراب.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عباس.

**٥٨٣١- پێغەمبەر (ﷺ) فووکردنی لەخواردن و خواردنەوە قەدەغە کردووە.**

(الضعيفة ٤٧١٥)

٥٨٣٢- نهى عن النوم قبل العشاء و عن الحديث بعدها.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس.

**٥٨٣٢- پێغەمبەر (ﷺ) خەوتنی پێش نوێژی خەوتنانی قەدەغە کردوە، هەروەها گفتوگۆیشی لەدوان نوێژی خەوتنان.**

(الروض ٩١٥)

٥٨٣٣- نهى عن النياحة.

(صحيح) ( د ) عن أم عطية.

**٥٨٣٣- پێغەمبەر (ﷺ) شیوەنی قەدەغە دەکرد.**

(الجنائز ٤٨)

٥٨٣٤- نهى عن الوحدة: أن يبيت الرجل وحده.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عمر.

**٥٨٣٤- پێغەمبەر (ﷺ) تەنهایی قەدەغەی کردووە پیاو تەنها هەروەها ئەگەر بەتەنها شەوگار بەسەر بەرێت.**

(الصحيحة ٦٠)

٥٨٣٥- نهى عن جلود السباع.

(صحيح) ( ك ) عن والد أبي مليح.

---

[1] وەکو ئەوەی لەسەردەمی جاهیلی هەبوو ، لە هاوار و قیژە و باسکردنی سیفەتەکانی مردووەکە ، ئینجا عەرەب کاتێك پیاو چاکێکی لێ دەکوژرا ، سوارێکیان دەنارد بە هۆزەکاندا هەواڵەکە بڵاو بکاتەوە ، بەڵام قەدەغە نیە ئەگەر تەنها گەیاندنی هەواڵی مردنی کەسێك و باسکردنی چاکەکانی بێت. وەکو ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) ئە نجامیدا بۆ نەجاشی.

**٥٨٣٥- پێغەمبەر (ﷺ) ڕاخستنی پێستی دڕندەکانی قەدەغە کردووە.**

(الصحيحة ١٠١١)

٥٨٣٦- نهى عن سب الأموات.

(صحيح) ( ك ) عن زيد بن أرقم.

**٥٨٣٦- پێغەمبەر (ﷺ) جنێودانی بەمردوو قەدەغە کردووە.**

(الصحيحة ٢٣٩٧)

٥٨٣٧- نهى عن صوم ستة أيام من السنة: ثلاثة أيام التشريق و يوم الفطر و يوم الأضحى و يوم الجمعة مختصة من الأيام.

(صحيح) ( الطيالسي ) عن أنس.

**٥٨٣٧- پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژووگرتنی شەش ڕۆژی لە ساڵێکدا قەدەغە دەکرد، سێ ڕۆژی پاش جەژنی قوربان و، جەژنی ڕەمەزان و، جەژنی قوربان، ڕۆژی هەینی ئەگەر تایبەت بکرێت.**

(الصحيحة ٢٣٩٨)

٥٨٣٨- نهى عن صوم يوم الفطر و النحر.

(صحيح) ( ق ) عن عمر وأبي سعيد.

**٥٨٣٨- پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژووگرتنی جەژنی قوربان و ڕەمەزانی قەدەغە کردووە.**

(الارواء ٩٤٤)

٥٨٣٩- نهى عن صيام يوم الجمعة.

(صحيح) ( حم ق ه ) عن جابر.

**٥٨٣٩- پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژووی ڕۆژی هەینی بەتەنها قەدەغە کردووە.**

(الصحيحة ١٠١٢)

٥٨٤٠- نهى عن محاش النساء.

(صحيح) ( طس ) عن جابر.

**٥٨٤٠- پێغەمبەر (ﷺ) چوونە لای ئافرەتانی لەکۆمەوە قەدەغە کردووە.**

(الصحيحة ٢٣٩٩)

٥٨٤١-لا تعذبوا بعذاب الله.

(صحيح) ( د ت ك ) عن ابن عباس.

**٥٨٤١- ئەشكە نجە مەدە بە ئەشكە نجەی خوای گەورە[1].**

(الصحيحة ٤٨٧)

٥٨٤٢- لا تعذبوا صبيانكم بالغمز من العذرة و عليكم بالقسط.

(صحيح) ( خ ) عن أنس.

**٥٨٤٢- منالەكانتان چارەسەر مەكەن بە پەنجە بە قورگ خستيان[2]، بەلام (القسگ)[3] بەكاربهێنن.**

(المشكاة ٤٥٢٣)

٥٨٤٣- ما ضل قوم بعد هدى كانوا عليه إلا أوتوا الجدل.

(صحيح) ( حم ت ه ك ) عن أبي أمامة.

**٥٨٤٣- هيچ گەلێك لەدوای ڕێنمونی من گومڕانابن تەنها بە مەگەر بە مشت و مڕو شەڕە قسە..**

(المشكاة ١٨٠)

٥٨٤٤- إني كرهت أن أذكر الله إلا على طهر.

(صحيح) ( د ن حب ك ) عن المهاجر بن قنفذ .

**٥٨٤٤- پێم ناخۆش بوو ناوی خوا بهێنم بەبێ دەستنوێژ.**

(الصحيحة ٨٣٢)

## بابەتی دەرخستن و هۆنراوە

٥٨٤٥- أشعر كلمة تكلمت بها العرب كلمة لبيد: " ألا كل شيء ما خلا الله باطل.

(صحيح) ( م ت ) عن أبي هريرة .

**٥٨٤٥- چاكترين هۆنراوە عەرەب وتبێتيان قسەكەی لەبيدە:ئاگاداربن هەموو شتێك جگە لەخوای گەورە بەتاڵە.**

(الصحيح الترمذي ٢٨٤٩)

---

[1] واتە بە ئاگر.

[2] بۆ چارەسەركردنی قورگ ئێشە

[3] دەرمانێكە بۆنی خۆشە دوكەڵەكەی دەدرێت بەسەرو ئافرەتی زەيستان و منال.

٥٨٤٦- أصدق كلمة قالها الشاعر كلمة لبيد: " ألا كل شيء ما خلا الله باطل.

(صحيح) ( ق ه ) عن أبي هريرة .

**٥٨٤٦- ڕاست ترین وته كه شاعیرێك وتبێتی، قسەكەی لەبیدبوو :ئاگاداربن هەموو شتێك بێجگە لە خوای گەورە بەتاڵە.**

(الصحيح الترمذي ٢٨٤٩)

٥٨٤٧- أعظم الناس فرية اثنان: شاعر يهجوا القبيلة بأسرها و رجل انتفى من أبيه.

(صحيح) ( ابن أبي الدنيا في ذم الغضب ه ) عن عائشة .

**٥٨٤٧- درۆزنترین كەس دووكەسن: شاعیرێك بە هۆنراوەی جنێو ئامێز هەجوی سەرجەم هۆزێك بكات، پیاوێكیش نكۆڵی لە باوكی خۆی بكات.**

(الصحيحة ١٤٨٧)

٥٨٤٨- إن أعظم الناس عند الله فرية: لرجل هاجى رجلا فهجا القبيلة بأسرها و رجل انتفى من أبيه و زنى أمه.

(صحيح) ( ه هق ) عن عائشة .

**٥٨٤٨-بەڕاستی گەورەترین درۆزن لەلای خوا: پیاوێكە قسەی بەكەسێك وتبێت، ئەویش قسەی بە هەموو هۆزەكەی ووتبێت، پیاوێكیش نكۆڵی لە باوكایەتی باوكی خۆی بكات، دایكی خۆی بەداوێن پیس دابنرێت.**

(الصحيحة ٧٦٢)

٥٨٤٩- إن الله يؤيد حسان بروح القدس ما نافح عن رسول الله.

(صحيح) ( حم ت ) عن عائشة .

**٥٨٤٩- بەڕاستی خوای گەورە پشتگیری حەسسان[1] دەكات بە جیبریل تاكو ئەو بەرگری لە پێغەمبەرخوا بكات.**

(الصحيحة ١٦٥٧)

٥٨٥٠- إن روح القدس معك ما هاجيتهم.

(صحيح) ( ك ) عن البراء .

**٥٨٥٠- جیبریلت لەگەڵدایە هەتاكو هێرشی هۆنراوەیان سەركەیت.**

(الصحيحة ٨٠١)

---

[1] **(حسان بن ثابت) شاعیری پێغەمبەر (ﷺ)**

٥٨٥١- إن روح القدس لا يزال يؤيدك ما نافحت عن الله و رسوله - قاله لحسان -.

(صحيح) ( م ) عن عائشة .

**٥٨٥١- بەڕاستی جیبریل پشگیریت دەکات تاکو تۆ بەرگری لەخوا و پێغەمبەرەکەی بکەیت -بەحەسسانی فەرموو-.**

(الصحيحة ١١٨٠)

٥٨٥٢- إن من البيان سحرا و إن من الشعر حكما.

(صحيح) ( حم د ) ابن عباس .

**٥٨٥٢-بەڕاستی جۆرێك لە ڕوونكردنەوە و ڕەوانبێژی وەك جادوو دەنوێنێت ، بەڕاستی هەندێك جۆری هۆنراوەیش دانایی تیایە.**

(الصحيحة ١٧٣١)

٥٨٥٣- إن من البيان لسحرا.

(صحيح) ( مالك حم خ د ت ) ابن عمر .

**٥٨٥٣- بەڕاستی ڕوونكردنەوەو ڕەوانبێژی جۆرێك لەجادووی تیایە.**

(المشكاة ٤٧٨٣)

٥٨٥٤- إن من الشعر حكمة.

(صحيح) ( حم ق د ه ) عن أبي ( ت ) ابن مسعودطب ) عن عمرو بن عوف وأبي بكرة (حل) عن أبي هريرة (صحيح) ( خط ) عن عائشة وحسان بن ثابت ( ابن عساكر ) عن عمر .

**٥٨٥٤-بەڕاستی هەلبەست جۆرێك لە دانایی تیایە.**

(الصحيحة ٢٨٥١)

٥٨٥٥- اهج قريشا فإنه أشد عليهم من رشق النبل.

(صحيح) ( ق ) عن عائشة .

**٥٨٥٥- هەجووی بتپەرستان بكە، چونكە لەتیرباران سەختترە بەلایانەوە.**

(الصحيحة ٨٠١)

٥٨٥٦- اهج المشركين فإن روح القدس معك - قاله لحسان -.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن البراء .

**٥٨٥٦- هەجووی قورەیش بکە، چونکە بەڕاستی (رووح القدس) جبریلت لەگەڵدایە ...((بە حەسسانی فەرموو)).**

(المشكاة ٤٧٩٠)

٥٨٥٧- الشعر بمنزلة الكلام فحسنه كحسن الكلام و قبيحه كقبيح الكلام.

(صحيح) ( خد طس ) عن ابن عمرو ( ع ) عن عائشة.

**٥٨٥٧- هەڵبەست لە پلەی قسەکردندایە، چاکی وەکو قسەی چاکە و، ناشرینی وەکو قسەی ناشرینە.**

(الصحيحة ٤٤٧)

٥٨٥٨- كان إذا استراث الخبر تمثل ببيت طرفة: و يأتيك بالأخبار من لم تزود.

(صحيح) ( حم ) عن عائشة.

**٥٨٥٨- کاتێك هەواڵێك دوا بکەوتایە پێغەمبەر(ﷺ) هۆنراوەکەی تەرەفەی دەکردە نموونە: کەسێك هەواڵت بۆ دەهێنێ هیچت پێ نەداوە.**

(الصحيحة ٢٠٥٧)

٥٨٥٩- كان يتمثل بالشعر: " و يأتيك بالأخبار من لم تزود.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس ( ت ) عن عائشة.

**٥٨٥٩- پێغەمبەر (ﷺ) هۆنراوەی وەکو نموونە دەهێنایەوە: کەسێك هەواڵت بۆ دەهێنێ هیچت پێ نەداوە.**

(الصحيحة ٢٠٥٧)

٥٨٦٠- لأن يمتلئ جوف أحدكم قيحا حتى يَرِيَهُ خير له من أن يمتلئ شعرا.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن أبي هريرة ( حم م ه ) عن سعد ( طب ) عن سلمان وابن عمر.

**٥٨٦٠- ئەگەر ناخی کەسێکتان پڕبێت لە چڵك و کێم هەتاکو بە سەریدا زاڵ دەبێت، لەوە باشترە پڕی بکات لە هۆنراوە.**

(الصحيحة ٣٣٦)

٥٨٦١- لأن يمتلئ جوف رجل قيحا حتى يريه خير له من أن يمتلئ شعرا.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن أبي هريرة.

**٥٨٦١- ئەگەر ناخی کەسێکتان پڕبێت لە چڵك و کێم هەتاکو بە سەریدا زاڵ دەبێـت ، چاکترە بۆی لەوەی پڕ بێت لە هۆنراوە.**

(الصحيحة ٣٣٦)

٥٨٦٢- ما من راكب يخلو في مسيره بالله و ذكره إلا كان ردفه ملك و لا يخلو بشعر و نحوه إلا كان ردفه شيطان.

(صحيح) ( طب ) عن عقبة بن عامر.

**٥٨٦٢- هەر سوارێك لە ڕێبواریدا تەنها لەگەڵ یادی خوا دا بێت، فریشتەیەك دەبێتە پاشكۆی، هەرکەسێکیش تەنها لەگەڵ هۆنراوە و شتی لەو جۆرە هاودەم بێت، شەیتان دەبێتە هاوڕێ پاشکۆی.**

(الضعيفة ٦٦٨٨)

٥٨٦٣- هجاهم حسان فشفى و اشتفى.

(صحيح) ( م ) عن عائشة.

**٥٨٦٣- حەسسان ( هەجو ) هێرشیهۆنراوەی کردە سەر بێباوەڕانی قورەیش و برینی خۆی و ئیمەشی ساڕێژ کرد.**

(المشكاة ٤٧٩١)

٥٨٦٤- يا حسان ! أجب عن رسول الله اللهم أيده بروح القدس.

(صحيح) ( حم ق د ن ) عن حسان وأبي هريرة.

**٥٨٦٤- ئەی حەسسان! لەجیاتی پێغەمبەری خوا وەڵامیان بدەرەوە، خوایە پشتگیری بکەیت بە جیبریل.**

(الصحيحة ١٩٥٤)

## بابەتی پەند و نمونە هێنانەوە

٥٨٦٥- آخر ما أدرك الناس من كلام النبوة الأولى: إذا لم تستح فاصنع ماشئت.

(صحيح) ( ابن عساكر في تاريخ دمشق ) من حديث أبي مسعود البدري.

**٥٨٦٥- کۆتا شتێك کە بەخەڵکی گەیشتبێت لە یەك دەنگی پێغەمبەران: ئەگەر شەرمت نەکرد هەرچی دەکەیت بیکە.**

(الصحيحة ٦٨٤)

٥٨٦٦- أخبروني بشجرة شبه الرجل المسلم لا يتحات ورقها و لا و لا و لا تؤتي أكلها كل حين؟ هي النخلة.

(صحيح) ( خ ) عن ابن عمر .

**٥٨٦٦- داريكم پێ بڵێن لە پیاوی موسڵمان بچێت، گەڵای ناوەرێت وناوەرێت و ناوەرێت و هەمیشە بەروبوومی خۆی دەدات؟ ئەویش دارخورمایە.**

(الصحيحة ٣٥٤٤)

٥٨٦٧- إن الله تعالى جعل ما يخرج من بني آدم مثلا للدنيا.

( حسن ) (صحيح) ( حم طب هب ) عن الضحاك بن سفيان .

**٥٨٦٧- ئەوەی لە ئادەمیزاد دەردەچێت[1] خوای گەورە کردوویەتی بە نموونەی دونیا.**

(الصحيحة ٣٨٢)

٥٨٦٨- إن الله ضرب الدنيا لمطعم ابن آدم مثلا و ضرب مطعم ابن آدم مثلا للدنيا و إن قزحه و ملحه.

(صحيح) ( ابن المبارك هب ) عن أبي .

**٥٨٦٨- خوای گەورە دونیای کردووەتە نموونەی خواردنی ئادەمیزاد، خواردنی ئادەمیزادی کردووەتە نموونە بۆ دونیا، باترش و خۆێشی بکات.**

(الصحيحة ٣٨٢)

٥٨٦٩- إن مثل الذي يعمل السيئات ثم يعمل الحسنات كمثل رجل كانت عليه درع ضيقة قد خنقته ثم عمل حسنة فانفكت حلقة ثم عمل أخرى فانفكت الأخرى حتى يخرج إلى الأرض.

(صحيح) ( طب ) عن عقبة بن عامر .

**٥٨٦٩- نموونەی ئەو کەسەی خراپە دەکات و، بەدوایدا چاکە دەکات، وەکو پیاوێکە قەڵغانێکی تەنگی لەبەردا بێت هەتا هەناسەی سوارکردبێت، ئینجا چاکە بکات ئەڵقەیەکی بکرێتەوە، چاکەیەکی تر بکات و ئەڵقەیەکی تری بکرێتەوە، تاکو دێتە دەر بۆ سەر زەوی.**

(المشكاة ٢٣٧٥)

٥٨٧٠- إن مطعم ابن آدم قد ضرب مثلا للدنيا و إن قزحه و ملحه فانظر إلى ما يصير.

(صحيح) ( حب طب ) عن أبي .

**٥٨٧٠- بەڕاستی خواردنی ئادەمیزاد وەکو نموونەیەك باسکراوە بۆ دونیا، ئیتر با ترش و خۆێشیی بکات، بەڵام تەماشا کە دەبێتە چی[2]؟**

(الصحيحة ٣٨٣)

---

[1] میز و پیسی.

[2] واتە :خواردن و خواردنەوە دەبێتە پاشەڕۆ و پیسایی.

٥٨٧١- إن من الشجر شجرة لا يسقط ورقها و إنها مثل المسلم فحدثوني ما هي ؟ ثم قال: هي النخلة.

(صحيح) ( حم ق ت ) عن ابن عمر .

**٥٨٧١- بەڕاستی لەناو درەختەکاندا درەختێك هەیە گەڵای ناوەرێت، بێگومان ئەو وەکو کەسی موسڵمان وایە، پێم بڵێن: چییە؟ ئینجا فەرمووی: دارخورمایە.**

(الصحيحة ٣٥٤٤)

٥٨٧٢- إنك كالذي قال الأول: اللهم أبغني حبيبا هو أحب إلي من نفسي.

(صحيح) ( م ) عن سلمة بن الأكوع .

**٥٨٧٢- تۆ وەکو ئەوەی یەکەم کەس ووتی: خوایە خۆشەویستێکم بدەیتێ لە خۆم خۆشەویستر بێت بەلامەوە[1].**

(الصحيحة ٣٥٥٣)

٥٨٧٣- إنما مثل الجليس الصالح و جليس السوء كحامل المسك و نافخ الكير فحامل المسك إما أن يحذيك و إما أن تبتاع منه و إما أن تجد منه ريحا طيبة و نافخ الكير إما أن يحرق ثيابك و إما أن تجد ريحا خبيثة.

(صحيح) ( ق ) عن أبي موسى .

**٥٨٧٣- نموونەی هامنشینی چاك و هامنیشینی خراپ، نموونەی گوڵاوفرۆش و، ئاسنگەرە[2]، گوڵاوفرۆش یان بە شت دەدا، یان لێی دەکڕی، یان بۆنی گوڵاوەکەی بەسەرتا دێت، ئاسنگەریش یان پۆشاکەکەت دەسوتێنێ، یان بۆنە ناخۆشەکەی بەسەرتا دێت.**

(الصحيحة ٣٢١٤)

٥٨٧٤- إنما مثل المؤمن حين يصيبه الوعك أو الحمى كمثل حديدة تدخل النار فيذهب خبثها و يبقى طيبها.

(صحيح) ( طب ك ) عن عبدالرحمن بن أزهر .

**٥٨٧٤- نموونەی باوەڕدار کاتێك ئازارێك یان تایەکی تووش دەبێت، وەکو نموونەی ئاسنێکە بخەیتە ناو ئاگر چۆن پیسایەکەی لا بدات و، ئاسنی پوختە دەمێنێتەوە.**

(الصحيحة ١٧١٤)

---

[1] ئەوەی پێی فەرموو: پێشتر قەڵغانێکی پێدابوو، دوایی بینی پێی نییە و، لێی پرسی، ئەویش ووتی: مامم بینی قەڵغانی نییە، بۆیە قەڵغانەکەی خۆمم پێدا.

[2] (نافخ الكير) ئەو کەسەیە موشەدەمە فو دەدات کە مەشکەیەکی گەورەبۆ کەسێك وەکو شاگردی ئاسنگەر فوی دەدا کە دیکردەوە پڕ دەبو لە هەواو کە یەکی دەهێنایەوە هەواکەی ناوی فوی لە پشکۆو ئاگری ئاسنگەرەکە دەکرد فووەکەشی زۆر بەهێز بوو ورە پشکۆو ئاگری ئاسنگەرەکە کرد. فووەکەشی زۆر بەهێز بوو وردە پشکۆی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت و زۆرجار چڵ و بەرگی کون دەکردو دەیوتاند..

٥٨٧٥- إنما مثل المهجر إلى الصلاة كمثل الذي يهدي البدنة ثم الذي على أثره كالذي يهدي البقرة ثم الذي على أثره كالذي يهدي الكبش ثم الذي على أثره كالذي يهدي الدجاجة ثم الذي على أثره كالذي يهدي البيضة.

(صحيح) ( ن ) عن أبي هريرة.

**٥٨٧٥- نموونەی ئەو كەسەی زوو دەچێتە نوێژ نموونەی ئەو كەسێكە ووشترێك ببەخشێت، ئەوەشی بە شوێنیدا دەڕوات وەكو كەسێكە مانگایەك ببەخشێت، ئەوەشی بەشوێن ئەودا دەچێت وەكو كەسێكە بەرانێك ببەخشێت، ئینجا ئەوەی بەشوێنیدا ڕۆیشتووە وەكو كەسێكە مریشكێك ببەخشێت، ئینجا ئەوەی بەشوێن ئەودا ڕۆیشتووە وەكو كەسێكە هێلكەیەكی ببەخشێت.**

(الصحيحة ٣٥٧٦)

٥٨٧٦- إياكم و محقرات الذنوب فإنما مثل محقرات الذنوب كمثل قوم نزلوا بطن واد فجاء ذا بعود و جاء ذا بعود حتى حملوا ما أنضجوا به خبزهم و إن محقرات الذنوب متى يؤخذ بها صاحبها تهلكه.

(صحيح) ( حم طب هب الضياء ) عن سهل بن سعد .

**٥٨٧٦-ئامان خۆتان بەدوور بگرن لەگوناهە بچكۆلەكان، نموونە ئەو جۆرە گوناهانە نموونەی كەسانێكە چووبێتە دۆڵێكەوە و، ئەمە چڵە دارێكی هێنابێت و، ئەو چڵە دارێكی هێنا بێت، تاكو ئەوەندەیان كۆكردەوە نانەكەیان پێی برژاند، گوناهە بچكۆلەكانیش هەركاتێك لێپرسینەوە لەگەڵ ئە نجامدەرەكەی بكرێت لە ناوی دەبات.**

(الصحيحة ٣٨٩)

٥٨٧٧- إياكم و محقرات الذنوب فإنهن يجتمعن على الرجل حتى يهلكنه كرجل كان بأرض فلاة فحضر صنيع القوم فجعل الرجل يجيء بالعود و الرجل يجيء بالعود حتى جمعوا من ذلك سوادا و أججوا نارا فأنضجوا ما فيها.

(صحيح) ( حم طب ) عن ابن مسعود .

**٥٨٧٧- ئامان دووركەونەوە لە گوناهە بچووكەكان، چونكە كۆ دەبنەوە لەسەر پیاو تاكو لەناوی دەبەن، وەكو پیاوێك لە بیابانێكدا بێت و كاتی دروستكردنی خواردن بێت و، كەسێك چیلكەیەك بهێنێت و كەسێكی تر چیلكەیەك بهێنێت تاكو بڕێكی زۆر چیلكە كۆكەنەوە، ئاگری تێ بەردەن گڕ بگرێت.**

(الروض النفير ٣٥١)

٥٨٧٨- ضرب الله تعالى مثلا صراطا مستقيما و على جنبتي الصراط سوران فيهما أبواب مفتحة و على الأبواب ستور مرخاة و على باب الصراط داع يقول: يا أيها الناس ! ادخلوا الصراط جميعا و لا تتعوجوا و داع يدعو من فوق الصراط فإذا أراد الإنسان أن يفتح شيئا من تلك الأبواب قال: ويحك لا تفتحه فإنك إن تفتحه تلجه فالصراط الإسلام و السوران حدود الله تعالى و الأبواب المفتحة محارم الله تعالى و ذلك الداعي على رأس الصراط كتاب الله و الداعي من فوق واعظ الله في قلب كل مسلم .

(صحيح) ( حم ك ) عن النواس.

**٥٨٧٨- خوای گەورە نموونەیەکی هێناوەتەوە بە ڕێگایەکی ڕاست، لە هەردوولای ڕێگاکە دوو دیوار هەیە کە بابەتی کراوەیان تێدایە، دەرگاکانیش پەردەی داخراویان پیادراوە، لەسەر ڕێگەکەیشدا بانگخوازێك دەڵێ: خەڵکینە! هەمووتان بچنە سەر ڕێگەکە و خۆتان لار مەکەنەوە، بانگخوازێکیش لەسەروی ڕێگەکەوە هەر بانگ دەکات، جاکە کەسێك بیەوێت یەکێك لەو دەرگایانە بکاتەوە، دەڵێت: داماو نەیکەیتەوە، چونکە ئەگەر بیکەیتەوە دەچیتە ژوورەوە، جا ڕێگەکە ئیسلامە و، دوو دیوارەکەیش سنوورەکانی خوایە و، دەرگا کراوەکانیش قەدەغە کراوەکانی خوایە، ئەو بانگخوازەی لەسەر ڕێگەکەش قورئانە، بانگخوازەکەی سەرەوەش ئامۆژگاری خوایە لە دڵی هەموو موسڵمانێکدا.**

(المشكاة ١٩١)

٥٨٧٩- ما لي و للدنيا ! ما أنا في الدنيا إلا كراكب استظل تحت شجرة ثم راح و تركها.

(صحيح) ( حم ت ه ك الضياء ) عن ابن مسعود.

**٥٨٧٩- چیم داوە لەدونیا! من لەدونیادا وەکو سوارێکم خۆی دابێتە بن سێبەری درەختێك، ئینجا ڕۆیشتبێت و بەجێی هێشتبێت.**

(الصحيحة ٤٣٨)

٥٨٨٠- ما لي و للدنيا و ما للدنيا و ما لي ! و الذي نفسي بيده ما مثلي و مثل الدنيا إلا كراكب سار في يوم صائف فاستظل تحت شجرة ساعة من النهار ثم راح و تركها.

(صحيح) ( حم ك ) عن ابن عباس.

**٥٨٨٠- چیم داوە لەدونیا و دونیا چی لەمن داوە! سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە نموونەی من و دونیا وەکو نموونەی سوارێکە لەرۆژێکی گەرمدا بە ڕێگەدا بڕوات و، خۆی دابێتە بن سێبەری دارێك بۆ ماوەیەك و، ئینجا بەجێی هێشتبێت.**

(الصحيحة ١٤٣٩)

٥٨٨١- مثل ابن آدم و إلى جنبه تسعة و تسعون منية إن أخطأته المنايا وقع في الهرم حتى يموت.

(صحيح) ( ت الضياء ) عن عبدالله بن الشخير.

**٥٨٨١- نموونەی ئادەمیزاد کە نەوەد و نۆ مەرگی بەتەنیشتەوەیە، ئەگەر هەموو ئەوانەشی بۆ ڕێك نەکەوێت، دەکەوێتە پیری و دەمرێت.**

(المشكاة ١٥٦٩)

٥٨٨٢- مثل البيت الذي يذكر الله فيه و البيت الذي لا يذكر الله فيه مثل الحي و الميت.

(صحيح) ( ق ) عن أبي موسى.

**٥٨٨٢- نموونەی ئەوماڵەی یادی خوای تیا دەکرێت و ئەو ماڵەی یادی خوا تیا ناکرێت و، وەکو نموونەی زیندوو و مردووە.**

(الترغيب ٤٣٨)

٥٨٨٣- مثل الجليس الصالح كمثل العطار إن لم يعطك من عطره أصابك من ريحه.

(صحيح) ( د ك ) عن أنس.

**٥٨٨٣- نموونەی هامنشینی چاکەکار وەکو گوڵاوفرۆشە، ئەگەر گوڵاوت پێ نەدات بۆنەکەیت بەسەردا دێت.**

(الترغيب ٣٠٦٥)

٥٨٨٤- مثل الجليس الصالح و الجليس السوء كمثل صاحب المسك و كير الحداد لا يعدمك من صاحب المسك إما أن تشتريه أو تجد ريحه و كير الحداد يحرق بيتك أو ثوبك أو تجد منه ريحا خبيثة.

(صحيح) ( خ ) عن أبي موسى.

**٥٨٨٤- نموونەی هامشینی چاك و هامنشینی خراپ، وەکو گوڵاو فرۆش و موشەدەمی ئاسنگەرە، لە گوڵاو فرۆش بێ بەش نابی یان گوڵاو دەکریت، یان بۆنیت بەسەردا دێت، بەڵام ئاگری ئاسنگەر پۆشاکەکەت یان ماڵەکەت دەسوتێنێ، یان بۆنێکی ناخۆشت بۆنێکی ناخۆش بۆ دێت.**

(الصحيحة ٣٢١٤)

٥٨٨٥- مثل الذي يعين قومه على غير الحق مثل بعير تردى و هو يجر بذنبه.

(صحيح) ( هق ) عن ابن مسعود.

**٥٨٨٥- نموونەی ئەو کەسەی یارمەتی گەلەکەی دەدات لە شتی نارەوادا وەکو نموونەی ووشترێکە کەوتبێتە بیرێکەوە و ئەو بیەوێت بە کلکی دەریبهێنێتەوە.**

(المشكاة ٤٩٠٤)

٥٨٨٦- مثل المؤمن كمثل الخامة من الزرع تفيؤها الريح مرة و تعدلها مرة و مثل المنافق كمثل الأرزة لا تزال حتى يكون انجفافها مرة واحدة.

(صحيح) ( حم ق ) عن كعب بن مالك.

**٥٨٨٦- نموونەی باوەڕدار وەکو نموونەی ڕووەکێکی زەبونە جارێك با خواری دەکاتەوە و جارێك ڕاستی دەکاتەوە، نموونەی دوڕوش نموونەی داری (الارزە)یە[1] هەر دەمێنێتەوە تاکو بەیەکجار لەبن دەبڕدرێت.**

(الصحيحة ٢٢٨٣)

٥٨٨٧- مثل المؤمن كمثل الزرع لا تزال الريح تفيؤه و لا يزال المؤمن يصيبه بلاء و مثل المنافق كمثل شجرة الأرز لا يهتز حتى يستحصد.

(صحيح) ( حم ت ) عن أبي هريرة.

**٥٨٨٧- نموونەی باوەڕدار وەکو نمونەی ڕووەکە بەردەوام شنەبا دەیشکێنێ و ئیمانداریش هەردەم تووشی ناخۆشی دەبێت، نموونەی دوڕوش نموونەی داری ئەرزوە ناجوڵێت تاکو لە بن دەردەهێنرێت.**

(الترغيب ٣٤٠٠)

٥٨٨٨- مثل المؤمن كمثل خامة الزرع من حيث أتتها الريح كفأتها فإذا سكنت اعتدلت و كذلك المؤمن يكفأ بالبلاء و مثل الفاجر كالأرزة صماء معتدلة حتى يقصمها الله تعالى إذا شاء.

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة.

**٥٨٨٨- نموونەی بڕوادار وەکو نموونەی ڕووەکە، لەهەرلایەکەوە بای بۆ بێت دەیشکێنێ و بەملاو ئەولایدا دەبات، هەرکاتێکیش باکە ڕاوەستێت ئەو ڕاست دەبێتەوە، باوەڕدار بەو**

[1] ((الأَرْزْ)) درەختێکی گەرەی ڕەق و پتەوە لە توخمی دار سنەوبەرە ، هەمیشە سەوزە زۆر بەرز دەبێتەوە ، دارەکەی بۆ کەشتی دروستکردن بەکاردێنن ، بەلام ((الأَرَزْ)) هەرمزیە ، قاموسی ڕستە ، ب١ ، ل٣٢..

**شێوەیە بـە بـەلا دەڕەتـێنێ، نمونـەی خرا پـەکاریش وەکـو داری ئـەرزوە زرەیـە ڕاسـت دەوەستێ، تـاکو خوای گەورە بەویستی خۆی لەبنی دێنێ.**

(الصحيحة ٢٢٨٣)

٥٨٨٩- مثل المؤمن مثل السنبلة تستقيم مرة و تخر مرة و مثل الكافر مثل الأرزة لا تزال مستقيمة حتى تخر و لا تشعر.

(صحيح) ( حم الضياء ) عن جابر.

**٥٨٨٩- نموونەی باوەڕدار وەکو نموونەی گوڵە گە نمە جارێك ڕاست دەبێتـەوە و، جارێـك لار دەبێتەوە، نموونەی بێ باوەڕیش وەکو داری ئەرزوە، ڕاست ڕاوەستـاوە تـا ئـەو کاتـەی دەروخێت و هەست ناکات.**

(الصحيحة ٢٢٨٣)

٥٨٩٠- مثل المؤمن مثل السنبلة تميل أحيانا و تقوم أحيانا.

(صحيح) ( ع الضياء ) عن أنس.

**٥٨٩٠- نموونەی باوەڕدار وەکو نموونەی گوڵە گە نمە، جار جارە ڕاستە و، جار جارە لارە**[1].

(الصحيحة ٢٢٨٤)

٥٨٩١- مثل المؤمن مثل النحلة إن أكلت أكلت طيبا و إن وضعت وضعت طيبا و إن وقعت على عود نخر لم تكسره و مثل المؤمن مثل سبيكة الذهب إن نفخت عليها احمرت و إن وزنت لم تنقص.

(صحيح) ( هب ) عن ابن عمرو.

**٥٨٩١- نموونـەی بـاوەڕدار وەکـو نموونـەی هەنگـە، کـە دەخـوات شـتی پـاك و خـاوێن دەخوات، شتی پاك وخاوێنیشی لێ دادەنێت، کاتێك دەچێتە سـەر چڵە دارێکـی لاوازیـش نایشکێنێ، هەروەها نموونەی بـاوەڕداریش وەکـو نموونـەی ئـاڵتونی داڕێـژراوە، ئەگـەر فووی پیا بکەیت سوور دەبێتەوە، ئەگەربشکێشرێت کەم ناکات.**

(الصحيحة ٢٢٨٨)

٥٨٩٢- مثل المؤمن مثل النحلة لا تأكل إلا طيبا و لا تضع إلا طيبا.

(صحيح) ( طب حب ) عن أبي رزين.

---

[1] **واتە: ئازاری زۆرە لە لاشەیدا و لە ماڵیدا ، نەخۆش دەکەوێت و چاك دەبێتەوە بۆ ئەوەی گوناهەکانی بسرێتەوە ، بە پێچەوانەی بێ باوەڕەوە کە زۆر جار تەندروستی چاکە بۆ ئەوەی بە هەموو گوناهو تاوانەکانی یەوە لە ڕۆژی قیامەتدا بێتە حزور.**

**٥٨٩٢- نموونەی ئیماندار وەكـو نموونـەی هەنگـە شـتی پـاك نـەبێت نـا یخوات و شـتی پاكیش نەبێت داینانێت.**

(الصحيحة ٣٥٤)

٥٨٩٣- مثل المؤمن مثل النخلة ما أخذت منها من شيء نفعك.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عمر.

**٥٨٩٣- نموونەی باوەڕدار وەكو نموونەی دارخورمایە، هەرچی لێ ببەیت سوودی لێ دەبینی.**

(الصحيحة ٢٢٨٥)

٥٨٩٤- مثل المؤمنين في تـوادهم و تـراحمهم و تعـاطفهم مثـل الجسد إذا اشـتكى منـه عـضو تداعى له سائر الجسد بالسهر و الحمى.

(صحيح) ( حم م ) عن النعمان بن بشير.

**٥٨٩٤- نموونـەی بـاوەڕداران لـە میهرەبـانی و سـۆز و بـەزەییـان لـەنێو خۆیـانـدا نموونـەی یـەك لاشـەیە ئەگـەر ئەنـدامێكی ئـازاری هـەبێت، هـەموو لاشـەكە شەو نخونی و تـا دایدەگرێت.**

(الصحيحة ١٠٨٢)

٥٨٩٥- مثل المنافق كمثل الشاة العائرة بين الغنمين تعير إلى هذه مرة و إلى هذه مـرة لا تـدري أيهما تتبع

(صحيح) ( حم م ن ) عن ابن عمر.

**٥٨٩٥- نموونەی دوڕو وەكو نموونەی مەڕی وێلە لەنێوان دوو مەڕدا، جارێك بەلای ئەمـدا دەڕوات وجارێك بەلای ئەودا دەڕوات، نازانێت شوێن كامیان بكەوێت[1].**

(الروض ٥٥٤)

٥٨٩٦- مثلي كمثل رجل استوقد نارا فلما أضاءت ما حولها جعل الفراش و هذه الدواب الـتي يقعن في النار يقعن فيها و جعل يحجزهن و يغلبنه فيقتحمن فيها فذلك مثلي و مثلكم أنا آخـذ بحجزكم عن النار: هلم عن النار هلم عن النار فتغلبوني فتقتحمون فيها.

(صحيح) ( حم ق ت ) عن أبي هريرة.

---

[1] **دوڕوش ئاوایە ، جێگیر نابێت نە لەلای موسوڵمانان و نە لە لای بێباوەڕان، بە هەردووكیان دەڵێن من لە ئێوەم.**

**٥٨٩٦- نموونەی من وەکو نموونەی پیاوێکە ئاگرێکی کردبێتەوە، کاتێك دەوروبەری رووناك کردەوە، پەپوولە و ئەو گیانلەبەرانەی خۆیان دەخەنە ئاگرەوە دەکەونە ناوییەوە، ئەویش هەوڵ دەدات ڕێگەیان لێ بگرێت و نەهێڵێ خۆیان بخەنە ئاگرەکەوە، ئەوانیش هەر خۆیان تێ فڕێدەدەن، جا ئەوە نموونەی من و ئێوەیە من دەست بە پشتێنتانەوە دەگرم بۆ ئەوەی نەکەونە ئاگرەوە و هاوار دەکەم دوورکەونەوە لە ئاگرەکە و، ئێوە هەر خۆتانی تێ فڕێدەدەن.**

(الضعيفة ٣٠٨٢)

٥٨٩٧- مثلي و مثلكم كمثل رجل أوقد نارا فجعل الفراش و الجنادب يقعن فيها و هو يذبهن عنها و أنا آخذ بحجزكم عن النار و أنتم تفلتون من يدي.

(صحيح) ( حم ) عن جابر.

**٥٨٩٧- نموونەی من و ئێوە، نموونەی پیاوێکە ئاگرێکی کربێتەوە و، پەپوولە و کوولله مسکە خۆیان تێ فڕێدەدەن و، ئەویشت دووریان دەخاتەوە منیش کەمەری ئێوە دەگرم و دوورتان دەخەمەوە لە ئاگر و، ئێوەیش خۆ لەدەستم ڕادە پسکێنن.**

(الضعيفة ٣٠٨٢)

٥٨٩٨- مثلي و مثل الساعة كفرسي رهان مثلي و مثل الساعة كمثل رجل بعثه قوم طليعة فلما خشي أن يسبق ألاح بثوبيه: أتيتم أتيتم أنا ذاك أنا ذاك.

(صحيح) ( هب ) عن سهل بن سعد.

**٥٨٩٨- نموونەی من و نموونەی ڕۆژی دوایی وەکو دوو ئەسپی پێشبڕکێیە، نموونەی من و ڕۆژی دوایی وەکو پیاوێکە کەسانێك ناردبێتیان وەکو پێشەنگی خۆیان، کاتێك ترسا دوژمن پێش خۆی بگات، هەردوو پۆشاکەکەی ڕادەوەشا : هاتن بۆتان هاتن بۆتان، من هەر ئەو کەسەم، من هەر ئەو کەسەم.**

(الصحيحة ٣٢٢٠)

٥٨٩٩- مثلي و مثل ما بعثني الله به كمثل رجل أتى قوما فقال: يا قوم إني رأيت الجيش بعيني و إني أنا النذير العريان فالنجاء النجاء فأطاعه طائفة من قومه فأدلجوا و انطلقوا على

مهلهم فنجوا و كذبته طائفة منهم فأصبحوا مكانهم فصبحهم الجيش فأهلكهم و اجتاحهم فذلك مثل من أطاعني فاتبع ما جئت به و مثل من عصاني و كذب بما جئت به من الحق.

(صحيح) ( ق ) عن أبي موسى.

**٥٨٩٩- نموونەی من و ئەوەی خوای گەورە پێیدا ڕەوانە کردووم، نموونەی پیاوێکە چۆتە لای کەسانێك و، وتویەتی: کەسەکانم، من سوپاکەم بەچاوی خۆم بینی، بەڕاستی من وریا کەرەوەی ڕوتوقوتم بۆ ئێوە، دەربازبن ، دەرباز بن جا کۆمەڵێکیان بەقسەیان کرد و هەر بە تاریکی دەرچوون شەویان بە دەمەوە گرت بەهێواشی ڕۆیشتن و، ڕزگاریان بوو، کۆمەڵێکیشیان بە درۆیان زانی، سەر لە بەیانی سوپاکە بەسەریدادان لە ناوی بردن، ئەوەش نموونەی کەسێکە گوێرایەڵی من بکات یان سەرپێچی بکات و ئەوەی بۆم هێناون بە درۆی بزانێت.**

(المشكاة ١٤٨)

٥٩٠٠- يا بني عبد مناف يا بني عبد مناف ! إني نذير إنما مثلي و مثلكم كمثل رجل رأى العدو فانطلق يريد أهله فخشي أن يسبقوه إلى أهله فجعل يهتف: يا صباحاه يا صباحاه ! أتيتم أتيتم.

(صحيح) ( حم م ) عن قبيصة بن المخارق وزهير بن عمير.

**٥٩٠٠- ئەی نەوەی عبدول مەناف، ئەوەی عەبدول مەناف، من ئاگادارکەرەوەم بەڕاستی وەکو نموونەی من و ئێوە، نموونەی پیاوێکە دوژمنی بینیبێت و خێرا ڕۆیشتبێت بۆ لای کەس و کارەکەی خۆی و دەترسا دوژمن پێشی بکەوێت و هاواری دەکرد: ئای لەم بەیانیە ئای لەم بەیانیە بۆتان هاتن بۆتان هاتن.**

(المشكاة ٥٣٧٢)

## بابەتی چیرۆکەکان

٥٩٠١- اجتمع إحدى عشرة امرأة في الجاهلية فتعاقدن أن يتصادقن بينهن و لا يكتمن من أخبار أزواجهن شيئا . فقالت الأولى: زوجي لحم جمل غث على رأس جبل وعر لا سهل فيرتقى و لا سمين فينتقل . قالت الثانية: زوجي لا أبث خبره إني أخاف أن لا أذره إن أذكره أذكر عجره و بجره . قالت الثالثة: زوجي العشنق إن أنطق أطلق و إن أسكت أعلق . قالت الرابعة: زوجي إن أكل لف و إن شرب اشتف و إن اضطجع التف و

لا يولج الكف ليعلم البث . قالت الخامسة: زوجي عياياء طباقاء كل داء له داء شجك أو فلك أو جمع كلا لك . و قالت السادسة: زوجي كليل تهامة لا حر و لا قر و لا مخافة و لا سآمة . و قالت السابعة: زوجي إن دخل فهد و إن خرج أسد و لا يسأل عما عهد . و قالت الثامنة: زوجي المس مس أرنب و الريح ريح زرنب و أنا أغلبه و الناس يغلب . قالت التاسعة: زوجي رفيع العماد طويل النجاد عظيم الرماد قريب البيت من الناد . قالت العاشرة: زوجي مالك و ما مالك ؟ مالك خير من ذلك له إبل قليلات المسارح كثيرات المبارك إذا سمعن صوت المزاهر أيقن أنهن هوالك . قالت الحادية عشرة: زوجي أبو زرع و ما أبو زرع ؟ أناس من حلي أذني و ملأ من شحم عضدي و بجحني فبجحت إلي نفسي وجدني في أهل غنيمة بشق فجعلني في أهل صهيل و أطيط و دائس و منق فعنده أقول فلا أقبح و أرقد فأتصبح و أشرب فأتقمح أم أبي زرع و ما أم أبي زرع ؟ عكومها رداح و بيتها فساح ابن أبي زرع و ما ابن أبي زرع ؟ مضجعه كمسل شطبة و تشبعه ذراع الجفرة بنت أبي زرع و ما بنت أبي زرع ؟ طوع أبيها و طوع أمها و ملء كسائها و عطف ردائها و زين أهلها و غيظ جارتها جارية أبي زرع و ما جارية أبي زرع ؟ لا تبث حديثنا تبثيثا و لا تنقث ميرتنا تنقيثا و لا تملأ بيتنا تعشيشا خرج أبو زرع و الأوطاب تمخض فمر بامرأة معها ابنان لها كالفهدين يلعبان من تحت خصرها برمانتين فطلقني و نكحها فنكحت بعده رجلا سريا ركب شريا و أخذ خطيا و أراح علي نعما سريا و أعطاني من كل رائحة زوجا فقال: كلي أم زرع و ميري أهلك فلو جمعت كل شيء أعطانيه ما ملأ أصغر إناء من آنية أبي زرع فقال النبي صلى الله عليه وسلم: يا عائشة ! كنت لك كأبي زرع لأم زرع إلا أن أبا زرع طلق و أنا لا أطلق.

(صحيح) ( طب ) عن عائشة ورواه ( خ الترمذي في الشمائل ) موقوفا إلا قوله: كنت لك كأبي زرع فرفعاه قالوا: وهو يؤيد رفع الحديث كله .

**٥٩٠١- لەسەردەمی نەفامیدا یانزە ئافرەت بەڵێنیان بەیەکدا لەگەڵ یەکدا ڕاستگۆبن و دەربارەی هەواڵی هاوسەرەکانیان هیچ شتێك نەشارنەوە ، یەکەمیان ووتی : هاوسەری من وەکو گۆشتی وشتر وشك و پەلاسە[1] لەسەر لوتکەی چیایەکی سەختە نە پیاسەرکەوتنی ئاسانە و نەقەڵەویشە هەتا نەرم ونۆڵ بێت.[2] دووەهەم ووتی : هەواڵی هاوسەری خۆم نازڕێنم چونکە بەڕاستی ئەترسم کە دەستم کرد بە باسکردنی عەیب و**

---

[1] واتە وەکو گۆشتی وشتر ناشرینە مەبەستی ئەوە بوو سودی بۆی نیەو حەزی لە هاوسەرەکەی نیە و باش ڕوو لە ژنەکەی ناکات .

[2] واتە ڕەوشتی جوان نییەو لوتبەرز و خۆبەگەورەزانە بەکولەمەرگی نەبێت دەستی لێ گیر نابێت .

عاری زۆری لەسەر بڕۆم ، خۆ ئەگەر باسشی بکەم هەموو کەم و کوڕی ئاشکراو نهێنی باس دەکەم بن بەڕەی لێ دەخەمە سەر بەرە.

سێهەم ووتی : هاوسەری من درێژ و بێ هونەرە ئەگەر دەست بکەم بە باسکردنی کەم و کوڕیەکانی ئەوسەریان نییە و لێ نابمەوە ، ئەگەر بێدەنگیش بم وەکو هەڵاوەسراوم(( المطلقة )) لێ دێت.[1]

چوارەم ووتی : هاوسەری من لە خواردندا زۆر دەخوات لە خواردنەوەشدا هەر هەڵیدەقوڕێنێ ، کە دەشخەوێ پێخەف لەخۆی دەپێچێت[2] و بەتەنیا دەخەوێت و دەستی لە بن پۆشاکی هاوسەری هەڵناسوێ هەتا ئاگاداری دەردەدڵ و غەم و پەژارەی بێت.

پێنجەم ووتی : هاوسەری من بەرژەوەندی خۆی نازانێت ، گەلۆرە ، گەرای دەردو نەخۆشیە و دەردەدارە ، سەردەشکێنێ یان ئەندامی لەش دەشکێنێ ، یان هەردوکیان دەکات.

شەشەم ووتی : هاوسەری من مام ناوەندییە نە تونده تەبیعەتە وشلگیر و بێ دەنگە نەلەترسان نەلە وەرزیدا.

حەوتەم ووتی : هاوسەری من کەلەگەڵم جوت دەبێت وەکو پڵنگ هەڵدەکوتێتە سەرم ، کە لەماڵ دەچێتە دەر بۆ ناو خەلکی وەکو شێرە ، بێزی نایە پرسیاری خواردن و خواردنەوە بکات و بزانێ چیمان هەیە و چیمان نییە.

هەشتەم ووتی هاوسەری من دەستلێدانی وەکو دەست دانە لە کەروێشکی نەرم و نۆڵە ، بۆنی زۆر خۆشە وەکو بۆنی زافەران ( زرنب )ە[3] ، من بەسەریدا زاڵم لە ماڵێکدا پیاوان بەسەر هاوسەرەکانیاندا زاڵن.

نۆهەم ووتی : هاوسەری من ڕشتەی نەژادی باب و باپیرانی بەرزو بڵند و شکۆدارن ، بالای بەرزە ، خۆڵەمێشی زۆرە[4]ومیواندارو بەخشندەیە، ماڵی لە کۆڕو کۆمەڵی خەلکی نزیکە (( ئامادەیە بۆ میوانداریان )).

---

[1] ( المطلقة ) هەڵاوەسراو واتە ئافرەتێك هاوسەرەکەی تەلاقیشی نەداوە و هاوسەرایەتیشی لەگەڵدا ناکات و بەلایدا نەچێت .

[2] واتە پێخەفەکەی لەخۆ دەپێچێت بەتەنها و لەگەڵ هاوسەرەکەی ناخەوێت و سودی نییە بۆی .

[3] (( زربن )) یان (( الزرنب )) واتە : زافەران یان چاوە کوللە ، قاموسی ڕستە ، ب٢ ، ل١٠٦٤ .

[4] لەناو عەرەبدا کەسێك میواندار بێت دەڵێن (( خۆڵەمێشی زۆرە )) واتە بەخشندەیە و میوانیان زۆرە و ئاگر دەکەنەوە بۆیە خۆڵی ئاگریان زۆرە .

دەهەم ووتی : هاوسەری من ناوی مالیکه ، چ مالیکێك ؟ لە هەموو مالیکەکان چاکتر ، وشتری زۆرو لەوەڕگەی کەم ومۆڵگەی[1] زۆری هەیە،وشترەکان کەگوێیان لەدەنگی کۆچان وکۆپان دەبێت دڵنیان بۆسەربڕینە.

پانزەهەم ووتی : هاوسەری من ئەبو زەرعەیە کام ئەبو زەرعەیە ؟ کە سەرم جوڵاند دەزانی چی خشڵێکم لە گوێدایە ، باسك و بازوەکانمی خروخۆڵ و گۆشتن کردوون و کردومە بە خاوەنی ڕەو ئەسپ و وشتر و ڕەشە ولاخی گێرەکردن ، خەلەو خەرمان و گەنم سورکردن پیشەیەتی ، کە قسە دەکەم بەدرۆم ناخاتەوە ، هەتا بەیانی دەخەوم[2] هەڵمناسێنێ ، بەکەیفی خۆم ئاو و شەربەت دەخۆمەوە لەکاتێکدا خەڵکی ئاواتی پێ دەخوازن و دەستیان ناکەوێت.

ئینجا _ام أبی زرع ) ) دایکی ئەبی زەرع ، دایکی ئەبی زەرع چۆن خانمێکە ؟ قاپ و دەفرەکانی گەورەن ، ماڵەکەی فراوانە کوڕی ئەبی زەرعە ، چۆن کوڕێکە کوڕی ئەبی زەرعە ؟ باریك و داڵکۆشتە دەڵێ هێڵی نەخش و نیگاری کالانی شمشێرە ، چەند گرنگە گۆشتێکی باسکی کارژێلە و بەرخۆ تێری دەکات، کچی ئەبی زەرع ، ئای کچێکە کچەکەی ئەبی زەرع ؟ گوێڕایەڵ و گوێ لە مشتی دایك و باوکیەتی ، خروخۆڵ و گۆشتن و نەرم و نۆڵە و جل و بەرگی زۆر لێ دێ و دەڵێ نەخش و نیگارە پێیانەوە ، خانمی تاقانەی کەسوکاریەتی ، هەوێساری دراوسێکانیەتی .[3]، کەنیزەکەی ئەبی زەرعە ، چۆن کەنیزەکێکە ؟ هەرگیز قسەو نهێنیان ناگێڕێتەوە و بڵاوی ناکاتەوە ، پێویستی ناوماڵیان بە ڕاسپاردە دەزانێ و هەرگیز زایەی ناکات و هەرگیز ڕێگەیان نادات ماڵ پیس و خشت و خۆڵاوی بێت.

جارێك ئەبوزەرع ڕۆیشت بۆ گەشتی بازرگانی لەکاتێکدا گوتانەکان شیریان لێ ئەرژا[4]، بەلای ئافرەتێکی شۆخ و شەنگی تازە پێگەیشتوودا تێپەڕییوو دوو کوڕی بچوکی خڕو خۆڵ و باوەزو ئەستوری لەگەڵ بوون هەر وەکو بەچکە پڵنگ وابون لە ژێر باڵی دیکیاندا

---

[1] زۆر کەم ڕەوانەی لەوەڕگە دەکرێن تا نزیکە ماڵ بن ، نزیکە دەست بن بۆسەربڕین و میوانداری .

[2] هەتا بەیانی دەخەوم ئەوەندە خۆشی دەوێم خەبەرم ناکاتەوە و ئەوك خەوم لێ بزڕێ .

[3] واتە : لەناو کژ و کیژۆڵەی دەرودراوسێدا وێنەی نییەو وەکو هەوێ کەیفیان پێ نایەت چونکە لەبەر ئەو کەس لە ئەوان ناڕوانێت .

[4] بەیانی زوو ڕۆیشت بۆ سەفەر .

**یاریان بە دوو هەنارەکەی [1] دەکرد ئیتر منی تەلاقداو ئەوی مارەکرد ، منیش دوای ئەو شومکرد بە پیاوێکی دەوڵەمەند کە هەر بە سواری ئەسپ دەگەڕاو بەردەوام تیروکەوانی لە شاندا بوو ، بەهرەی زۆری بەسەردا ڕشتم لەهەموو ئاژەڵێك جۆرێکی بۆ ڕاگرتبووم ، پێشی دەوتم ئەی ئوم زەرع بەکەیفی خۆت قاچی لێ ڕاکێشەو بەشی کەس و کاریشی لێ بدە ، بەلاّم ئەگەر هەموو ئەو شتانەی بۆ منی دابین کردبوون و پێی بەخشیبووم بچوکترین قاپی ئەبو زەرع نەدەبوو ، جا پێغەمبەر( ﷺ ) فەرمووی : ئەی عائیشە من بۆ تۆ وەکو ئەبو زەرع وام بۆ ئوم زەرع بەلاّم ئەوەندە هەیە من هەرگیز تەلاّق ناخۆم .**

(مختصر الشمائل ص ١٣٤)

٥٩٠٢- أسرف رجل على نفسه فلما حضره الموت أوصى بنيه فقال: إذا أنا مت فأحرقوني ثم اسحقوني ثم اذروني في البحر فوالله لئن قدر علي ربي ليعذبني عذابا ما عذبه أحدا ففعلوا ذلك به فقال الله للأرض: أدي ما أخذت فإذا هو قائم فقال: ما حملك على ما صنعت ؟ قال خشيتك يا رب فغفر له بذلك.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة .

**٥٩٠٢- پیاوێك زیادەڕەوی زۆری کردبوو لە تاوان کردندا، لەسەرە مەرگدا کوڕەکانی ڕاسپارد و، ووتی: کاتێك مردم بمسوتێنن و بمهاڕن و ووردم بکەن، ئینجا بمخەنە نێو دەریاوە، چونکە سوێند بەخوا ئەگەر پەروەردگارم بە سەرمدا زاڵ بێت ئەشکە نجەیەکم دەدات کەسی بەو شێوەیە ئەشکە نجە نەدابێت، ئیتر ئەوانیش ڕاسپاردەکەیان بەجێهێنا، جا خوای گەورە بە زەوی فەرمووی: ئەوەی وەرگرت بیدەرەوە، ئیتر کابرا ڕاست بوەوە، خوا پێی فەرمووی: بۆ واتکرد؟ ووتی: لێت ترسام ئەی پەروەردگارم، جا خوای گەورە، بەوە لێی خۆش بوو .**

(المشكاة ٢٣٦٩)

٥٩٠٣- اشترى رجل من رجل عقارا له فوجد الرجل الذي اشترى العقار في عقاره جرة فيها ذهب فقال الذي اشترى العقار: خذ ذهبك مني إنما اشتريت منك الأرض و لم أبتع الذهب و قال الذي له الأرض: إنما بعتك الأرض و ما فيها فتحاكما إلى رجل فقال الذي

---

[1] **واتە : یاریان بە چووتە مەمکی دایکیان دەکرد ..**

تحاكما إليه: ألكما ولد ؟ قال أحدهما: لي غلام و قال الآخر: لي جارية قال: أنكحوا الغلام الجارية و أنفقوا على أنفسكما منه و تصدقوا.

(صحيح) ( حم ق ه ) عن أبي هريرة .

**٥٩٠٣- پیاوێك زەوییەكی لە پیاوێك كڕی و كووپەیەك ئاڵتوونی تیا دۆزییەوە، كڕیارەكە ووتی: ئاڵتوونەكەت ببەوە، چونكە من تەنها زەوییەكەم لێت كڕیوی و، ئاڵتوونم لێت نەكڕیوی، فرۆشیارەكە ووتی: من زەوی و هەرچی لە زەویدایە پێم فرۆشتووی، ئیتر هەردووكیان سكاڵایان بردە لای پیاوێك و، ئەویش ووتی: ئایا منداڵتان هەیە؟ یەكێكیان ووتی : كوڕێكم هەیە ، ئەوەیكەش ووتی : كچێكم هەیە، ووتی: كچەكە لە كوڕەكە مارە بكەن، ئەو ئاڵتوونەیش بۆ خۆتان خەرج بكەن و خێریشی لێ بكەن.**

(المشكاة ٢٨٨٢)

٥٩٠٤- انطلق ثلاثة رهط ممن كان قبلكم حتى أووا المبيت إلى غار فدخلوه فانحدرت عليهم صخرة من الجبل فسدت عليهم الغار فقالوا: إنه لا ينجيكم من هذه الصخرة إلا أن تدعوا الله بصالح أعمالكم " قال رجل منهم: اللهم كان لي أبوان شيخان كبيران و كنت لا أغبق قبلهما أهلا و لا مالا فنأى بي في طلب شيء يوما فلم أرح عليهما حتى ناما فحلبت لهما غبوقهما فوجدتهما نائمين فكرهت أن أغبق قبلهما أهلا أو مالا فلبثت و القدح على يدي أنتظر استيقاظهما حتى برق الفجر فاستيقظا فشربا غبوقهما اللهم إن كنت فعلت ذلك ابتغاء وجهك ففرج عنا ما نحن فيه من هذه الصخرة ؟ فانفرجت شيئا لا يستطيعون الخروج " و قال الآخر: اللهم كانت لي ابنة عم كانت أحب الناس إلي فأردتها على نفسها فامتنعت مني حتى ألمت بها سنة من السنين فجاءتني فأعطيتها عشرين و مائة دينار على أن تخلي بيني و بين نفسها ففعلت حتى إذا قدرت عليها قالت: لا أحل لك أن تفض الخاتم إلا بحقه فتحرجت من الوقوع عليها فانصرفت عنها و هي أحب الناس إلي و تركت الذهب الذي أعطيتها اللهم إن كنت فعلت ذلك ابتغاء وجهك فافرج عنا ما نحن فيه فانفرجت الصخرة غير أنهم لا يستطيعون الخروج منها " و قال الثالث: اللهم استأجرت أجراء فأعطيتهم أجرهم غير رجل واحد ترك الذي له و ذهب فثمرت أجره حتى كثرت منه الأموال فجاءني بعد حين فقال: يا عبد الله أدني أجري فقلت له: كل ما ترى من أجرك من الإبل و البقر و الغنم و الرقيق فقال: يا عبد الله لا تستهزئ بي

فقلت: إني لا أستهزئ بك فأخذه كله فاستاقه فلم يترك منه شيئا اللهم فإن كنت فعلت ذلك ابتغاء وجهك فافرج عنا ما نحن فيه فانفرجت الصخرة فخرجوا يمشون.

(صحيح) ( ق ) عن ابن عمر .

**٥٩٠٤- سێ کەس لەوانەی پێش ئێوە لەماڵ دەرچوون و بۆ شەو نشینی پەنایان بردە ئەشکەوتێك و چوونە ژوورەوە، تاوێرێك لەسەر شاخەکەوە کەوتە خوار و، دەمی ئەشکەوتەکەی لێ گرتن، بەیەکتریان ووت: هیچ ڕزگارتان ناکات لەم تاوێرە ئەوە نەبێت لەخوا بپاڕێینەوە بە کارە چاکەکانتان، یەکێکیان ووتی: خوایە من باوك و دایکێکی پیرم هەبوو، هیچ کاتێکیش لە پێش ئەوانەوە شیرم بە خێزان و منداڵم نەدەدا، جا ڕۆژێکیان دوورکەوتمەوە و کاتێك گەڕامەوە خەوتبوون، بەشە شیرەکەم بۆ دۆشین و بینیمن خەوتبوون، پێشم ناخۆش بوو پێش ئەوان شیر بە خێزان و منداڵەکانم بدەم، لە خەوەکەشیان هەڵمنەساندن تاکو بەرەبەیان، ئەو کاتە هەڵسان و شیرەکەیان خوارد، خوایە ئەگەر ئەوەم لە پێناو تۆدا کردووە دەروێکمان لێ بکەرەوە لەم تاوێرە؟ یەکسەر تاوێرەکە جوڵاو دەرویەکی بچوکی لێ کردنەوە بەڵام نەیاندەتوانی لێوەی بێنە دەرەوە، یەکێکی تریان ووتی: خوایە من کچێکی ئامۆزام هەبوو، لەهەمو کەسم زیاتر خۆشدەویست وداوام دەکردو ئەو پێم ڕازی نەدەبوو ، تاکوساڵێکیان زۆر تینی گەیشتێ و هاتەلام و، منیش سەد و بیست دینارم[1] پێداو، بەمەرجێك خۆیم تەسلیم بکات ، ئەویش بەناچاری ڕازی بوو، هەتا کەوتە بەردەستم، ووتی: بۆت ڕەوا نییە مۆری داخراو بشەمزێنی بەمافی خۆی نەبێت، منیش بەگوناهم زانی خراپەی لەگەڵ بکەم و یەکسەر بە جێم هێشت، لەکاتێکدا خۆشەویستترین کەس بووە بەلامەوە، ئاڵتونەکەشم پێ بەخشی ، جا خوایە ئەگەر ئەوەم لە پێناوی تۆدا کردووە دەرویەکمان لێ بکەرەوە لەم حاڵەی کە ئێمەی تیایداین، تاوێرەکە کەمێکی تر لاچوو و کەلێنیان لێ کرایەوە، بەڵام نەیاندتوانی لێی بێنە دەر، سێ یەمیان ووتی: خوایە من چەند کرێکارێکم بەکرێ گرت و کرێکەیانم پێدان یەکێکیان نەبێت کە کرێکەی وەرنەگرت و ڕۆیشت، منیش ڕۆژانەکەم بۆ خستە کارەوە هەتاکو زۆر بووبوویەوە، پاش ماوەیەك هاتە لام و، ووتی: ئەی پیاوی خوا ڕۆژانەکەم پێ بدە، پێم ووت: ئەو هەموو ووشتر و مانگا و مەڕ و کۆیلانە ڕۆژانەی تۆیە، ئەویش ووتی ئەی پیاوی خوا گاڵتەم پێ مەکە، ووتم: من گاڵتەت پێ ناکەم،**

[1] مەبەست لە ١٢٠ مسقاڵ ئاڵتونە.( وەرگێڕ )

**ئەویش هەمووی پێش خۆیداو بردی و هیچی لێ بەجێنەهێشت، خوایە ئەگەر ئەوەم لە پێناوتۆدا کردووە ڕزگارمان بکە لەو تەنگانەی تێی کەوتووین، ئەمجارە تاوێرەکە بە جارێ لاچوو، ئەوانیش هاتنە دەرەوە و ڕۆیشتن.**

(الترغيب ١)

٥٩٠٥- أوما علمت ما أصاب صاحب بني إسرائيل ؟ كانوا إذا أصابهم شيء من البول قرضوه بالمقاريض فنهاهم صاحبهم فعذب في قبره.

(صحيح) ( حم ن ) عن عبدالرحمن بن حسنة .

**٥٩٠٥- ئایا نەتزانیوە چی بەسەر هاوەڵەکەی بەنی ئیسرائیل هات؟ ئەوان کەکەمێك میزیان بەرکەوتایە شوێنەکەیان بە مەقەست دەبڕی، ئەو هاوەڵاشیان ئەوەی لێ قەدەغە دەکردن بۆیە لەگۆڕەکەیدا ئەشکە نجە دەدرا .**

(المشكاة ٣٧١)

٥٩٠٦- انتسب رجلان على عهد موسى فقال أحدهما: أنا فلان بن فلان حتى عد تسعة فمن أنت لا أم لك ؟ قال: أنا فلان بن فلان ابن الإسلام فأوحى الله إلى موسى أن قل لهذين المنتسبين: أما أنت أيها المنتسب إلى تسعة في النار فأنت عاشرهم في النار و أما أنت أيها المنتسب إلى اثنين في الجنة فأنت ثالثهما في الجنة.

(صحيح) ( ن هب الضياء ) عن أبي .

**٥٩٠٦- دوو کەس لەسەردەمی موسا باسی ڕەچەڵەکی خۆیان کرد، یەکێکیان وتی: من فلانی کوڕی فلانم تاکو نۆ باپیرەی خۆی ژمارد، ئەی تۆ کێیت ئەی بێ دایك؟ وتی: من فلانی کوڕی فلانی کوڕی ئیسلامم، ئیتر خوای گەورە وەحی نارد بۆ مووسا بەو دووکەسە بڵێ: تۆ ئەی ئەو کەسەی تۆ پشتی خۆت بژارد کە هەموویان لە دۆزەخدان و، تۆش دەیەمیانی لە دۆزەخدا، تۆیش ئەی ئەو کەسەی خۆت دایە پاڵ دوو کەس کە لە بەهەشتدان و تۆش سێیەمیانی لەبەهەشتدا.**

(الصحيحة ١٢٧٠)

٥٩٠٧- إن أول من سيب السوائب و عبد الأصنام أبو خزاعة عمرو بن عامر و إني رأيته في النار يجر أمعاءه فيها.

(صحيح) ( حم ) عن ابن مسعود .

**٥٩٠٧- يەكەمين كەس ووشترى لەقەبەڵ بتەكان [١] و بتى پەرست (ابـو خزاعـه بـن عـامر) بوو، من ئەوم بينى لە ناو دۆزەخدا ڕيخۆڵەكانى خۆى ڕادەكێشا.**

(الصحيحة ١٦٧٧)

٥٩٠٨- إن بني إسرائيل لما هلكوا قصوا.

(صحيح) ( طب الضياء ) عن خباب .

**٥٩٠٨- بەنى ئيسرائيل كاتێك لەنێو چوون دەستيان كرد بە سەرگوزشتە گێڕانەوە [٢].**

(الصحيحة ١٦٨١)

٥٩٠٩- إن بني إسرائيل كتبوا كتابا فاتبعوه و تركوا التوراة.

(صحيح) ( طب ) عن أبي موسى .

**٥٩٠٩- بەنى ئيسرائيل نووسراوێكيان نووسى و شوێنى كەوتن و، وازيان لە تەورات هێنا.**

(الصحيحة ٢٨٣٢)

٥٩١٠- إن ثلاثة نفر في بني إسرائيل: أبرص و أقرع و أعمى بدا لله أن يبتليهم فبعث إليهم ملكا فأتى الأبرص فقال: أي شيء أحب إليك ؟ قال: لون حسن و جلد حسن قد قذرني الناس فمسحه فذهب و أعطي لونا حسنا و جلدا حسنا فقال: أي المال أحب إليك ؟ قال: الإبل فأعطي ناقة عشراء فقال: يبارك لك فيها " و أتى الأقرع فقال: أي شيء أحب إليك ؟ قال: شعر حسن و يذهب هذا عني قد قذرني الناس فمسحه فذهب و أعطي شعرا حسنا قال: فأي المال أحب إليك ؟ قال: البقر فأعطاه بقرة حاملا و قال: يبارك لك فيها " و أتى الأعمى فقال: أي شيء أحب إليك ؟ قال: يرد الله إلي بصري فأبصر به الناس فمسحه فرد الله إليه بصره قال: فأي المال أحب إليك ؟ قال: الغنم فأعطاه شاة والدا فأنتج هذان و ولد هذا فكان لهذا واد من إبل و لهذا واد من بقر و لهذا واد من غنم " ثم إنه أتى الأبرص في صورته و هيئته فقال: رجل مسكين تقطعت به الحبال في سفره فلا بلاغ اليوم إلا بالله ثم بك أسألك بالذي أعطاك اللون الحسن و الجلد الحسن و المال بعيرا أتبلغ عليه في سفري فقال له: إن الحقوق كثيرة فقال له: كأني أعرفك ألم تكن أبرص

---

[١] **لەقەبەڵ بتەكانيان كردو ئيتر نەدەبوو كەس سواريان بێت.**

[٢] **مەناوى دەڵێت : واتە كاتێك تياچوون بە وازهێنان لە كردەوەى باش دەستيان دايە گێڕانەوەى بەسەرهات و سەرگوزشتە، دەڵێم: مامۆستامان ووتويەتى: با باوەڕدار تەماشاى زۆرێك لە موسوڵمانان بكات ، چۆن وەكو ئەوانيان بەسەر هاتووە لە زانستى بەسود و كردەوەى چاك.**

يقذرك الناس فقيرا فأعطاك الله ؟ فقال: لقد ورثت لكابر عن كابر فقال: إن كنت كاذبا فصيرك الله إلى ما كنت " و أتى الأقرع في صورته و هيئته فقال له مثل ما قال لهذا و رد عليه مثل ما رد عليه هذا قال إن كنت كاذبا فصيرك الله إلى ما كنت " و أتى الأعمى في صورته و هيئته فقال: رجل مسكين و ابن سبيل و تقطعت بي الحبال في سفري فلا بلاغ اليوم إلا بالله ثم بك أسألك بالذي رد عليك بصرك شاة أتبلغ بها في سفري ؟ فقال: قد كنت أعمى فرد الله بصري و فقيرا فخذ ما شئت فوالله لا أحمدك اليوم لشيء أخذته لله فقال: أمسك مالك فإنما ابتليتم فقد رضي الله عنك و سخط على صاحبيك.

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة .

**٥٩١٠- سێ کەس لەبەنی ئیسرائیل: بەڵەکێك و کەچەڵێك و کوێرێك، خوای گەورە تاقیکردنەوە، فریشتەیەکی ناردەلایان، چووە لای بەڵەکەکە و،ووتی: چی شتێکت زۆر حەز لێ یە؟ وتی: ڕەنگێکی جوان و پێستێکی جوان، بەڕاستی خەڵکی قێزم لێ دەکەن، فریشتەکە دەستی پیا هێنا و چاك بومەوە، ڕەنگ و پێستێکی جوانی بۆ دروست بوو، ئینجا وتی: چی جۆرە ماڵێکت زۆر حەز لێ یە؟ وتی: ووشتر، ئیتر ووشترێکی ئاوسی پێ درا، وتی پیرۆزت بێ ، ئینجا هاتە لای کەچەڵەکە و، وتی: چی شتێکت زۆر حەز لێ یە؟ وتی: قژێکی جوان، چونکە خەڵکی قێزم لێ دەکەنەوە، ئەویش دەستێکی پیا هێنا و کەچەڵیەکەی نەما و، قژێکی جوانی پێدرا، پێی وت: چی جۆرە ماڵێکت زۆر حەز لێ یە؟ وتی: ڕەشە ولاخ، ئەویش مانگایەکی ئاوسی پێدرا و، ووتی: پیرۆزت بێت. ئینجا هاتە لای کوێرەکە و، وتی: چی شتێکت زۆر حەز لێ یە؟ وتی: خوای گەورە چاوم بۆ بگێڕێتەوە و خەڵکی پێ ببینم، ئەویش دەستی هێنا بە چاویدا و، خوای گەورە چاوی بۆ گێڕایەوە، وتی: چی ماڵێکت زۆر حەز لێ یە؟ ووتی: مەڕو بزن، ئەویش مەڕێکی پێدا و، مەڕەکە زا، جا هەریەکێك لەو سێ کەسە ئەویان بووە خاوەنی دۆڵێك ووشتر ئەویان بوە خاوەنی دۆڵێك مانگاو ئەویشیان بووە خاوەنی دۆڵێك مەڕ. پاشان هاتە لای بەڵەکەکە لەهەمان دیمەن و شێوەی یەکەم جاردا و، وتی: پیاوێکی هەژارم و ڕێبوارم پەکم کەوتووە ، بە ئومێدی خوا و، پاشان بەیارمەتی نەبێت ناگەمەوە شوێنی خۆم، تکات لێ دەکەم بەو کەسەی ئەو ڕەنگ و پێستە جوانە و ماڵە زۆرەی پێدای یارمەتیم بدەیت، ئەویش ووتی: خەرج و مافی زۆرم لەسەرە، ئەویش پێی وت: دەڵێی دەتناسم، ئایا تۆ بەڵەك نەبووی خەڵکی قێزیان لێ دەکردی، هەژاریش بووی خوا دەوڵەمەندی کردی؟ وتی: نەخێر ئەمەم لە**

**باو باپیرا نمەوە بۆ ماوەتەوە، وتی: ئەگەر درۆزن بیت خوا وەکو جارانت لێ بکاتەوە. ئینجا هاتە لای کەچەڵەکە لە هەمان دیمەن و شێوەی خۆیدا، هەمان ئەو قسانەی بۆ ئەویش کرد، ئەویش هەمان وەڵامی بەڵەکەکەی دایەوە، فریشتەکەش پێی ووت: ئەگەر درۆ بکەی خوا وەکو جارانت لێ بکاتەوە، ئینجا هاتە لای کوێرەکە لە هەمان دیمەن و شێوەی خۆیدا و، ووتی، پیاوێکی هەژارو رێبوارم لەکەسوکارم دابڕاوم بە ئومێدی خواو ئینجا بە یارمەتی تۆ نەبێت ناگەمەوە جێگای خۆم، تکات لێ دەکەم بەوەوەی چاوی بۆ گێرایتەوە، مەڕێکم پێ ببەخشە بەڵکو بگەمەوە جێگای خۆم، ووتی: من کوێر بووم و خوای گەورە چاوی ساغ کردمەوە، هەژاریش بووم دەوڵەمەندی کردم، جا چەندت حەز لێیە ئەوەندە ببە، سوێند بەخوا منەتت نازانم چەند دەبەیت بیبە. ئەویش وتی: ماڵی خۆت بۆ خۆت، ئێوە تاقیکرانەوە و، خوای گەورە لەتۆ ڕازی بوو، خەشم و تووڕەییلە دوو هاوڕێکەت تووڕە گرت.**

(الصحيحة ٣٥٢٣)

٥٩١١- إن رجلا حضره الموت فلما أيس من الحياة أوصى أهله إذا أنا مت فاجمعوا لي حطبا كثيرا جزلا ثم أوقدوا فيه نارا حتى إذا أكلت لحمي و خلصت إلى عظمي فامتحشت فخذوها فاطحنوها ثم انظروا يوما راحا فاذروها في اليم ففعلوا ما أمرهم فجمعه الله و قال له: لم فعلت ذلك ؟ قال: من خشيتك فغفر له.

(صحيح) ( حم ق ن ه ) عن حذيفة وأبي مسعود .

**٥٩١١- پیاوێك هاتە سەرە مەرگ، کاتێك بێ ئومێد بوو لە ژیان، بە کەس و کارەکەی ڕاسپاردە ئەگەر من مردم دارێکی زۆر و زوندم بۆ کۆکردنەوە و گڕی بەربدەن، کاتێك بەتەواوی گۆشتی لەشی سوتاندم ئێسقانەکانم نهارن و بیکەن بە خۆڵەمێش، ئینجا لە ڕۆژێکدا بایەکی توندی هەبێت خۆڵە مێشەکەم بدەن بەدەم باوە بەرەو دەریا، ئەوانیش وایانکرد، ئینجا خوای گەورە خۆڵەمێشی کۆی کردەوە و پێی فەرموو: بۆ واتکرد؟ وتی: لەترسی تۆ، خوای گەورە یەکسەر لێی خۆش بوو.**

(الصحيح النسائي ٢٠٧٩)

٥٩١٢- إن رجلا قال: و الله لا يغفر الله لفلان قال الله: من ذا الذي يتألى علي أن لا أغفر لفلان ؟ ! فإني قد غفرت لفلان و أحبطت عملك.

(صحيح) ( م ) عن جندب البجلي .

**٥٩١٢- پیاوێـك وتـی: سـوێند بـەخوا خـوا لـەفلان كـەس خـۆش نابێـت، خـوای گـەورە فەرمووی: ئەوە كێیە خوایەتیم بەسەرەوە دەكات كە لـە فلانكـەس خـۆش نـەبم، مـن لـە فلان كەس خۆش بووم و كردەوەی تۆیشم پوچەڵ كردەوە.**

٥٩١٣- إن رجلا كان قبلكم رغسه الله مالا فقال لبنيه لما حضر: أي أب كنت لكم ؟ قالوا: خير أب قال: إني لم أعمل خيرا قط فإذا مت فأحرقوني ثم اسحقوني ثم ذروني في يوم عاصف ففعلوا فجمعه الله فقال: ما حملك ؟ قال: مخافتك فتلقاه برحمته.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي سعيد .

**٥٩١٣- پیاوێك لەوانەی پێش ئێوە خوای گەورە دەوڵەمەندی كردبوو لەسەرە مەرگیدا بـە كوڕەكانی و وت: چۆن بـاوكێك بووم بۆتـان؟ وتیان: چـاكترین بـاوك، وتـی: مـن هـەرگیز چاكەم نەكردووە، بۆیە كاتێك مردم بمسوتێنن و بمهاڕن و بمدەن بەدەم گێژەلولەیـەكی توندەوە، ئەوانیش وایانكرد و، خوای گەورە كۆی كردەوە، ووتـی: بۆچـی واتكـرد؟ وتـی: لەترسی تۆ، ئیتر خوای گەورە بە میهرەبانی پێشوازی لیكرد.**

(الترغيب ٣٣٧٤)

٥٩١٤- إن رجلا ممن كان قبلكم خرجت به قرحة فلما آذته انتزع سهما من كنانته فنكأها فلم يرقأ الدم حتى مات فقال الله: عبدي بادرني بنفسه حرمت عليه الجنة.

(صحيح) ( حم ق ) عن جندب البجلي .

**٥٩١٤- پیاوێك لەوانەی پێش ئێوە برینێك لەلاشەیدا دروست بوو، كاتێك تـەواو ئـازاری پێ گەیان، تیرێكی لە تیردانەكەی دەركرد و زامەكەی لەت لەت كرد و خوێنەكەی بـەربوو نەوەستـایەوە هـەتـا و مـرد، خـوای گـەورەیش فـەرمووی: بەنـدەم دەسـت پێـشخەری كـرد لەمردنی خۆی، بۆیە بەهەشتم لێ قەدەغە كرد.**

(الترغيب ٢٤٥٦)

٥٩١٥- بلغوا عني و لو آية و حدثوا عن بني إسرائيل و لا حرج و من كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار

(صحيح) ( حم خ ت ) عن ابن عمرو .

**٥٩١٥- لەمنەوە ڕاگەیەنن ئەگەر ئایەتێكیش بێت، لەبەنی ئیسرائیلیش بگێڕنەوە و گونـاه نییـە، هەركسیش بە ئەنقەست درۆم بەدەمەوە بكات با جێگای خۆی لە دۆزەخدا دیاری بكات.**

(الروض النضير ٥٨٢)

٥٩١٦- بينا رجل بفلاة من الأرض فسمع صوتا في سحابة يقول: اسق حديقة فلان فتنحى ذلك السحاب فأفرغ ماءه في حرة فإذا شرجة من تلك الشراج قد استوعبت ذلك الماء كله فتتبع الماء فإذا رجل قائم في حديقته يحول الماء بمسحاته فقال له: يا عبد الله ما اسمك ؟ قال: فلان للاسم الذي سمع في السحابة فقال له: يا عبد الله لم تسألني عن اسمي ؟ قال: إني سمعت صوتا في السحاب الذي هذا ماؤه يقول: اسق حديقة فلان لاسمك فما تصنع فيها ؟ قال: أما إذ قلت هذا فإني أنظر إلى ما يخرج منها فأتصدق بثلثه و آكل أنا و عيالي ثلثا و أرد فيها ثلثا.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي هريرة .

**٥٩١٦- لە كاتێكدا پیاوێك لە زەویەكی چۆڵەوانیەكدا بوو ، دەنگێكی لە هەورەوە بیست دەیووت: باخی فلانكەس ئاو بدە، ئیتر هەورەكەش كشا بەرەو ئەو شوێنە و هەموو ئاوەكەی لە ئاوچەیەكی بەرداوی دابارانـد، ئیتر هەنـدێ جۆگەلـە رشێژكەئاو هەموو ئاوەكەیان لە خۆ گرت، ئەویش بەدوای ئاوەكەدا رۆیشت و پیاوێكی بینی بە بێڵەكەی ئاوەكە لادەدا، ووتی: ئەی بەنـدەی خـوا نـاوت چییە؟ ووتی: فلان- ئەو نـاوەبوو كەلەهەورەكە گوێی لێ بوو- ئینجا پێی وت: ئەی پیاو خوا بۆ پرسیاری نـاوم دەكەیت؟ وتی: من گوێم لە دەنگێك بوو لە نێو ئەو هەورەی كە ئەم ئـاوەی بارانـد دەیـووت: بـاخی فلانكەس ئاو بدە، ئایا تۆ چی لەم باخە دەكەیت؟ وتی: مادام وا دەڵێی ، من بەرووبومی ئەم باخە دەكەم بە سێ بەشەوە ، بەشێكی دەبەخشم و بەشێكی بۆ خۆم و منداڵەكانم و بەشێكیشی لەزەویەكە دەژێنم.**

(الصحيحة ١١٩٧ )

٥٩١٧- بينما رجل يجر إزاره من الخيلاء خسف به فهو يتجلجل في الأرض إلى يوم القيامة.

(صحيح) ( حم خ ن ) عن ابن عمر .

**٥٩١٧- لە كاتێكدا پیاوێك بەفیزەوە پۆشاكەكەی بەدوای خۆیدا ڕادەكێشا ، بە نـاخی زەویدا و ڕۆچوو ، هەتا ڕۆژی قیامەت ناڵەو نركەی دێت .**

(الصحيحة ١٥٠٧ )

٥٩١٨- بينما رجل يمشي بطريق اشتد عليه العطش فوجد بئرا فنزل فيها فشرب منها ثم خرج فإذا هو بكلب يلهث يأكل الثرى من العطش فقال: لقد بلغ هذا الكلب من العطش مثل الذي بلغ بي فنزل البئر فملأ خفه ماء ثم أمسك بفيه ثم رقي فسقى الكلب فشكر الله فغفر له في كل ذات كبد رطبة أجر.

(صحيح) ( مالك حم ق د ) عن أبي هريرة .

**٥٩١٨- لە کاتێکاد پیاوێك بە ڕێگایەکدا ڕێی دەکرد ، زۆر تینووی بوو ، بیرێکی بینی ، دابەزییە ناوی و ئاوی لیٚ خواردەوەو ئینجا هاتە دەر ، لەو کاتە سەگێکی بینی هەناسە برکێیەتی و لە تینوێتیدا خۆڵی تەڕ دەخوات ، ووتی: ئەو سەگەش وەکو من لە تینوا تینی بۆ هاتووە ، ئینجا دووبارە دابەزییەوە نێو بیرەکەو پێلاوەکەی پڕ کرد لە ئاوو بە دەمی گرتی و سەرکەوتەوە سەرەوە و دای بە سەگەکە ، خوای گەورە سوپاسی کرد لەسەر ئەو کردارەی و لێی خۆش بوو ، یارمەتیدانی هەر گیاندارێك پاداشتی لەسەرە.**

(الصحيحة٢٩ )

٥٩١٩- بينما رجل يمشي بطريق وجد غصن شوك على الطريق فأخره فشكر الله له فغفر له.

(صحيح) ( مالك حم ق ن ) عن أبي هريرة .

**٥٩١٩- لە کاتێکدا پیاوێك بەڕێگەیەکدا دەڕۆیشت بە تەنها ، چڵە دڕکێکی لەسەر ڕێگاکە بینی و لایبرد ، خوای گەورە سوپاسی کرد لەسەر ئەو کردارەی و لێی خۆش بوو.**

(الترغيب ٢٩٧٦ )

٥٩٢٠- بينما رجل يمشي في حلة تعجبه نفسه مرجل جمته إذ خسف الله به الأرض فهو يتجلجل فيها إلى يوم القيامة.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة .

**٥٩٢٠- لە کاتێکدا پیاوێك بەڕێگەدا دەڕۆیشت بە پۆشاکێکی ڕازاوەو بەخۆی دەنازی ، قژی داهێنا بوو بەسەر شانیدا هاتبونە خوار ، لەو کاتەدا خوای گەورە بردی بەناخی زەویدا و هاوار دەکات تا ڕۆژی قیامەت.**

(الترغيب ٢٩١٦)

٥٩٢١- بينما كلب يطيف بركية كاد يقتله العطش إذ رأته بغي من بغايا بني إسرائيل فنزعت موقها فاستقت له به فغفر لها.

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة .

**٥٩٢١- لە کاتێکدا سەگێك بە دەوری بیرێکدا دەهات و دەڕۆیی خەریك بوو لەتینوا تیا بچیٚ ، لەو کاتە ئافرەتێکی داوێن پیس لە داوێن پیسەکانی بەنی ئیسرائیل بینی و پێلاوەکەی داکەند لە بیرەکە ئاوی بۆ هەڵکێشا و خوای گەورەیش بەوە لیٚ ی خۆش بوو.**

(الصحيحة ٣٠ )

٥٩٢٢- حدثوا عن بني إسرائيل و لا حرج.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة .

**٥٩٢٢- بەسەرهات بگێڕنەوە لە بەنی ئیسرائیل و، گوناهیش نییە[1].**

(الضعيفة ٣٤٨٢ )

٥٩٢٣- قال لي جبريل: لو رأيتني و أنا آخذ من حال البحر فأدسه في في فرعون مخافة أن تدركه الرحمة.

(صحيح) ( حم ك ) عن ابن عباس.

**٥٩٢٣- جیبریل پێی وتم : ئای ئەگەر دەتبینیم چۆن لە قوڕە ڕەشە بۆگەنەکەی دەریاکەم هەڵدەگرت و دەمکردە دەمی فیرعەونەوە نەوەك میهرەبانی خوا بیگرێتەوە.**

(الصحيحة ٢٠١٥ )

٥٩٢٤- القصاص ثلاثة: أمير أو مأمور أو مختال.

(صحيح) ( طب ) عن عوف بن مالك وكعب بن عياض.

**٥٩٢٤- چیرۆك خوان سێ کەسن : فەرمانڕەوا و ، فەرمان پێکراو و ، لە خۆبایی.**

(الصحيحة٢٠ )

٥٩٢٥- كان رجلان في بني إسرائيل متواخيان و كان أحدهما مذنبا و الآخر مجتهدا في العبادة و كان لا يزال المجتهد يرى الآخر على الذنب فيقول: أقصر فوجده يوما على ذنب فقال له: أقصر فقال: خلني و ربي أبعثت علي رقيبا ؟ ! فقال: و الله لا يغفر الله لك أو لا يدخلك الله الجنة فقبض روحهما فاجتمعا عند رب العالمين فقال لهذا المجتهد: أكنت بي عالما أو كنت على ما في يدي قادرا ؟ ! و قال للمذنب: اذهب فادخل الجنة برحمتي و قال للآخر: اذهبوا به إلى النار.

(صحيح) ( حم د ) عن أبي هريرة.

**٥٩٢٥- دوو پیاو هەبوو لە بەنی ئیسرائیل دەستەبرا بوون ، یەکێکیان گوناهبار بوو ئەوی تریان زۆر هەوڵی خوا پەرستنی دەدا ، کۆششکارەکە هەمیشە هاوڕێکەی لەگوناه دەبینی و پێی دەوت : با بەس بێت ، ڕۆژێك لە لەکاتی گوناهکردندا بینی و پێی وت: بەسە ئیتر ئەویش وتی : وازم لێ بهێنە لە نێوان خۆم و خوای خۆم ، ئایا تۆ کراویتە چاودێر بەسەرمەوە ، ئەویش وتی: سوێند بەخوا خوا لێت خۆش نابێت ، یان نا تخاتە**

[1]) مەناوی دەڵێت : واتە سەرگورشتە و ئامۆژگاریەکانیان بگێڕنەوە بە پەند.

**بەهەشتەوە ، ئيتر خوا گيانى هەردووكيانى وەرگرتەوە و لاى خوا يەكيانگرتەوە ، بە كۆششكارەكەى فەرموو ، ئايا تۆ شارەزاى من بووى ، يان دەسەلاتت هەبوو بەسەر ئەوەى لە دەستى منداية ؟! بە گوناهبارەكەى ووت : تۆ برۆ بەهەشتەوە بە بەزەيى خۆم ، بەوەكەى تريشى فەرموو : بيبەن بۆ دۆزەخ.**

(المشكاة ٢٣٤٧)

٥٩٢٦- كان ملك فيمن كان قبلكم و كان له ساحر فلما كبر قال للملك: إني قد كبرت فابعث إلي غلاما أعلمه السحر فبعث إليه غلاما يعلمه فكان في طريقه إذا سلك راهب فقعد إليه و سمع كلامه فأعجبه " فكان إذا أتى الساحر مر بالراهب و قعد إليه فإذا أتى الساحر ضربه فشكا ذلك إلى الراهب فقال: إذا جئت الساحر فقل: حبسني أهلي و إذا جئت أهلك فقل: حبسني الساحر " فبينما هو كذلك إذ أتى على دابة عظيمة قد حبست الناس فقال: اليوم أعلم الساحر أفضل أم الراهب ؟ فأخذ حجرا فقال: اللهم إن كان أمر الراهب أحب إليك من أمر الساحر فاقتل هذه الدابة حتى يمضي الناس فرماها فقتلها و مضى الناس " فأتى الراهب فأخبره فقال له الراهب: أي بني أنت اليوم أفضل مني قد بلغ من أمرك ما أرى و إنك ستبتلى فلا تدل علي " و كان الغلام يبرئ الأكمه و الأبرص و يداوي الناس من سائر الأدواء فسمع جليس للملك كان قد عمي فأتاه بهدايا كثيرة فقال: ما هاهنا أجمع لك إن أنت شفيتني قال: إني لا أشفي أحد إنما يشفي الله عز و جل فإن آمنت بالله دعوت الله فشفاك فآمن بالله فشفاه الله " فأتى الملك فجلس إليه كما كان يجلس فقال له الملك: من رد عليك بصرك ؟ قال: ربي قال: و لك رب غيري ؟ قال: ربي و ربك الله فأخذه فلم يزل يعذبه حتى دل على الغلام فجيء بالغلام فقال له الملك: أي بني قد بلغ من سحرك ما يبرئ الأكمه و الأبرص و تفعل و تفعل ! فقال: إني لا أشفي أحدا إنما يشفي الله عز و جل " فأخذه فلم يزل يعذبه حتى دل على الراهب فجيء بالراهب فقيل له: ارجع عن دينك فأبى فدعا بالمنشار فوضع المنشار على مفرق رأسه فشقه به حتى وقع شقاه ثم جيء بجليس الملك فقيل له: ارجع عن دينك فأبى فوضع المنشار في مفرق رأسه فشقه حتى وقع شقاه ثم جيء بالغلام فقيل له: ارجع عن دينك فأبى فدفعه إلى نفر من أصحابه فقال: اذهبوا به إلى جبل كذا و كذا فاصعدوا به الجبل فإذا بلغتم به ذروته فإن رجع عن دينه و إلا فاطرحوه " فذهبوا به فصعدوا به الجبل فقال: اللهم اكفنيهم بما شئت فرجف بهم الجبل فسقطوا و جاء يمشي إلى الملك فقال له الملك: ما فعل أصحابك ؟ فقال: كفانيهم الله فدفعه إلى نفر من أصحابه فقال:

اذهبوا به فاحملوه في قرقور فتوسطوا به البحر فإن رجع عن دينه و إلا فاقذفوه فذهبوا به فقال: اللهم اكفنيهم بما شئت فانكفأت بهم السفينة فغرقوا و جاء يمشي إلى الملك فقال له الملك: ما فعل أصحابك ؟ فقال: كفانيهم الله " فقال للملك: إنك لست بقاتلي حتى تفعل ما آمرك به ! قال: و ما هو ؟ قال: تجمع الناس في صعيد واحد و تصلبني على جذع ثم خذ سهما من كنانتي ثم ضع السهم في كبد القوس ثم قل: بسم الله رب الغلام ثم ارم فإنك إذا فعلت ذلك قتلتني " فجمع الناس في صعيد واحد و صلبه على جذع ثم أخذ سهما من كنانته ثم وضع السهم في كبد القوس ثم قال: بسم الله رب الغلام ثم رماه فوقع السهم في صدغه فوضع يده في صدغه موضع السهم فمات فقال الناس: آمنا برب الغلام " آمنا برب الغلام آمنا برب الغلام فأتى الملك فقيل له: أرأيت ما كنت تحذر ؟ قد و الله نزل بك حذرك قد آمن الناس ! فأمر بالأخدود بأفواه السكك فخدت و أضرم النيران و قال: من لم يرجع عن دينه فأقحموه فيها ففعلوا حتى جاءت امرأة و معها صبي لها فتقاعست أن تقع فيها فقال لها الغلام: يا أمه اصبري فإنك على الحق.

(صحيح) ( حم م ) عن صهيب.

**٥٩٢٦- پاشایەك لە پاشاكانی پێش ئێوە جادوگەرێكی هەبوو كاتێك جادوگەرەكە تەمەنی گەورە بوو بە پاشای ووت : بەڕاستی من گەورە بووم و چوومە تەمەنەوە جا غولامێك[1] بنێرە بۆلام با فێری جادوگەری بكەم ، ئەویش غولامێكی تازە لاوی نارده لای كە فێری جادووی بكات ، كە دەچووە لای جادووگەرەكە بەلای خواپەرستێكی گۆشەگیردا تێدەپەڕی و گوێی بۆ قسەكانی دەگرت و پێی سەرسام بوو ، جا هەركات بچوایە بەلای جادووگەرەكە بەلای خواپەرستەكەدا تێدەپەڕی و لای دادەنیشت ، مە دەگەیشتە لای جادووگەرەكە لێی دەدا ، غولامەكەش دەدەدڵی خۆی بۆ خواپەرستەكە كرد ، ئەویش پێی ووت : كە گەیشتیتە لای جادووگەرەكە بڵێ كەسوكارم گیریاندام ، كە چویتە داڵیشەوە بڵێ : جادووگەرەكە گیریدام ، بەم حاڵە گوزەراندی هەتا جارێكیان توشی بوو بە تووشی گیانەوەرێكی گەورە و كەبەری رێی بە خەڵكی گرتبوو ووتی : ئەمڕۆ بۆ دەدەردەكەوێت جادووگەرەكە باشترە یان خواپەرستەكە ؟بەردێكی هەڵگرت و ووتی : خوایە ئەگەر كاروو فرمانی خواپەرستەكە بەلاتەوە پەسەندترە لە كاروو فرمانی جادووگەرەكە ئەم گیانەوەرە بكوژە هەتا خەڵكیش رێگەیان بۆ بكرێتەوە ، ئیتر یەكسەر بەردەكەی تێ گرت**

[1]) غولام : واتە منداڵێكی تازە پێگەیشتووی تازە لاو..

و كوشتی و ، خەڵكی تێپەڕین ، خێرا چوو بۆ لای خواپەرستەكە و هەواڵەكەی دایە ، خواپەرستەكە پێی ووت : ئەریٚ كوڕی خۆم ئەمڕۆ تۆ لەمن چاكتری ئەوەتا بە چاوی خۆت دەبینی چیت كردووە ، بەڕاستی تۆ تاقی دەكرێیتەوە بەلاّم باسی من نەدركێنی و ئاشكرام نەكەی ، ئیتر منداڵەكە بەفەرمانی خوا چارەسەری كەڕو لاڵ و بەڵەك و تەواوی نەخۆشیەكانی دەكرد ، یەكێك لە هامنشینەكانی پاشا كە نابینا بوو بە دیاریەكی زۆرەوە هات بۆ لای و ووتی : هەرچیت دەویٚ لەسەر من ئەگەر چاكم بكەیتەوە ، غولامەكە ووتی : بەڕاستی من كەسم پیٚ چاك ناكرێتەوە بەڵكو تەنها خوا چاكیان دەكاتەوە ، جا ئەگەر بڕوا دێنی داوا لەخوا دەكەم چاكت بكاتەوە ، بڕوای بەخوا هێناو خواش چاكی كردەوە ، ڕۆیشتەوە بۆ لای پاشا و وەكو جاران لە لای دانیشت پاشا پێی ووت : كیٚ چاوی بۆ چاك كردیتەوە؟ ووتی پەروەردگارم ، ووتی : بۆ بێجگە لە من پەروەردگاری ترت هەیە ؟ ووتی : پەروەردگاری من و تۆ الله یە ، گرتی و بیٚ وچان ئەشكەنجەی دا هەتا غولامەكەی پیٚ ووتن ، یەكسەر غولامەكەیان هێنا پاشا پێی ووت : ئێی كوڕم بەڕاستی هەواڵی جادووگەری تۆم پیٚ گەیشتووە كە كەڕولاڵ و بەڵەك چاك دەكەیتەوە و چی دەكەیت و چی كەیت ! ووتی : بەڕاستی من كەسم پیٚ چاك ناكرێتەوە بەڵكو تەنها خوای شكۆدارو دەسەلاّتدار چاكیان دەكاتەوە ! گرتی و بیٚ وچان ئەشكەنجەی دا هەتا شوێنی خواپەرستەكەی پیٚ ووتن ، خواپەرستەكەیان هێنا و پێی وترا : لەدینەكەت پاشگەز بەرەوە گوێی پیٚ نەدان ، مشارێكیان هێناو لەسەر تەوقی سەری دایاننا و لەتەوقی سەریەوە كردیان بە دوو لەت و هەر لەتەی بەلایەكدا كەوت ، ئینجا هامشینەكەی پاشایان هێنا[1] ، پێی وترا : لەدینەكەت پاشگەز بەرەوە گوێی پێنەدان مشارەكەیان لەتەوقی سەری داناو كردیان بە دوو لەت هەتا هەر لەتەی بەلایەكدا كەوت ، ئینجا غولامەكە ( منداڵەكە )یان هێنا پێی وترا : لە دینەكەت پاشگەز بەرەوە ، گوێی پیٚ نەدان ئەویش ( پاشاكە )ش دایە دەستەیەك لە هاوڕێكانی ووتی بڕۆن بیبەن بۆ فلاّن چیاو فلاّن چیا سەری بخەن بۆسەر چیاكە جا كە گەیشتنە سەر لوتكەی چیاكە ئەگەر پاشگەز بوومەوە لە دینەكە ئەوا باشە ئەگەر نا فڕێی بدەنە خوارەوە ، بردیان و بە چیاكەدا سەریان خست غولامەكەش ووتی خوایە لەكۆڵمیان بكەیتەوە بەهەرشتێك

---

[1] ) كوێرەكەی چاوی چاك بوبوەوە.

ویستت لەسەرە ، چیاکە لەریەوەو ڕای وەشاندن و کەوتنە خوارەوە و ، غولامەکەش بە پێ هاتەوە بەلای پاشا ، پاشا پێی ووت : هاوڕێکانت چیان لێهات ؟ ووتی : خوا لەکۆڵی کردمەوە ، پاشا دایە دەست کۆمەڵێکی تر لە هاوڕێکانی و ووتی : بڕۆن بیبەن سوار پاپۆڕێکی بکەن و بیبەنە ناوەڕاستی دەریا جا ئەگەر پاشگەز بووەوە ئەوە باشە ئەگەر نا فڕێی بدەنە دەریاوە ، بردیان و ئەویش ووتی : خوایە لە کۆڵمیان بکەیتەوە بە هەرشێوەیەك ویستت لەسەرە ، ئیتر کەشتیەکە قڵپی کردنەوەو نوقم بون و بە ناودا ڕۆچوون غولامەکەش بە پێ هاتەوە بۆ لای پاشا ، پاشا پێی ووت : هاوڕێکانت چیان لێ هات ؟ ووتی : خوا لە کۆڵی کردمەوە.

ئینجا غولامەکە بە پاشای ووت : تۆ ناتوانی من بکوژی هەتا چیت پێ دەڵێم جێبەجێی نەکەیت ! : ووتی ئەوە چییە ؟ ووتی : خەڵکی لەیەك شوێن کۆبکەرەوە و منیش لەقەدی دارخورمایەك بپێچە ، ئینجا تیرێك لە تیردانەکەی خۆم دەربهێنە و بیخەرە سەر کەوانەکە و ڕووم تێبکەو ـ نیشانەم لێ بگرەو ـ ئینجا بڵێ : (( بسم الله رب الغلام )) بەناوی خوای پەروەردگاری غولامەکە ئینجا تیرەکەم تێبگرە جا ئەگەر ئاوا بکەی دەمکوژی ، خەڵکی لەیەك شوێندا کۆکردەوە ، غولامەکەشی بەقەدی دارخورمایەکەوە هەڵاوەشی ئینجا تیرێکی لە تیردانی غولامەکە دەرهێنا و خستیە سەر کەوانەکەو هێنا بەسەر پێ و ووتی (( بسم الله رب الغلام )) بەناوی خوای پەروەردگاری غولامەکە ئینجا تیرەکەی تێ گرت لەلاجانگی غولامەکەی داو دەستی برد بۆ لاجانگی شوێنی تیرەکەو یەکسەر مرد ، خەڵکی ووتیان : بڕوامان هێنال بە پەروەردگاری غولامەکە بڕشوامان هێنا بە پەروەردگاری غولامەکە ، بڕوامان هێنا بە پەروەردگاری غولامەکە ، (( دارو دەستەکەی )) هاتنە لای پاشا و پێ ووترا : دەبینی ئەوە ڕویدا کە خۆت لێ دەبوارد؟ بەڕاستی ئەوەی زۆر خۆت لێ دەپاراست توشت بوو ، خەڵکی بڕوایان هێنا ! فەرمانی کرد چاڵ هەڵکەنن لەسەر دەروازەی ڕێگاکان ـ هەڵکەندران و ئاگریان تێداکرایەوە و جۆش دران ئینجا ووتی : هەرکەس پەشیمان نەبوەوە لە دینەکەی فڕێیدەنە ناو ئەو چاڵانەوە، فەرمانیان جێ بەجێ کرد هەتا ئافرەتێك هات منداڵێکی خۆی پێ بوو هەڵوێستەیەکی کرد لە چوونە ناو چاڵەکە منداڵەکەی پێی ووت : دایە خۆڕاگەرۆ بە بەڕاستی تۆ لەسەر حەقی .

(الضعيفة ٨٨١)

٥٩٢٧- كانت امرأة من بني إسرائيل قصيرة تمشي مع امرأتين طويلتين فاتخذت رجلين من خشب و خاتما من ذهب مغلفا بطين ثم حشته مسكا و هو أطيب الطيب فمرت بين المرأتين فلم يعرفوها فقالت بيدها هكذا.

(صحيح) ( م ) عن أبي سعيد.

**٥٩٢٧- ئافرەتێکی کورتە بالاّ لە بەنی ئیسرائیل لە نێوان دوو ئافرەتی درێژدا بەڕێگادا دەڕۆیشت ، ئیتر دوو قاچی دارینی بۆ خۆی دروست کرد و ، ئەنگوستیلەیەکی ئالتون ڕووپۆشکرابوو بە قوڕی لە دەست کردوو پڕیشی کرد لە میسك خۆشترین گوڵاو ، جا بە نێوانیاندا تێپەڕی و نەیانناسی بە دەستی ئاوهای دەکرد.**

(الصحيحة ٤٨٦)

٥٩٢٨- لم يتكلم في المهد إلا ثلاثة: عيسى " و كان في بني إسرائيل رجل يقال له: جريج يصلي جاءته أمه فدعته فقال: أجيبها أو أصلي ؟ فقالت: اللهم لا تمته حتى تريه وجوه المومسات و كان جريج في صومعة فتعرضت له امرأة فكلمته فأبى فأتت راعيا فأمكنته من نفسها فولدت غلاما فقالت: من جريج فأتوه فكسروا صومعته فأنزلوه و سبوه فتوضأ و صلى ثم أتى الغلام فقال: من أبوك يا غلام ؟ قال: الراعي قالوا: نبني صومعتك من ذهب قال: لا إلا من طين " و كانت امرأة ترضع ابنا لها من بني إسرائيل فمر بها رجل راكب ذو شارة فقالت: اللهم اجعل ابني مثله فترك ثديها و أتى على الراكب فقال: اللهم لا تجعلني مثله ثم أقبل على ثديها يمصه ثم مرت بأمة فقالت: اللهم لا تجعل ابني مثل هذه فترك ثديها و قال اللهم اجعلني مثلها فقالت: لم ذاك ؟ فقال: الراكب جبار من الجبابرة هذه الأمة يقولون سرقت زنت و لم تفعل.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة.

**٥٩٢٨- هیچ کەس لە بێشکەدا قسەی نەکردووە تەنها سێ کەس نەبێت ، عیسا و ، پیاوێکیش هەبوو لە بەنی ئیسرائیل پێی دەوترا جورەیج ، دایکی هاتە لای و بانگی کرد، وتی وەڵامی بدەمەوە یان نوێژەکەم بکەم ، ئەویش وتی: خوایە مەیمرێنە تاکو ڕووخساری داوێن پیسانی پێ نیشان دەدەیت ، جا جورەیج لە دێرێکدا بو خوا پەرستی دەکرد ، لەوێ ئافرەتێك چووە لای و قسەی لەگەڵ کرد بەڵام ئەو ڕازی نەبوو قسەی لەگەڵ بکات ، دوای ئەوە چووە لای شوانێك و خۆی تەسلیم کرد و منداڵێکی لێی بوو ، دوایی ووتی : ئەم منداڵە لە جورەیجە ، ئیتر خەڵکەکە بۆی هاتن و دێرەکەیان شکاند و،**

**دایانگرت و پڕ جنێویان کرد ، ئەویش دەسنوێژی گرت و نوێژی کرد و هاتە لای منالەکە و پێی وت : کێ باوکتە ئەی منال؟ وتی شوانەکە ، وتیان : دێرەکەت لە ئالتون بۆ دروست دەکەینەوە ، وتی : نەخێر تەنها بەقوڕ ، ئافرەتێکیش منالێکی خۆی شیر دەدا لە بەنی ئیسرائیل ، شۆڕە سوارێکی بە تەنیشدا تێپەڕی ، ووتی خوایە کوڕەکەم وەکو ئەو پیاوە لێ بکەیت منالەکەیش دەمی لە مەمکی دایکی بەردا و ، چووە لای سوارەکەوە وتی : خوایە وەکو ئەو پیاوەم لێ نەکەیت، ئینجا گەڕایەوە دەستی کرد بە مژینی مەمکی دایکی، دوای ئەوە بە لای کەنیزەکێکدا تێپەڕی و ، ووتی: خوایە کوڕەکەم وەکو ئەو کۆیلەیە لێ نەکەیت ، ئەویش مەمکی بەردا و وتی: خوایە وەکو ئەو ئافرەتەم لێ بکەیت، ئافرەتەکە وتی: لەبەرچی ؟ وتی: سوارەکە ستەمکارێك بوو لە ستەمکاران ، ئەم کەنیزەکەش دەڵێن دزی کردوە و داوێنپیسی کردوە ، نەشی کردووە.**

(الضعيفة ٨٨٠)

٥٩٢٩- لما أغرق الله فرعون قال: ( آمنت أنه لا إله إلا الذي آمنت به بنوا إسرائيل قال جبريل: يا محمد ! فلو رأيتني و أنا آخذ من حال البحر فأدسه في فيه مخافة أن تدركه الرحمة ) .

(صحيح) ( حم ت ) عن ابن عباس.

**٥٩٢٩- کاتێك خوای گەورە فیرعەونی لە ئاودا نغرۆکرد فەرمووی ( أمنت انه لاإله الا الذي امنت به بنو اسرائيل ) ( يونس: ٩٠ ) جیبریل فەرمووی: ئەی موحەممەد! ئەگەر منت دەبینی چۆن قوڕە ڕەشەکەی دەریام دەکردە دەمی فیرعەونەوە بۆ ئەوەی وەبەر میهرەبانی خوا نەکەوێت.**

(الصحيحة٢٠١٥)

٥٩٣٠- لولا بنو إسرائيل لم يخبث الطعام و لم يخنز اللحم و لولا حواء لم تخن أنثى زوجها.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة.

**٥٩٣٠- ئەگەر بەنی ئیسرائیل نەبوایەن خواردن خراپ نەدەبوو ، گۆشتیش نەدەگەنی ، ئەگەر ( حواو )یش نەبوایە ، هیچ ئافرەتێك خراپەی لەگەڵ مێردەکەی ئەنجام نەدەدا [1].**

(المشكاة ٣٢٤١)

٥٩٣١- لا تصدقوا أهل الكتاب و لا تكذبوهم و ( قولوا آمنا بالله و ما أنزل إلينا) (البقرة :١٣٦)الآية.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة.

---

**١) مەناوی دەڵێت : حاشا مەبەستی داوێن پیسی بێت.**

**٥٩٣١- باوەڕ بە (ئەهلی کیتاب) خاوەن پەڕاوەکان مەکەن و بە درۆشیان مەخەنەوە و (قولوا أمنا بالله و ما انزل الینا) (البقره:١٣٦).**

(الصحيحة ٤٢٢)

٥٩٣٢- لا يقص إلا أمير أو مأمور أو مختال.

(صحيح) ( د ) عن عوف بن مالك.

**٥٩٣٢- چیرۆك گێڕەرەوە یان فەرمانڕەوایە ، یان فەرمان پێکراوە ، یان لە کەشخە چییە.**

(المشكاة ٢٤٠)

٥٩٣٣- لا يقص على الناس إلا أمير أو مأمور أو مراء.

(صحيح) ( حم ه ) عن ابن عمرو.

**٥٩٣٣- چیرۆك خوان چیرۆك ناگێڕێتەوە یان فەرمانڕەوایە ، یان فەرمان پێکراوە، یان ڕوپامایی (ڕیابازە)[1].**

(المشكاة ٢٤١)

## بابەتی پیشخواردنەوە

٥٩٣٤- اجتنب الغضب.

(صحيح) ( ابن أبي الدنيا في ذم الغضب ابن عساكر ) عن رجل من الصحابة .

**٥٩٣٤- خۆت بپارێزە لە تووڕەیی[2].**

(الصحيحة٨٨٤)

٥٩٣٥- إذا غضب أحدكم فليسكت.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عباس .

**٥٩٣٥- ئەگەر کەسێکتان تووڕە بوو با بێدەنگ بێت.**

(الصحيحة٣٧٥)

٥٩٣٦- إذا غضب أحدكم و هو قائم فليجلس فإن ذهب عنه الغضب و إلا فليضطجع.

(صحيح) ( حم د حب ) عن أبي ذر .

---

**٢) مەناوی دەڵێت : جگە لەو دوو کەسە ڕییا بازە ، چونکە حەزی لە سەرۆکایەتییە ، چونکە فەرمانڕەوا هەرکەسێکی بە باش زانی دایدەنێ بۆ چیرۆك خوانی.**

**٣) لە هۆکارەکانی و بە فەرمانی پێ مەکە.**

**٥٩٣٦- ئەگەر کەسێکتان بە پێوە تووڕە بوو ، با دابنیشێت ،ئەگەر تووڕەییەکەی لانەچوو ، با ڕاکشێت.**

(المشكاة ٥١١٤)

٥٩٣٧- إذا غضب الرجل فقال: أعوذ بالله سكن غضبه.

(صحيح) ( عد ) عن أبي هريرة .

**٥٩٣٧- ئەگەر پیاوێك تووڕە بو ووتی: پەنا دەگرم بە خوا ، تووڕەییەکەی نامێنێ .**

(الصحيحة ١٣٧٦)

٥٩٣٨- إذا غضبت فاجلس.

(صحيح) ( الخرائطي في مساوئ الأخلاق ) عن عمران بن حصين .

**٥٩٣٨- ئەگەر تووڕە بووی دانیشە.**

(المشكاة ١٥١٤)

٥٩٣٩- لا تغضب.

(صحيح) ( حم خ ت ) عن أبي هريرة ( حم ك ) عن جارية بن قدامة.

**٥٩٣٩- تووڕە مەبە.**

(المشكاة ٥١٠٤)

٥٩٤٠- لا تغضب و لك الجنة.

(صحيح) ( ابن أبي الدنيا طب ) عن أبي الدرداء.

**٥٩٤٠- تووڕە مەبە و بەهەشت بۆ تۆیە.**

(الترغيب ٢٧٤٩)

٥٩٤١- من كظم غيظا و هو قادر على أن ينفذه دعاه الله على رءوس الخلائق حتى يخيره من الحور العين يزوجه منها ما شاء.

(صحيح) ( ٤ ) عن معاذ بن أنس.

**٥٩٤١- هەرکەسێك تووڕە بوو پیشی خواردەوە و دەشیتوانی جێبەجێی بکات ، خوای گەورە بە بەرچاوی هەموو خەڵکەوە بانگی دەکات و ئازادی دەکات لە هەڵبژاردنی حۆرییەکانی بەهەشت کە چەندی بوێت بیداتێ.**

(المشكاة ٥٠٨٨)

٥٩٤٢- الصرعة كل الصرعة الذي يغضب فيشتد غضبه و يحمر وجهه و يقشعر شعره فيصرع غضبه .

(صحيح) ( حم ) عن رجل.

٥٩٤٢- ئالَقواني سترېترز و سترکتوتوو ئتو کتسقیة تـوورِة بیَـت و رِووخساری سوور بیَتتوة و تووکی طرذبیَت و دووایی بتوانیَت ئتو توورِةیية كث كاتتوة.

٥٩٤٣- ليس الشديد بالصرعة إنما الشديد الذي يملك نفسه عند الغضب.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة.

**٥٩٤٣- ئازا ئەو کەسە نییە بەرامبەرەکەی ببەزێنێ ، بەڵکو ئازا ئەو کەسەیە لەکاتی تووڕە بووندا خۆی بگرێت.**

(الصحيحة ٣٢٩٥)

٥٩٤٤- من كتم غيظا و هو قادر على أن ينفذه دعاه الله على رءوس الخلائق حتى يخيره من الحور العين يزوجه منها ما شاء.

(صحيح) ( ٤ ) عن معاذ بن أنس.

**٥٩٤٤=هەرکەس ڕق و قینێك بخواتەوە لە کاتێکدا بتوانێ جێبەجێی بکات خوا لەبەرچاوی هەموو خەڵکی بانگی دەکات هەتا سەرپشکی دەکات چەند هاوسەری بوێت لە حورول عەین بیداتێ .**

(الترغيب ٢٧٥٣)

## بابەتی نەرم و نیانی

٥٩٤٥- ادعوا الناس و بشروا و لا تنفروا و يسروا و لا تعسروا.

(صحيح) ( م ) عن أبي موسى .

**٥٩٤٥- بانگی خەڵکی بکەن و مژدەدەر بن و ( پەرتەوازە کەر ) مەبن ، ئاسانکار بن و گرانکار مەبن.**

(الصحيحة ٤٢١)

٥٩٤٦- يسروا و لا تعسروا و بشروا و لا تنفروا.

(صحيح) ( ق حم ن ) عن أنس.

**٥٩٤٦- ئاسانكەر بن و گرانكار مەبن ، مژدە بدەن و خەڵكی مەتارێنن.**

(الصحيحة ١١٥١)

٥٩٤٧- يسروا و لا تعسروا و بشروا و لا تنفروا و تطاوعا و لا تختلفا.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي موسى.

**٥٩٤٧- كارو بار سانا بكەن و گیرو گرفت دروست مەكەن ، مژدەدەر بن و بێزاركەر مەبن ، تەبا بن و ناكۆك مەبن.**

(الصحيحة ١١٥١)

٥٩٤٨- إذا أراد الله بأهل بيت خيرا أدخل عليهم الرفق.

(صحيح) ( حم تخ هب ) عن عائشة (البزار ) عن جابر .

**٥٩٤٨- ئەگەر خوای چاكەی خانەوادەیەكی بوێت نەرم و نیانیان دەكات.**

(الصحيحة ١٢١٩)

٥٩٤٩- إن الله إذا أحب أهل بيت أدخل عليهم الرفق.

(صحيح) ( ابن أبي الدنيا في ذم الغضب الضياء ) عن جابر .

**٥٩٤٩- ئەگەر خوای خەڵكی ماڵێكی خۆش بوێت ، نەرم نیانیان دەخاتە ناو.**

(الصحيحة ١٢٣٩)

٥٩٥٠- إن الله رفيق يحب الرفق و يرضاه و يعين عليه ما لا يعين على العنف فإذا ركبتم هذه الدواب العجم فنزلوها منازلها فإن أجدبت الأرض فانجوا عليها فإن الأرض تطوى بالليل ما لا تطوى بالنهار و إياكم و التعريس بالطريق فإنه طريق الدواب و مأوى الحيات.

(صحيح) ( طب ) عن معدان .

**٥٩٥٠- خوای گەورە نەرم نیانە و لە نەرم نیانی پێ خۆشەو پێی ڕازیە ، ئەو پاداشتەیش لەسەر هێمنی دەیداتەوە ، لەسەر توند و تیژی نایداتەوە ، جا هەر كاتێك سواری ئەو وڵاخە بێ زمانانە بوون ، لە ڕێگە پشوویان پێ بدەن ، ئەگەر زەویەكە ووشكانی بوو خۆتانی لێ ڕزگار بكەن ، چونكە ئەو ڕێگەیەی دەتوانیت بەشەو بیبڕیت ناتوانیت بە ڕۆژ بیبڕیت ، نەكەن لەسەر ڕێگا لابدەن بۆ پشودان ، چونكە ئەوە ڕێگای وڵاخ و پەناگەی مارە.**

(الصحيحة ٦٨٢)

٥٩٥١- إن الله تعالى رفيق يحب الرفق و يعطي عليه ما لا يعطي على العنف.

(صحيح) ( خد د ) عن عبدالله بن المغفل ( ه حب ) عن أبي هريرة ( حم هب ) عن علي (صحيح) ( طب ) عن أبي أمامة (صحيح) ( البزار ) عن أنس .

**٥٩٥١- بەڕاستى خواى گەورە نەرم نيانە و حەزى لە نەرم نيانى يە ، پاداشتێكيشى لەسەر دەداتەوە هەرگيز پاداشتى ئاوا لەسەر توندو تيژى ئەو پاداشتە ناداتەوە .**

(الروض النضير ٣٦)

٥٩٥٢- إن الله تعالى يحب الرفق في الأمر كله.

(صحيح) ( خ ) عن عائشة .

**٥٩٥٢- بەڕاستى خواى گەورە نەرم نيانى لە هەموو شتێكدا پىٚ خۆشە.**

(الترغيب ٢٦٦٤)

٥٩٥٣- ألا أخبركم بمن تحرم عليه النار غدا ؟ على كل هين لين قريب سهل.

(صحيح) ( ع ) عن جابر ( ت طب ) عن ابن مسعود .

**٥٩٥٣- ئايا ئاگادارتان بكەم لەو كەسەى كە دۆزەخى لىٚ قەدەغە دەكرێت ؟ هەموو كەسێكى هێمنى لەسەرخۆى نەرم و نيانى نزيكە خەڵكى سادە.**

(الصحيحة ٩٣٥)

٥٩٥٤- التؤدة في كل شيء خير إلا في عمل الآخرة.

(صحيح) ( د ك هب ) عن سعد .

**٥٩٥٤- لە سەرخۆيى لە هەموو شتێكدا چاكە ، تەنها لە كردوەى قيامەت دا نەبێت.**

(الصحيحة ١٧٨٤)

٥٩٥٥- التأني من الله و العجلة من الشيطان.

(صحيح) ( هب ) عن أنس .

**٥٩٥٥- هێمنى لە خواوەيە و ، پەلەكردنيش لە شەيتانەوەيە.**

(الصحيحة ١٧٩٥)

٥٩٥٦- حرم على النار كل هين لين سهل قريب من الناس.

(صحيح) ( حم ) عن ابن مسعود .

**٥٩٥٦- قەدەغەكراوە لە ئاگر هەموو كەسێكى هێمن و لەسەرخۆو سادە و نزيك لە خەڵكى.**

(الصحيحة ٩٣٥)

٥٩٥٧- عليك بالرفق و إياك و العنف و الفحش .

(صحيح) ( خد ) عن عائشة.

**٥٩٥٧- هێمن بە و ، توند و تیژ مەبە ، قسەی ناشرین مەکە.**

(المشكاة ٤٧٣٨)

٥٩٥٨- عليك بالرفق إن الرفق لا يكون في شيء إلا زانه و لا ينزع من شيء إلا شانه .

(صحيح) ( م ) عن عائشة.

**٥٩٥٨- لەسەرخۆبە ، چونکە بەڕاستی لەسەرخۆیی لەهەر شتێکدا بێت دەیڕازێنێتـەوە، لە شتێکیش دابڕێت ناشرینی دەکات.**

(المشكاة ٥٠٦٨)

٥٩٥٩- يا عائشة ! عليك بتقوى الله و الرفق فإن الرفق لم يكن في شيء قط إلا زانه و لا نزع من شيء قط إلا شانه

(صحيح) ( حم د ) عن عائشة

**٥٩٥٩- ئەی عائیشە ! پارێزکاریت هەبێت و هێمن بە ، چونکە هێمنی لە هەرچی شتێکدا بێت جوانی دەکات ، لە هەرچی شتێکیش دابنرێت ناشرینی دەکات.**

(الصحيحة ٥٢٤)

٥٩٦٠- إنما الناس كإبل مائة لا تكاد تجد فيها راحلة.

(صحيح) ( حم ق ت ه ) عن ابن عمر .

**٥٩٦٠- بێگومان خەڵكی وەكو ڕەوە وشتری سەد دانەیی وان ، بە ئەستەم ووشـترێکی باشـی تیا دەست دەکەوێت بۆ سواری[1].**

(الروض النضير ٥٠٢)

٥٩٦١- ما أعطي أهل بيت الرفق إلا نفعهم.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عمر.

**٥٩٦١- هەر ماڵێك نەرم و نیانیان تیادا بێت هەر سوودیان پێ دەگەیەنێت.**

(الصحيحة٩٣٩)

٥٩٦٢- ما كان الرفق في شيء إلا زانه و لا نزع من شيء إلا شانه.

(صحيح) ( عبد بن حميد الضياء ) عن أنس.

---

[1] **وشترێك هێمن و چاك بێت بۆ سواری ، خەڵكیش بە هەمان شێوە كەم كەسیان تیایە بگونجێت بۆ هاوڕێیەتی كە نەرم و نیان بێت.**

**٥٩٦٢- نـەرم و نيـانى لـە هـەر شـتێك بێـت دەيڕازێنێتـەوە و ، لـە هەرچـى شـتێكيش دابڕێنرێت ناشرينى دەكات.**

(المشكاة ٤٨٥٤)

٥٩٦٣- من أعطي حظه من الرفق فقد أعطي حظه من الخير و من حـرم حظـه مـن الرفـق فقـد حرم حظه من الخير.

(صحيح) ( حم ت ) عن أبي الدرداء.

**٥٩٦٣- هەركەسێك پشكێكى پێ ببەخشرێت لە نەرم نيانى ئەوە پشكى خۆى لـە چـاكە پێـى بەخشراوە ، هەركەسيش بێ بەش بێت لە نەرم و نيانى ئەوە لە چاكە بێ بەش بووە چاكە.**

(الصحيحة ٥١٩)

٥٩٦٤- من كان سهلا هينا لينا حرمه الله على النار.

(صحيح) ( ك هق ) عن أبي هريرة.

**٥٩٦٤- هەركەسێك سادە و سانا و لەسەرخۆبێت خواى گەورە قەدەغەى دەكات لە ئاگر.**

(الصحيحة ٩٣٨)

٥٩٦٥- من يحرم الرفق يحرم الخير كله.

(صحيح) ( حم م د ه ) عن جرير.

**٥٩٦٥- هەركەسێك لە نەرم و نيانى بێ بەش بێت لە هەموو چاكەيەك بێ بەش بووە .**

(المشكاة ٥٠٦٩)

٥٩٦٦- يا عائشة ! إن الله رفيق يحب الرفق في الأمر كله.

(صحيح) ( حم ق ت ه ) عن عائشة.

**٥٩٦٦- ئەى عائيشە : خواى گەورە نەرم و نيانە و، نەرم و نيانى پێ خۆشە.**

(المشكاة ٤٦٣٨)

٥٩٦٧- يا عائشة ! إن الله رفيق يحب الرفق و يعطي على الرفق ما لا يعطي على العنف و مـا لا يعطي على ما سواه.

(صحيح) ( م ) عن عائشة.

**٥٩٦٧- ئەی عائیشە : خوای گەورە نەرم و نیانی پێ خۆشە ، پاداشتیشی دەداتەوە کە هەرگیز پاداشتی ئاوا لەسەر توندی تیژی ناداتەوە و ، پاداشتی هیچ شتێکی تریش بەو شێوە ناداتەوە.**

(الترغيب ٢٦٦٤)

## بابەتی زیادەڕەوی کردن

٥٩٦٨- إياكم و الغلو في الدين فإنما هلك من كان قبلكم بالغلو في الدين.

(صحيح) ( حم ن ه ك ) عن ابن عباس .

**٥٩٦٨- نەکەن لە ئاییندا زیادەڕەوی بکەن ، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە بە هۆی زیادەڕەوی کردن لە ئاییندا تیاچوون.**

(الصحيحة ١٢٨٣)

٥٩٦٩- إنكم لن تدركوا هذا الأمر بالمغالبة.

(صحيح) ( ابن سعد حم هب ) عن ابن الأدرع .

**٥٩٦٩- بەڕاستی ئێوە ئەوپەڕی تێناگەن بە توند و تیژی زیادەڕەوی .**

(الصحيحة ١٧٠٩)

٥٩٧٠- إن الله تعالى رضي لهذه الأمة اليسر و كره لها العسر.

(صحيح) ( طب ) عن محجن بن الأدرع .

**٥٩٧٠- بەڕاستی خوای گەورە بە ئاسانکاری بۆ ئەم ئوممەتە ڕەزامەندی نواندووە ، گرانکاریشی بۆ ئەم ئوومەتە پێ ناخۆشە.**

(الصحيحة ١٦٣٥)

٥٩٧١- إن هذا الدين متين فأوغلوا فيه برفق.

(صحيح) ( حم ) عن أنس .

**٥٩٧١- بەڕاستی ئەم ئەو ئایینە بەهێز و قایمە بە نەرم و نیانی دەستی تێوەردەن .**

(الضعيفة ٢٤٨٠)

٥٩٧٢- إنما بعثتم ميسرين و لم تبعثوا معسرين.

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة .

**٥٩٧٢- ئێوه به ئاسانكاری ڕەوانه كراون ، و گرانكاری ڕاوانه نەكراون .**

(صحيح ابي داود ٤٠٤)

٥٩٧٣- أيها الناس عليكم بالقصد عليكم بالقصد فإن الله تعالى لا يمل حتى تملوا.

(صحيح) ( ٥ ع حب ) عن جابر .

**٥٩٧٣- خەڵكینه لەسەرخۆبن ، لەسەرخۆبن ، چونكه خوای گەوره بێزار نابێت مەگەر هەر خۆتان بێزار نەبن .**

(صحيح ابي داود ١٣٣٨)

٥٩٧٤- خير دينكم أيسره.

(صحيح) ( حم خد طب ) عن محجن بن الأدرع ( طب ) عن عمران بن حصين ( طس عد الضياء ) عن أنس .

**٥٩٧٤- چاكترینی دینداریكردنتان ئاسانترینیێتی .**

(الصحيحة ١٦٣٥)

٥٩٧٥- الدين يسر و لن يغالب الدين أحد إلا غلبه.

(صحيح) ( هب ) عن أبي هريرة .

**٥٩٧٥- ئایین ئاسانه ، هەركەسیش هەرگیز زۆرانی لەگەڵ دیندار نەگرتووه دین نەیبەزاندبێت.**

(الصحيحة ١١٦١)

٥٩٧٦- سددوا و قاربوا.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عمرو.

**٥٩٧٦- قسەو كردارتان ڕاست و درووست بێت لەخوا نزیك ببنەوه بەبەردەوامی لەخوا پەرستیدا.**

(الصحيحة ١١٥)

٥٩٧٧- يا أيها الناس ! إنكم لن تطيقوا كل ما أمرتكم به و لكن سددوا و قاربوا و أبشروا.

(صحيح) ( حم د ) عن الحكم بن حزن.

**٥٩٧٧- خەڵكینه ! ئێوه تواناى هەموو ئەوەتان نییه كه فەرمانم پێكردوون ، بەڵام مەبەست بپێكن و نزیك ببنەوه لەخوا و مژدەدەر بن[1] .**

(صحيح ابي داود ١٠٠٦)

---

١) مزگێنی بەخش بن.

٥٩٧٨- عليكم هديا قاصدا فإنه من يشاد هذا الدين يغلبه .

(صحيح) ( حم ك هق ) عن بريدة.

**٥٩٧٨- لەسەرتانە ڕێبازو و ڕێگەی ئاسان بگرنەبەر ، چونکە هەرکەسێك لەگەڵ ئەم ئایینەدا زۆرانبازی بکات دەبەزێت.**

(السنة ٩٥)

٥٩٧٩- هلك المتنطعون.

(صحيح) ( حم م د ) عن ابن مسعود .

**٥٩٧٩- توندڕەوەکان تیاچوون.**

(غاية المرام ٧)

٥٩٨٠- لا تشددوا على أنفسكم فيشدد عليكم فإن قوما شددوا على أنفسهم فشدد الله عليهم فتلك بقاياهم في الصوامع و الديارات .

(صحيح) ( د ) عن أنس.

**٥٩٨٠- لەسەرخۆتانی گران مەکەن با لەسەرتان گران نەکرێت ، چونکە کەسانێك لەسەر خۆیان کرد خواش لەسەری گرانکردن ، ئەوەش پاشماوەکانیانە لە دێر و خەڵوتگاکانیاندا .**

(الصحيحة ٣١٢٤)

## بابەتی پشت بەستن بەخوا

٥٩٨١- قيدها و توكل.

(صحيح) ( خط في رواة مالك ابن عساكر ) عن ابن عمر.

**٥٩٨١- بیبەسەرەوە و ، پشت بەخوا ببەستە[1].**

(مشكلة الفقر ٢٢)

٥٩٨٢- قيد و توكل.

(صحيح) ( هب ) عن عمرو بن أمية الضمري.

---

**١) چونکە بەستنەوەی وشترەکە ناکۆك نییە لەگەڵ پشت بەخوا بەستن.**

**٥٩٨٢- بیبەسەرەوە و ، پشت بەخوا ببەستە.**

(مشكلة الفقر ٢٢)

٥٩٨٣- يدخل الجنة من أمتي سبعون ألفا بغير حساب هم الذين لا يسترقون و لا يتطيرون و لا يكتوون و على ربهم يتوكلون.

(صحيح) ( خ ) عن ابن عباس ( حم م ) عن عمران بن حصين ( م ) عن أبي هريرة.

**٥٩٨٣- حەفتا هەزار كەس لە ئومەتم بە بێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتەوە ، ئەوانەن كە نوشتە ناكەن و، ڕەشبین نین و ، خۆیان پشو نانێن[1]، پشت بە خوای خۆیان دەبەستن.**

(المشكاة ٥٢٩٦)

٥٩٨٤- لو أنكم توكلون على الله تعالى حق توكله لرزقكم كما يرزق الطير تغدو خماصا و تروح بطانا.

(صحيح) ( حم ت ه ك ) عن عمر.

**٥٩٨٤- ئەگەر ئێوە بەڕاستی پشت بەخواتان ببەستن ، خوای گەورە وەكو باڵندە ڕۆزیتان دەدات ، بەیانیان بە برسێتی دەردەچن و ، ئێواران بە تێری دەگەڕێتەوە .**

(الصحيحة ٣١٠)

## بابەتی شوومی

٥٩٨٥- كان يعجبه الفأل الحسن و يكره الطيرة.

(صحيح) ( ه ) عن أبي هريرة ( ك ) عن عائشة.

**٥٩٨٥- پێغەمبەر (ﷺ) گەشبینی و قسەی باشی پێ خۆش بوو ، ڕقیشی لە شومی بە دبینی بوو.**

(الكلم ٢٤٨)

٥٩٨٦- كان أهل الجاهلية يقولون: إنما الطيرة في المرأة و الدابة و الدار.

(صحيح) ( ك هق ) عن عائشة.

**٥٩٨٦- خەڵكی سەردەمی نەفامی دەیانووت : شوومی لە ئافرەت و ، ووڵاخ و ، خانوودایە.**

(الصحيحة ٩٩٣)

---

**١) واتە : ئەندامی لاشەی خۆیان داخ ناكەن و بە ئاگر نەخش و خاڵی لەسەر ناكوتن.**

٥٩٨٧- سبعون ألفا من أمتي يدخلون الجنة بغير حساب: هم الذين لا يكتوون و لا يكوون و لا يسترقون و لا يتطيرون و على ربهم يتوكلون .

(صحيح) ( البزار ) عن أنس.

**٥٩٨٧- حەفتا هەزار كەس لە ئوممەتم بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت ، ئەوانیش ئەوانەن كە خۆیان پشونانێن و ..... نوشتە ناكەن و ، بە شووم كاری و بەدبینی ناكەن و پشت بەخوای خۆیان دەبەستن.**

(الضعيفة ٣٦٩٠)

٥٩٨٨- الطيرة شرك .

(صحيح) ( حم خد ٤ ك ) عن ابن مسعود.

**٥٩٨٨- بە شووم تێڕوانین هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانە .**

(الصحيحة٤٢٩)

٥٩٨٩- من ردته الطيرة عن حاجته فقد أشرك.

(صحيح) ( حم طب ) عن ابن عمرو.

**٥٩٨٩- هەركەسێك لە ترسی شوومی و بەدبینی لە شتێك بگەڕێتەوە ، ئەوە هاوەڵی بۆ خوا داناوە.**

(الصحيحة ١٠٦٥)

٥٩٩٠- لا شيء في البهائم و العين حق و أصدق الطيرة الفأل.

(صحيح) (حم ت) عن حابس.

**٥٩٩٠-وڵاخ شومی و بەدبینی نییە چاوەزار ( چاوپیسی ) ڕاستە ڕاسترین شومی گەشبینیە.**

(الضعيفة ٤٨٠٤)

٥٩٩١- أخذنا فألك من فيك.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة ( ابن السني أبو نعيم معا في الطب ) عن كثير بن عبدالله عن أبيه عن جده (صحيح) ( فر ) عن ابن عمر .

**٥٩٩١- گەشبینیەكە تمان لە دەمتەوەوەرگرت .**

(الصحيحة ٧٢٥)

٥٩٩٢- إن كان الشؤم في شيء ففي الدار و المرأة و الفرس.

(صحيح) ( مالك حم خ ه ) عن سهل بن سعد ( ق ) عن ابن عمر (م ن ) عن جابر .

**٥٩٩٢- ئەگەر شوومی لە شتێكدا بووایە لە خانوو ئافرەت و ئەسپ دا دەبوو.**

(الصحيحة ٤٤٣)

٥٩٩٣- إنما الشؤم في ثلاثة: في الفرس و المرأة و الدار. [١]

(صحيح) ( خ د ه ) عن ابن عمر .

**٥٩٩٣- شوومی ئەگەر ببوایە تەنها لە سێ شتدا دەبوو : ئەسپ و ، ئافرەت و ، خانوو.**

(الصحيحة ٧٨٨)

٥٩٩٤- الشؤم في ثلاثة: في المرأة و المسكن و الدابة.

(صحيح) ( ت ن ) عن ابن عمر.

**٥٩٩٤- شوومی لە سێ شتدایە : ئافرەت و ، خانوو ، وولآخ.**

(الصحيحة ٤٤٣)

٥٩٩٥- أيمن امرئ و أشأمه ما بين لحييه.

(صحيح) ( طب ) عن عدي بن حاتم .

**٥٩٩٥- بەختەوەرترین و شوومترین شتی كەسێك زمانێتی .**

(الصحيحة ١٢٨٦)

٥٩٩٦- كان لا يتطير و لكن يتفاءل.

(صحيح) ( الحكيم البغوي ) عن بريدة.

**٥٩٩٦- پێغەمبەر ( ﷺ ) ڕەشبین نەبوو ، لە هیچ شتێك بەڵكو گەش بین بوو.**

(الصحيحة ٧٦١)

٥٩٩٧- كان يتفاءل و لا يتطير و كان يحب الاسم الحسن.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عباس.

**٥٩٩٧- پێغەمبەر ( ﷺ ) ، گەشبین بوو بە ڕەشیش تەماشای هیچی نەدەكرد ، حەزیشی لە ناوی خۆش بوو.**

(الصحيحة ٧٧٨)

٥٩٩٨- لا شؤم و قد يكون اليمن في: الدار و المرأة و الفرس.

(صحيح) ( ت ه ) عن حكيم بن معاوية.

---

١) وەكو لە ئەسڵی فەرموودەكەدا هاتووە (( إن كان الشؤم... )) ج٢ ، ص٩٦٧ ، السراج المنير ..

**٥٩٩٨- شوومی نییه ، لەوانەشه پیرۆزی و بەختەوەری له : خانوو و ، ئافرەت و ، ئەسپ دا بێت.**

(الصحيحة ١٩٣٠)

٥٩٩٩- لا طيرة و خيرها الفأل: الكلمة الصالحة يسمعها أحدكم.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي هريرة.

**٥٩٩٩- شوومی نییه ، لەوەش چاکتر : قسەیەکی چاکه که کەسێکتان بیبیستێ.**

(المشكاة ٤٥٧٦)

٦٠٠٠-إذا ظننتم فلا تحققوا و إذا حسدتم فلاتبغوا و إذا تطيرتم فامضوا و على الله فتوكلوا و إذا وزنتم فأرجحوا.

(صحيح) ( ه ) عن جابر .

**٦٠٠٠- ئەگەر گومانتان برد گومانەکەتان مەکەنە ڕاست و دروست له دەروونتاندا ، ئەگەر ئێرەیشتان برد به کەسێك ستەم مەکەن [1] ، ئەگەر شتێکیشتان بە شووم زانی بڕۆن و گوێی پێ مەدەن ، پشتیش بەخوا ببەستن ، ئەگەر کێشانەشتان کرد قورس بکێشن.**

(الصحيحة ٣٩٤٢)

## بابەتی قەدەغە کردنی جنێودان به موسڵمان

٦٠٠١- إذا سبك رجل بما يعلم منك فلا تسبه بما تعلم منه فيكون أجر ذلك لك و وباله عليه.

( صحيح ) ( ابن منيع ) عن ابن عمر .

**٦٠٠١- ئەگەر پیاوێك جنێوی پێدای به شتێك که دەیزانی له تۆ دایه ، تۆ جنێوی پێ مەده به شتێك که دەزانی له ئەو دایه ، با پاداشتەکه بۆ تۆ بێت و گوناهەکه بۆ ئەو بێت.**

(الصحيحة ١١٠٩)

٦٠٠٢- أربى الربا شتم الأعراض ( و أشد الشتم الهجاء و الراوية أحد الشاتمين ).

( صحيح ) ( عب هب ) عن عمرو بن عثمان مرسلا .

**٦٠٠٢- خراپترین سوو ، جنێودانه به ناموس...**

(الصحيحة ١٤٣٣)

١) ئەگەر شەیتان هانیدان ( حەسوودی ) ئێرەیی ببەنه کەسێك گوێڕایەڵی مەکەن.

٦٠٠٣- ساب المؤمن كالمشرف على الهلكة.

( صحيح ) ( البزار ) عن ابن عمرو.

**٦٠٠٣- ئەو كەسەی جنێو دەدات بە ئیمانداریك وەكو كەسێكە خەریك بێت بكەوێتە هەڵدێرەوە[1] .**

(الصحيحة ١٨٧٨)

٦٠٠٤ - قتال المسلم أخاه كفر و سبابه فسوق.

( صحيح ) ( ت ) عن ابن مسعود ( ن ) عن سعد.

**٦٠٠٤- جەنگ كردنی موسوڵمان لەگەڵ براكەی بێ باوەڕییە ، جنێو پێدانیشی خراپەكارییە.**

(صحيح الترمذی ٢٦٣٤)

٦٠٠٥- قتال المسلم كفر و سبابه فسوق و لا يحل لمسلم أن يهجر أخاه فوق ثلاثة أيام.

( صحيح ) ( حم ع طب الضياء ) عن سعد.

**٦٠٠٥- بەگژداچوونی موسوڵمان بێ باوەڕییە، جنێو پێدانیشی خراپەكاری و لەسنور دەرچوونە ، ڕەوایش نی یە بۆ موسوڵمان دەنگ دابڕێت لە براكەی نەكات لە سێ ڕۆژ زیاتر.**

(الصحيحة ٢٢٩٧)

٦٠٠٦- المستبان شيطانان يتهاتران و يتكاذبان.

( صحيح ) ( حم خد ) عن عياض بن حمار.

**٦٠٠٦- ئەو دوو كەسەی جنێو بە یەكتر دەدەن ، دوو شەیتانن قسەی پووچ و درۆ بەیەكتر دەدەن .**

(الترغيب ٢٧٨١)

٦٠٠٧- المستبان ما قالا فعلى البادئ منهما حتى يعتدي المظلوم.

( صحيح ) ( حم م د ت ) عن أبي هريرة.

**٦٠٠٧- ئەو دوو كەسەیە جنێو بە یەكتر دەدەن وەكو ئەوەیە كە دەیڵێن ، تاوانیش لەسەر دەست پێشخەرە تاكو ستەم لێكراوەكەیش دەست درێژی دەكات.**

(المشكاة ٤٨١٨)

---

[1] **ئەویش نزیكە لە هەڵەتەوە هەڵدرێتە ناو تونی دواڕۆژەوە .**

٦٠٠٨- لا تذكروا هلكاكم إلا بخير.

( صحيح ) ( ن ) عن عائشة.

**٦٠٠٨- بەچاكی نەبێت باسی مردووەکانتان مەکەن.**

(الروض ١٤٣٧)

٦٠٠٩- لا تؤذوا مسلما بشتم كافر.

( صحيح ) ( ك هق ) عن سعيد بن زيد.

**٦٠٠٩- ئازاری موسوڵمانێك مەدەن بە جنێو دان بە بێباوەڕێك .**

(الترغيب)

٦٠١٠- من هذا اللاعن بعيره ؟ ! أنزل عنه فلا تصحبنا بملعون لا تدعوا على أنفسكم و لا تدعوا على أولادكم و لا تدعوا على أموالكم لا توافقوا من الله ساعة يسأل فيها عطاء فيستجيب لكم.

( صحيح ) ( م د ) عن جابر.

**٦٠١٠- ئەوە کێ یە نەفرین لە ووشترەکەی خۆی دەکات ؟! دابەزە و بە نەفرین لێکراوەوە خاوڕێیەتیمان مەکە ، دوعا لە خۆتان و ماڵ و منداڵتان و مەکەن ، نەوەك هاوکات بێت لەگەڵ کاتێکدا ، کە خوای گەورە پاڕانەوەی تیا وەردەگرێت و ونزاکانتان گیرا دەکات.**

(صحيح ابي داود ١٣٧١)

٦٠١١- لا تلاعنوا بلعنة الله و لا بغضبه و لا بالنار.

( صحيح ) ( د ت ك ) عن سمرة.

**٦٠١١- بە نەفرینی خوا نەفرین لەیەکتر مەکەن ، هەروەها نە خەشم و قینی و نە ئاگریشی ڕووبەڕووی یەکتر مەکەن.**

(الصحيحة ٨٩٠)

٦٠١٢- لا ينبغي لصديق أن يكون لعانا.

( صحيح ) ( حم م ) عن أبي هريرة.

**٦٠١٢- دروست نییە بۆ هاوڕێیەك نەفرین کار بێت [1] .**

(الصحيحة ٢٦٣٦)

---

[1] دەربارەی هاوڕێکانی .

٦٠١٣- يا عباد الله ! وضع الله الحرج إلا من اقترض عرض امرئ مسلم ظلما فذلك الذي حرج و هلك.

( صحيح ) ( حم خد ن هـ حب ك ) عن أسامة بن شريك.

**٦٠١٣- ئەی بەندەکانی خوا! خوای گەورە گوناهی لابردووە لەسەر کەسێك نەبێت نامووسی موسوڵمانێك بریندار بکات بە ناهەق ، ئەوە گوناهە و تیاچوونە.**

(المشكاة ٢٥٣٢)

## بابەتی ترساندن لە تۆمەت بارکردنی موسوڵمان بە بێباوەڕی

٦٠١٤- إذا اكفر الرجل أخاه فقد باء بها أحدهما

( صحيح ) ( م ) عن ابن عمر .

**٦٠١٤- ئەگەر کەسێك براکەی بەبێ باوەڕ دابنێت ، حەتمەن یەکێکیان دەگرێتەوە.**

(المشكاة ٤٨١٥)

٦٠١٥- إذا قال الرجل لأخيه: يا كافر فقد باء بها أحدهما

( صحيح ) ( خ ) عن أبي هريرة ( حم خ ) عن ابن عمر .

**٦٠١٥- ئەگەر کەسێك بە براکەی بڵێت : هەی بێ باوەڕ یەکێکیان دەگرێتەوە .**

(الصحيحة ٢٨٩١)

٦٠١٦- إذا قال الرجل لأخيه: يا كافر فهو كقتله و لعن المؤمن كقتله

( صحيح ) ( طب ) عن عمران بن حصين .

**٦٠١٦- ئەگەر کەسێك بە براکەی ووت : ئەی بێ باوەڕ ، وەکو ئەوەیە کوشتبێتی ، نەفرین کردنیش لە موسوڵمان وەکو کوشتنیەتی.**

(الصحيحة ٣٣٨٥ )

٦٠١٧- أيما امرئ قال لأخيه: كافر فقد باء بها أحدهما إن كان كما قال و إلا رجعت إليه

( صحيح ) ( م ت ) عن ابن عمر .

**٦٠١٧- هەرکەسێك بە براکەی وت : بێ باوەڕ ، بەڕاستی یەکێکیان دەگرێتەوە ، جا ئەگەر قسەکە وا بێت ، ئەگەر نا دەگەڕێتەوە سەر خۆی.**

(الصحيحة ٢٨٩١)

٦٠١٨- أيما رجل مسلم أكفر رجلا مسلما فإن كان كافرا و إلا كان هو الكافر

( صحيح ) ( د ) عن ابن عمر .

**٦٠١٨- هەر پیاوێکی موسوڵمان پیاوێکی موسوڵمانی بە بێ باوەڕ دانا ، ئەگەر وانەبێت خۆی بێ باوەڕ دەبێت.**

(صحيح ابي داود ٤٦٨٧)

٦٠١٩- ما أكفر رجل رجلا قط إلا باء بها أحدهما.

( صحيح ) ( حب ) عن أبي سعيد.

**٦٠١٩- هەر کاتێك پیاوێك پیاوێکی تر بە بێ باوەڕ دابنێت هەر یەکێیان دەگرێتەوە.**

(الترغيب ٢٧٥٧)

٦٠٢٠- من رمى مؤمنا بكفر فهو كقتله.

( صحيح ) ( طب ) عن هشام بن عامر.

**٦٠٢٠- هەرکەسێك باوەڕدارێك تۆمەتبار بکات بە بێ باوەڕی وەکو ئەوەیە کوشتبێتی.**

(الترغيب ٢٧٧٦)

## بابەتی پیاو نەگەڕێتە لای کەس و کارەکەی بەشەو

٦٠٢١- إذا دخلت ليلا فلا تدخل على أهلك حتى تستحد المغيبة و تمتشط الشعثة

( صحيح ) ( خ ) عن جابر .

**٦٠٢١- ئەگەر بەشەو گەڕایتەوە مەچۆ لای هاوسەرەکەت تاکو موی لەشی لابات[1] و خۆی ڕێکدەخات.**

(الصحيحة١١٩٠)

٦٠٢٢- إذا أطال أحدكم الغيبة فلا يطرق أهله ليلا

( صحيح ) ( حم ق ) عن جابر .

**٦٠٢٢- ئەگەر کەسێکتان ماوەیەکی زۆری پێ چوو با بەشەو نەگەڕێتەوە لای خانەوادەکەی.**

(المشكاة ٣٩٠٣)

---

[1] **(( حتى تستحد المغيبة )) واتە هەتا بەری دەتاشێت ، موی بەری لابات و خۆی ئامادە دەکات . .**

٦٠٢٣- إذا قدم أحدكم ليلا فلا يأتين أهله طروقا حتى تستحد المغيبة و تمتشط الشعثة.

( صحيح ) ( م ) عن جابر .

**٦٠٢٣- ئەگەر كەسێكتان بەشەو گەڕايەوە با نەچێتە لای هاوسەرەكەی تاكو توكی بەری لادەبات و سەری شانە دەكات .**

(الصحيحة ٣٩٧٦)

٦٠٢٤- أمهلوا حتى ندخل ليلا لكي تمتشط الشعثة و تستحد المغيبة.

( صحيح ) ( ق د ن ) عن جابر .

**٦٠٢٤- لەسەرخۆتان تاكو شەو بچینەوە ماڵەوە ، بۆ ئەوەی خۆيان ڕێك بخەنقژياتن دابێننن و بەريان بتاشن.**

(الصحيحة٢٩٧٦)

٦٠٢٥- إن أحسن ما دخل الرجل على أهله إذا قدم من سفر أول الليل.

( صحيح ) ( د ) عن جابر .

**٦٠٢٥- چاكترين كاتێك پياوێك لە گەشت بگەڕێتەوە و بچێتە لای خێزانی سەرەتای شەوە.**

(المشكاة ٣٩٢١)

٦٠٢٦- نهى أن يطرق الرجل أهله ليلا.

( صحيح ) ( ق ) عن جابر.

**٦٠٢٦- پێغەمبەر ( ﷺ ) قەدەغەی كردووە پياوێك بەشەو بگەڕێتەوە لای هاوسەرەكەی.**

( المشكاة ٣٩٠٣ )

٦٠٢٧- لا تطرقوا النساء ليلا.

( صحيح ) ( طب ) عن ابن عباس.

**٦٠٢٧- بەشەو لە دەرگای خێزانەكانتان مەدەن.**

(الصحيحة٣٠٨٥)

## بابەتی ناپاكی

٦٠٢٨- آية المنافق ثلاث: إذا حدث كذب و إذا وعد أخلف و إذا ائتمن خان

( صحيح ) ( ق ت ن ) عن أبي هريرة .

**٦٠٢٨- نیشانەی دووڕو سێ شتە: ئەگەر قسە بكات درۆ دەكات و، ئەگەر بەڵێن بدات نایباتە سەر و، ئەگەر شتی پێ بسپێردرێت ناپاكی لێ دەكات.**

(الصحيحة١٩٩٨)

٦٠٢٩- إذا رأيتم الناس قد مرجت عهودهم و خفت أماناتهم و كانوا هكذا - و شبك بين أصابعه - فالزم بيتك و املك عليك لسانك و خذ بما تعرفه و دع ما تنكر و عليك بأمر خاصة نفسك و دع عنك أمر العامة

( صحيح ) ( د ) عن ابن عمرو .

**٦٠٢٩- ئەگەر بینیتان خەڵكی پەیمانشكێنیان تێكەوتووە و، دەست پاكیان كەم بۆتەوە و، ئاوهایان لێهات ( پەنجەی كرد بەیەكدا )، كونجی ماڵی خۆت بگرە و، زمانت بپارێزە و، ئەوەی دەیزانیت پابەند بێت پێوەی و، واز لەوە بهێنە كەنكۆڵی لێ دەكەیت وە تەنها كاری تایبەتی خۆت جێبەجێ بكە و، واز لە كاروباری گشتی بهێنە.**

(الصحيحة٢٠٥)

٦٠٣٠- أول ما تفتقدون من دينكم الأمانة

( صحيح ) ( طب ) عن شداد بن أوس .

**٦٠٣٠- یەكەمین شت لە ئایینەكەتاندا لە دەستی دەدەن دەست پاكی یە.**

(الصحيحة١٧٣٩)

٦٠٣١- أول ما يرفع من الناس الأمانة و آخر ما يبقى من دينهم الصلاة و رب مصل لا خلاق له عند الله تعالى

( صحيح ) ( الحكيم ) عن زيد بن ثابت .

**٦٠٣١- یەكەمین شت لە نێو خەڵكدا هەڵدەگیرێت دەست پاكی یە، كۆتا شتیش لە ناویاندا دەمێنێ نوێژە، زۆر نوێژكەرێكیش هەیە بەشی لە لای خوایە.**

(الروض النضير ٧٢٧)

٦٠٣٢- ثلاث من كن فيه فهو منافق و إن صام و صلى و قال: إني مسلم: من إذا حدث كذب و إذا وعد أخلف و إذا ائتمن خان

( صحيح ) ( رستة في الإيمان أبو الشيخ في التوبيخ ) عن أنس .

**٦٠٣٢- هەركەسێك سێ شتی تیا بێت دووڕوە ، ئەگەر چی نوێژیش بكات و ، ڕۆژوویش بگرێت و ، بلێ من موسوڵمانم : كەسێك كە قسەی كرد درۆ بكات و : كە بەڵێنی دا نەیباتە سەر و كە متمانەی پێكرا ناپاكی بكات .**

(الترغيب ٢٩٣٨)

٦٠٣٣- من ضار ضار الله به و من شاق شاق الله عليه.

( صحيح ) ( حم ٤ ) عن أبي صرمة.

**٦٠٣٣- هەركەسێك زیان بە موسوڵمانان بگەیەنێت خوای گەورە زیانی پێ دەگەیەنێت ، هەركەسیش شت لەسەر موسوڵمانان قورس بكات خوای گەورە شتی لەسەر قورس دەكات .**

(الارواء ٨٩٦)

٦٠٣٤- من غشنا فليس منا.

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي الحمراء.

**٦٠٣٤- هەركەسێك بما نخەڵەتێنێ لە ئێمە نییە ، (( پیلان و تەڵەكەیش لە دۆزەخدایە ))**[1].

(الصحيحة١٠٥٨)

## بابەتی سەر ڕاستی

٦٠٣٥- إذا حدث الرجل بحديث ثم التفت فهي أمانة.

( صحيح ) (حم د ت الضياء) عن جابر ( ع ) عن أنس.

**٦٠٣٥- ئەگەر پیاوێك قسەیەكی كرد و ئینجا لای كردەوە ئەوە قسەیە سپاردەیە.**

(الصحيحة١٠٨٩)

٦٠٣٦- إذا وسد الأمر إلى غير أهله فانتظر الساعة.

( صحيح ) ( خ ) عن أبي هريرة .

[1] واتە : ئە نجامدەریان شایانی چوونە ناو دۆزەخە.

**٦٠٣٦- ئەگەر لێپرسراوێتی درایە دەستی ناشایستە ئیتر چاوەڕوانی قیامەت بکە.**

(المشكاة ٤٥٣٩)

٦٠٣٧- إن الأمانة نزلت في جذر قلوب الرجال ثم نزل القرآن فعلموا من القرآن و علموا من السنة ينام الرجل النومة فتقبض الأمانة من قلبه فيظل أثرها مثل الوكت ثم ينام النومة فتقبض الأمانة من قلبه فيظل أثرها مثل المجل كجمر دحرجته على رجلك فنفط فتراه منتبرا و ليس فيه شيء فيصبح الناس يتبايعون لا يكاد أحد يؤدي الأمانة حتى يقال: إن في بني فلان رجلا أمينا ! حتى يقال للرجل: ما أجلده ؟ ما أظرفه ؟ ما أعقله ؟ و ما في قلبه حبة خردل من إيمان

( صحيح ) ( حم ق ت هـ ) عن حذيفة .

**٦٠٣٧- سەر ڕاستی لە ڕەگی دڵی پیاواندا هەڵکەنرا ، ئینجا قورئان هاتەخوار ، لە قورئان و لە سوننەتە وە ئەوە زانرا ، پیاوێك سەرخەوێك دەشکێنیٚ و ، سپاردە لە دڵی دەر دەکرێت و شوێنەوارەکەی وەکو تاریك و ڕۆشنی بەرە بەیان دەمێنێتەوە ئینجا دەخەوێتەوەو سپاردە لە دڵی ڕیشەکێش دەکرێت و شوێنەوارەکەی وەکو شوێنەواری کاری دەست دەمێنێتەوە ، وەکو ژیلەمۆیەك تلیبدەیتە سەر پێی خۆت و بیئاوسێنیٚ وە ئیتر خەڵکی کڕین و فرۆشتن دەکەن و سپاردەیان بە دەگمەن تیادەمێنێتەوە تاکو دەوترێت : لە وەچەی فلاْنەکەس ئەمنیە : تاکو بە پیاو دەوترێت : چەند ئازایە ؟ چەند قسە خۆشە ؟ چەند ژیرە ؟ ئەوەندەی گەردیلەیەکیش باوەڕ لە دڵیدا نییە.**

(المشكاة ٥٣٨١)

## بابەتی قەدەغە کردنی درۆ

٦٠٣٨- أربع من كن فيه كان منافقا خالصا و من كانت فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة من النفاق حتى يدعها: إذا ائتمن خان و إذا حدث كذب و إذا عاهد غدر و إذا خاصم فجر

( صحيح ) ( ق ) عن ابن عمر .

**٦٠٣٨- چوار خەسڵەت هەیە لە هەرکەسێکدا بێت دوورویەکی بیٚ خەوشە ، هەرکەسێك خەسڵەتێکی لەوانە تیا بێت ، خەسڵەتێکی لە دووڕویی تیایە تاکو وازی لیٚ دەهێنێت : ئەگەر متمانەی پێبکرێت و ناپاکی بکات ، ئەگەر قسەی کرد درۆ بکات ، ئەگەر پەیمان بدات و ناپاکی دەربارەی پەیمانەکەی بکات ، لە کاتی ناکۆکیشدا زیادەڕەوی بکات.**

(المشكاة ٥٦)

٦٠٣٩- أربع من كن فيه كان منافقا خالصا و من كانت فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة من النفاق حتى يدعها: إذا حدث كذب و إذا وعد أخلف و إذا عاهد غدر و إذا خاصم فجر

( صحيح ) ( حم ق ٣ ) عن ابن عمرو .

**٦٠٣٩- هەركەسێك چوار شتی تيا بێت دوورويەكی بێ خەوشە ، هەركەسيش خەسڵەتێك لەوانەی تيا بێت بەشێك دووڕووی تيايە تاكو وازی لێ دەهێنێ : كە قسەی كرد درۆ بكات، كە بەڵێن بدات نەيباتە سەر ، كە پەيمانيش بدات ناپاكی بكات ، لە كێشەو پشێويدا سنووربەزێنێ.**

(صحيح ابي داود ٤٦٨٨)

٦٠٤٠- أكبر الكبائر الإشراك بالله و قتل النفس و عقوق الوالدين و شهادة الزور.

( صحيح ) ( خ ) عن أنس .

**٦٠٤٠- گەورەترينی تاوانەكان هاوەڵ بۆ خوا دانانە و ، كوشتن و ، ئازاردانی دايك و باوك و ، شايەتی درۆ.**

(غاية المرام ٢٧٥)

٦٠٤١- أما إنك لو لم تعطه شيئا كتب عليك كذبة.

( صحيح ) ( حم د ) عن عبدالله بن عامر بن ربيعة .

**٦٠٤١- ئەگەر هيچت پێ نەدايە درۆيەكت لەسەر دەنووسرا.**

(الصحيحة٧٤٨)

٦٠٤٢- في المنافق ثلاث خصال: إذا حدث كذب و إذا وعد أخلف و إذا ائتمن خان.

( صحيح ) ( البزار ) عن جابر.

**٦٠٤٢- سێ خەسڵەت لە هەيە : كە قسە بكات درۆ دەكات ، كە بەڵێن بدات نايباتە سەر و ، كە سپاردەی پێ بسپێردرێت ناپاكی لێ دەكات.**

(الصحيحة ١٩٩٨)

٦٠٤٣- لا تجمعن كذبا و جوعا.

( صحيح ) ( حم هـ ) عن أسماء بنت عميس.

**٦٠٤٣- هەرگيز درۆ و برسێتی پێكەوە كۆمەكەرەوە[1].**

(اداب الزفاف ١٧)

---

[1] **واتە بڵێت حەزم لە خواردن نی يە و برسيم نيە ڕاستيش نەكەيت .**

٦٠٤٤- كفى بالمرء كذبا أن يحدث بكل ما سمع.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة.

**٦٠٤٤- بەسە بۆ درۆزنی کەسێك هەرچی بیست باسی بکات.**

(الصحيحة٢٠٢٥)

٦٠٤٥- كان أبغض الخلق إليه الكذب.

( صحيح ) ( هب ) عن عائشة.

**٦٠٤٥- خراپترین ڕەوشت بەلای پێغەمبەر ( ﷺ ) درۆ کردن بوو.**

(الصحيحة٢٠٥١)

٦٠٤٦- كان إذا اطلع على أحد من أهل بيته كذب كذبة لم يزل معرضا عنه حتى يحدث توبة.

( صحيح ) ( حم ك ) عن عائشة.

**٦٠٤٦- كە پێغەمبەر ( ﷺ ) بۆی دەربکەوتایە یەکێك لە کەس و کارەکانی درۆیەکی کردووە ڕووی لێ وەرگێڕا تاکو تەوبەی دەکرد.**

(الصحيحة٢٠٥١)

٦٠٤٧- لم يكذب من نمى بين اثنين ليصلح.

( صحيح ) ( م د ) عن أم كلثوم بنت عقبة.

**٦٠٤٧- درۆی نەکردووە کەسێك ویستبێتی نێوانی دوو کەس چاککاتەوە.**

(الترغيب ٢٨١٥)

٦٠٤٨- ليس الكذاب بالذي يصلح بين الناس فينمي خيرا و يقول خيرا.

( صحيح ) ( حم ق د ت ) عن أم كلثوم بنت عقبة ( طب ) عن شداد بن أوس.

**٦٠٤٨- ئەو کەسە درۆزن نییە بیەوێت ئاشتەوایی بکات لە نێوان خەڵکی دا ، قسە ئەمبەرو ئەوبەر پێ بکات و قسەی چاك بکات.**

(الصحيحة ٥٤٢)

٦٠٤٩- المتشبع بما لم يعط كلابس ثوبي زور.

( صحيح ) ( حم ق د ) عن أسماء بنت أبي بكر ( م ) عن عائشة.

**٦٠٤٩- ئەو کەسەی وا خۆی دەردەخات کە تێرە و هیچیشی پێ نەدراوە ، وەکو کەسێکە دوو پۆشاکی درۆینەی لەبەردا بێت[1] .**

(الروض ٨٢٠)

---

[1] **واتە : جل و بەرگێکی لەبەردا بێت خۆی وەکو پیاو چاکان دەربخات و لە ڕاستیشدا وا نەبێت .**

٦٠٥٠- لا يصلح الكذب إلا في ثلاث: يحدث الرجل امرأته ليرضيها و الكذب في الحرب و الكذب ليصلح بين الناس.

( صحيح ) ( ت ) عن أسماء بنت يزيد.

**٦٠٥٠- درۆ كردن دروست نییە لە سێ حاڵەتدا نەبێت :قسەی پیاو بۆ هاوسەرەكەی بۆ ڕازیكرنی ، درۆ لە جەنگدا ، درۆ بۆ ئاشتەوایی نێو خەڵكی .**

(الصحيحة٥٤٥)

٦٠٥١- كفى بالمرء إثما أن يحدث بكل ما يسمع.

( صحيح ) ( د ك ) عن أبي هريرة.

**٦٠٥١- بەسە بۆ گوناهباری كەسێك هەرچی بیست باسی بكات.**

(الصحيحة٢٠٢٥)

## بابەتی نەفرین كردن

٦٠٥٢- إن العبد إذا لعن شيئا صعدت اللعنة إلى السماء فتغلق أبواب السماء دونها ثم تهبط إلى الأرض فتغلق أبوابها دونها ثم تأخذ يمينا و شمالا فإذا لم تجد مساغا رجعت إلى الذي لعن فإن كان لذلك أهلا و إلا رجعت إلى قائلها.

( صحيح ) ( د ) عن أبي الدرداء .

**٦٠٥٢- بەڕاستی بەندە كاتێك نەفرین لە شتێك دەكات ، نەفرینەكە بەرزدەبێتەوە بۆ ئاسمان و دەرگاكانی ئاسمان لە ڕوویدا دا دەخرێن ، ئینجا دادەبەزێتەوە بۆ سەر زەوی و دەرگاكانی بەڕوویدا دادەخرێت ، ئینجا بەلای ڕاست و چەپدا دەڕوات ، جا كە هیچ كەلێنێكی نەدۆزێتەوە دەگەڕێتەوە سەر ئەو كەسەی نەفرینەكەی لێكراوە ، ئەگەر ئەویش شایستەی نەبێت، دەگەڕێتەوە سەر ئەو كەسەی لە دەمی دەرچووە.**

(الصحيحة١٢٦٩)

٦٠٥٣- إذا خرجت اللعنة من في صاحبها نظرت فإن وجدت مسلكا في الذي وجهت إليه و إلا عادت إلى الذي خرجت منه

( صحيح ) (هب) عن عبدالله

**٦٠٥٣- كاتێك نەفرین لە دەمی خاوەنەكەی دەردەچێت ، ئەگەر ئەو كەسەی بۆی ئاراستە كراوە شایەنی بێت ، ئەگەر نا دەگەڕێتەوە ، بۆ لای ئەو كەسەی لە دەمی دەرچووە.**

(الصحيحة١٢٦٩)

٦٠٥٤- إن من أكبر الكبائر أن يلعن الرجل والديه : يلعن أبا الرجل فيلعن أباه ، ويلعن أمّه فيلعن أمّه .

( صحيح ) ( خ ) عن أنس .

**٦٠٥٤- گەورەترینی تاوانەكان ئەوەیە پیاوێك نەفرین لە باوك و دایكی خۆی بكات : نەفرین لە باوكی پیاوێك دەكات ئەویش نەفرین لە باوكی ئەم دەكات و ، نەفرین لە دایكی دەكات و ئەویش نەفرین لە دایكی ئەم دەكات.**

(صحيح ابي داود ٥١٤١)

٦٠٥٥- إني لم أبعث لعانا.

( صحيح ) ( طب ) عن كريز بن أسامة .

**٦٠٥٥- بەڕاستی من من لە نەفرینكار ڕەوانە نەكراوم.**

(الضعيفة ٣٢٢٠)

٦٠٥٦- إني لم أبعث لعانا و إنما بعثت رحمة.

( صحيح ) ( خد م ) عن أبي هريرة .

**٦٠٥٦- بەڕاستی من من بە نەفرینكاری ڕەوانە نەكراوم ، بەڵكو تەنها بە سۆز و میهرەبانی ڕەوانە كراوم .**

(الضعيفة ٣٢٢٠)

٦٠٥٧- أوصيك أن لا تكون لعانا.

( صحيح ) ( حم تخ طب ) عن جرموز بن أوس .

**٦٠٥٧- ئامۆژگاریت دەكەم نەفرەتكار مەبە .**

(الصحيحة١٧٢٩)

٦٠٥٨- ليس المؤمن بالطعان و لا اللعان و لا الفاحش و لا البذي.

( صحيح ) ( حم خد حب ك ) عن ابن مسعود.

**٦٠٥٨- باوەڕدار ، جنێو فرۆش و ، نەفرەتكەر و ، زمان پیس و ، جنێو فرۆش نییە .**

(الصحيحة٣٢)

٦٠٥٩- لا يكون اللعانون شفعاء و لا شهداء يوم القيامة.

( صحيح ) ( حم م د ) عن أبي الدرداء.

**٦٠٥٩- نەفرەتكەرەكان نابنە شايەت و تكاكار لە رۆژی قيامەتدا .**

(الترغيب ٢٧٨٦)

٦٠٦٠- لا يكون المؤمن لعانا.

( صحيح ) ( ت ) عن ابن عمر.

**٦٠٦٠- بڕوادار نابێ نەفرەتكار بێت.**

(المشكاة ٤٨٤٨)

٦٠٦١- يا عائشة ! لا تكوني فاحشة.

( صحيح ) ( م ) عن عائشة.

**٦٠٦١- ئەی عائيشە ! با قسەت ناشرين نەبێت[1].**

(الصحيحة١٠٤٩)

## بابەتی پياهەڵدان

٦٠٦٢- احثوا التراب في وجوه المداحين

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة ( عد حل ) عن ابن عمر .

**٦٠٦٢- خۆڵ بكەن بە ڕووی ستايشكاراندا[2].**

(الصحيحة٩١٢)

٦٠٦٣- احثوا في أفواه المداحين التراب

( صحيح ) ( هـ ) عن المقداد بن عمرو ( حب ) عن ابن عمر ( ابن عساكر ) عن عبادة بن الصامت .

**٦٠٦٣- خۆڵ بكەنە دەمی ستايشكارانەوە.**

(الصحيحة٩١٢)

---

[1] **جوولەكەيەك بە پێغەمبەر (ﷺ) ی وت: (السام عليكم) پێغەمبەر (ﷺ) يش پێی فەرموو : (و عليكم) بەڵام عائيشە بە جوولەكەكەی ووت : مردن و نەفرەتيشتان لێ بێت ، ئيتر لەو كاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی فەرموو .**

[2] **واتە : ئەوانەی بەرمو ڕوو بەخەڵكيدا هەڵدەنێن .**

٦٠٦٤- إذا رأيتم المداحين فاحثوا في وجوههم التراب

( صحيح ) ( حم خد م د ت ) عن المقداد بن الأسود ( طب هب ) عن ابن عمر ( طب ) عن ابن عمرو ( الحاكم في الكنى ) عن أنس .

**٦٠٦٤- ئەگەر ستایشکارانتان بینی خۆڵ بکەن بە دەم و چاویاندا .**

(الصحيحة٩١٢)

٦٠٦٥- إياكم و التمادح فإنه الذبح

( صحيح ) ( هـ ) عن معاوية .

**٦٠٦٥- نەکەن ستایشی یەکتربکەن ، چونکە ئەو سەربڕینە.**

(الصحيحة١٢٨٤)

٦٠٦٦- ذبح الرجل أن تزكيه في وجهه .

( صحيح ) ( ابن أبي الدنيا في الصمت ) عن إبراهيم التيمي مرسلا.

**٦٠٦٦-سەر بڕینی کەسێك ئەوەیە بەرمو ڕوو پیاهەڵدەی.**

٦٠٦٧- قولوا بعض قولكم و لا يستحوذنكم الشيطان.

( صحيح ) ( حم د ) عن والد مطرف.

**٦٠٦٧-هەندێ لە قسانەکانتان بکەن بەڵام با شەیتان زاڵنەبێتە سەرتاندا**[1] **.**

(المشكاة ٥٩٠١)

٦٠٦٨- ويلك ! قطعت عنق صاحبك من كان منكم مادحا أخاه لا محالة فليقل: أحسب فلانا و الله حسيبه و لا أزكي على الله أحدا أحسبه كذا و كذا إن كان يعلم ذلك منه.

( صحيح ) ( حم ق د هـ ) عن أبي بكرة.

**٦٠٦٨-بەڵام لێتدا ! گەردنی هاوەڵەکەت قرتاند ، ئەگەر کەسێك لە ئێوە هەر دەبێت ستایشی براکەی بکات با بڵێ ، وا ئەزانم فلانە کەس وایە و ، خوایش باشتر دەزانێ و ، پاکانەی کەس بۆ خوای گەورە ناکەم و ، گومان دەبەم ئاوا و ئاوا بێت ، ئەگەر دەزانیت ئەو شتانەی تیایە.**

(صحيح ابن ماجة ٣٧٤٤)

٦٠٦٩- لا تطروني كما أطرت النصارى ابن مريم فإنما أنا عبد فقولوا: عبد الله و رسوله.

( صحيح ) ( خ ) عن عمر.

---

[1] **واتە : با شەیتان هانتان نەدات زیادە ڕەوی بکەن لە ستایش کردن و پیاهەڵوتندا .**

**٦٠٦٩- سنور مەشكێنن لە مەزنكردنمدا ، وەكو مەزن ڕاگرتنی گاورەكان سنوریان بەزانـد لە مەزنكردنی عیسادا ، من تەنها بەندەیەكم ، بڵێن : بەندە و پێغەمبەری خوایە.**

(المشكاة ٤٨٩٧)

٦٠٧٠- لا تعجبوا بعمل عامل حتى تنظروا بم يختم له.

( صحيح ) ( طب ) عن أبي أمامة.

**٦٠٧٠- سەرسام مەبن بە كردەوەی كەسێك تاكو نەبینن بەچی كۆتایی پێ دێت.**

(الصحيحة٣٣٤)

## بابەتی زەمكردنی خۆبەزلزانین

٦٠٧١- إن الله قد أذهب عنكم عبية الجاهلية و فخرها بالآباء مؤمن تقي و فاجر شقي أنتم بنو آدم و آدم من تراب ليدعن رجال فخرهم بأقوام إنما هم فحم من فحم جهنم أو ليكونن أهون على الله من الجعلان التي تدفع بأنفها النتن.

( صحيح ) ( حم د ) عن أبي هريرة .

**٦٠٧١- خـوای گـەورە خۆبـەزلزانینی نـەفامی و شـانازیكردنیانی بـە بـاوو باپیرانـەوەی لەسەر لابردن ، باوەڕدارێكی لە خواترس و ، خراپەكارێكی نەگبەت ، ئێـوە ئـادەمیزادن ، ئادەمیش لە گڵە ، دەبێ كەسانێك واز بهێنن لە شـانازی كردنیـان بـە بـاوو باپیرانیـان كە سووتەمەنی دۆزەخن ، یان لەلای خوا لە قالۆنچە بێ بایەختر دەبن كە بـەلوتی شـتی بۆگەن تل ئەدات..**

(غاية المرام ٣١٢)

٦٠٧٢- الكبر من بطر الحق و غمط الناس.

( صحيح ) ( د ك ) عن أبي هريرة.

**٦٠٧٢- خۆبەزلزانین پاش گوێ خستنی هەق و ، خەڵك بە كەم تەماشاكردنە.**

(الصحيحة١٣٤)

٦٠٧٣- انظر فإنك لست بخير من أحمر و لا أسود إلا أن تفضله بتقوى.

( صحيح ) ( حم ) عن أبي ذر .

**٦٠٧٣-بڕوانە چونكە بەڕاستی تۆ لە هیچ سوور و ڕەشێك چاكتر نیت ، مەگەر بە لەخواترسان لەو باشتر بیت.**

(غاية المرام ٣٠٦)

٦٠٧٤- من فارق الروح جسده و هو بريء من ثلاث دخل الجنة: الكبر والدين و الغلول.

( صحيح ) ( حم ت ن هـ حب ك ) عن ثوبان.

**٦٠٧٤- هەركەسێك گیانی لە لاشەی جیا بێتەوە لە سێ شت بەری بێت دەچێتە بەهەشتەوە: خۆبەزلزانین و ، قەرزاری و ، دزیكردن لە دەسكەوتەكان.**

(المشكاة ٤٨١٥)

٦٠٧٥- اتقوا هذه المذابح - يعني المحاريب -

( صحيح ) ( طب هق ) عن ابن عمرو .

**٦٠٧٥- خۆتان بپارێزن لە سنگ دەرپەڕاندن و خۆ هێنانە پێشەوە.**

(الضعيفة ٥٨١٥)

٦٠٧٦- احتجت الجنة و النار فقالت الجنة: يدخلني الضعفاء و المساكين و قالت النار: يدخلني الجبارون و المتكبرون: فقال الله للنار: أنت عذابي أنتقم بك ممن شئت و قال للجنة: أنت رحمتي .أرحم بك من شئت و لكل واحدة منكما ملؤها.

( صحيح ) ( م ت ) عن أبي هريرة ( م ) عن أبي سعيد ( ابن خزيمة ) عن أنس .

**٦٠٧٦- بەهەشت و دۆزەخ دەستیان كردە بەڵگە هێنانەوە ، بەهەشت وتی: لاواز و هەژارەكان دێنە ناوم، دۆزەخیش وتی: ستەم كارو خۆبەزلزانەكان دێنە ناوم ، ئینجا خوای گەورە بە دۆزەخی فەرموو : تۆ سزای منی تۆڵەت پێ دەسێنمەوە لە هەركەسێك بمەوێت ، بە بەهەشتیشی فەرموو: تۆ سۆز و بەزەیی منی ، بە تۆ میهرەبانیم دایدەڕێژم بەیەر هەركەسێكدا بمەوێت ، هەریەكەشتان و پڕ دەكەم .**

(السنة ٥٢٨)

٦٠٧٧- إن الله تعالى يبغض البليغ من الرجال الذي يتخلل بلسانه تخلل الباقرة بلسانها.

( صحيح ) ( حم د ت ) عن ابن عمرو .

**٦٠٧٧- خوای گەورە ڕقی لە كەسی قسەزل و سەركەشە ، كە زمانی بەملاو ئەولادا دەردەهێنی بە چەشنی گەلە مانگا.**

(الصحيحة٨٧٨)

٦٠٧٨- إن الله يبغض كل جعظري جواظ سخاب في الأسواق جيفة بالليل حمار بالنهار عالم بالدنيا جاهل بالآخرة.

( صحيح ) ( هق ) عن أبي هريرة .

**٦٠٧٨- بەڕاستی خوا رقیەتی لەهەموو رقنیکی خۆ بەگەورەزانی دونیا خۆری پیسکە لەبازاڕدا هاواردەکات و بەشەویش لاکە تۆپیوو بەڕۆژ گوێدرێژی پارە شارەزای دونیایە و نەزانە دەربارەی دواڕۆژ .**

(الصحيحة٨٧٨)

٦٠٧٩- ألا أخبرك بأهل النار ؟ كل جعظري جواظ مستكبر جماع منوع ألا أخبرك بأهل الجنة ؟ كل مسكين لو أقسم على الله تعالى لأبره.

( صحيح ) ( طب ) عن أبي الدرداء .

**٦٠٧٩- ئايا ئاگادارت بكەم لە خەڵكی دۆزەخ ؟ هەموو دڵ ڕەقێکی سەرکەش و پیسکە و خۆبەگەورەزانە سەرکەشی ، ئایا ئاگادارت بکەم لە خەڵکی بەهەشت؟ هەموو هەژارێك كە ئەگەر سوێند بخوا لەسەر خوای گەورە خوا سوێندەكەی ناشكێنێ.**

(الصحيحة١٧٤١)

٦٠٨٠- ألا أخبركم بأهل الجنة ؟ كل ضعيف متضعف لو أقسم على الله لأبره ألا أخبركم بأهل النار ؟ كل عتل جواظ جعظري مستكبر.

( صحيح ) ( حم ق ت ن هـ ) عن حارثة بن وهب .

**٦٠٨٠- ئەرێ ئاگادارتان بكەم لە خەڵكی بەهەشت؟ هەموو لاوازێكی خۆ بەلاواز زان ، كە ئەگەر سوێند بخوات لەسەر خوای گەورە خوا سوێندەكەی ناشكێنێ ، ئایا ئاگادارتان بكەمەوە لە خەڵكی دۆزەخ ؟ هەموو دڵڕەقێكی پیسكەی خۆبەزلزان.**

( مشكلة الفقر ١٢٥ )

٦٠٨١- ثلاثة لا يكلمهم الله يوم القيامة و لا يزكيهم و لا ينظر إليهم و لهم عذاب أليم: شيخ زان و ملك كذاب و عائل مستكبر.

( صحيح ) ( م ن ) عن أبي هريرة .

**٦٠٨١- سێ کەس هەن خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت قسەیان لەگەڵ ناکات ، پاکیان ناکاتەوە و ، تەماشایان ناکات و ، سزایەکی سەختیشیان بۆ هەیە: پیرێکی داوێن پیس، پادشایەکی درۆزن ، هەژارێکی خۆبەزلزان.**

(الروض النضير ٣٤٢)

٦٠٨٢- خرج رجل ممن كان قبلكم في حلة له يختال فيها فأمر الله الأرض فأخذته فهو يتجلجل فيها إلى يوم القيامة.

( صحيح ) ( ت ) عن ابن عمرو .

**٦٠٨٢- پیاوێك لەوانەی پێش ئێوە لە پۆشاکێکی ڕازاوەدا لەماڵ دەرچوو بە لە خۆبایی بوونەوە ، ئیتر خوای گەورە فەرمانی بە زەوی کرد بردی بە ناخی خۆیداو ، تا ڕۆژی قیامەت ترینگە ترینگی دێت.**

(صحيح الترمذي ٢٤٩١)

٦٠٨٣- شرار أمتي الثرثارون المتشدقون المتفيهقون و خيار أمتي أحاسنهم أخلاقا.

( صحيح ) ( خد ) عن أبي هريرة.

**٦٠٨٣- خراپترینی ئوممەتم زۆربلێ و فرەڕێس و هەڵەوەڕەکان بە فیشاڵن و ئەوانەی لەقسەکردندا دەم بادەدەن هەر خەریکی قسەی زلن و چاکەکانی ئوممەتیشم ڕەوشت جوانەکانە.**

(الصحيحة٩٨٩١)

٦٠٨٤- ما من رجل يتعاظم في نفسه و يختال في مشيته إلا لقي الله تعالى و هو عليه غضبان.

( صحيح ) ( حم خد ك ) عن ابن عمر.

**٦٠٨٤- هەرکەسێك لە دەروونی خۆیدا خۆی لەلا مەزن بێت لە ڕۆیشتنیشدا بەفیروفیشال بێت ، بێگومان کاتێك بە پەروەردگاری دەگات لێی تورەیە.**

(الصحيحة٢٢٧٢)

٦٠٨٥- لا يدخل النار أحد في قلبه مثقال حبة خردل من إيمان و لا يدخل الجنة أحد في قلبه مثقال حبة خردل من كبرياء.

( صحيح ) ( م د ت هـ ) عن ابن مسعود.

**٦٠٨٥- ناچێته دۆزەخەوه كەسێك ئەوەنـدەی دەنكـە خەردەلەیـەك بـڕوای لـە دڵـدا بێـت و ناچێته بەهەشتیشەوه كەسێك ئەوەندەی دەنكە خەردەلەیەك خۆبەگەوره زانینی تیا بێت.**

(اصلاح المساجد ١١٥)

٦٠٨٦- يحشر المتكبرون يوم القيامة أمثال الذر في صور الرجال يغشاهم الذل من كل مكان يساقون إلى سجن في جهنم يسمى بولس تعلوهم نار الأنيار يسقون من عصارة أهل النار طينة الخبال.

( صحيح ) ( حم ت ) عن ابن عمرو.

**٦٠٨٦- خۆبەزلزانـەكان لـە ڕۆژی قیامـەت دا وەكـو ورده مێروولـە كۆدەكرێنـەوه لەسـەر شێوەی پیاوانـدا ، لـە هـەموو لایەكـەوه زەلیلـی و زەبـونی دایـان دەپۆشـێ ، دەبـرێن بـۆ زینـدانێك لـە دۆزەخ پێـی دەوترێـت (بـولس) ئـاگری زۆریـان لەسـەرەوەیە، كـیم و جەراعەتی خەڵكی دۆزەخیان دەرخوارد دەدرێت لە قوڕی دۆزەخ.**

(المشكاة ٥١١٢)

٦٠٨٧- إن من الغيرة ما يحب الله و منها ما يبغض الله و إن من الخيلاء ما يحب الله و منها ما يبغض الله فأما الغيرة التي يحبها الله فالغيرة في الريبة و أما الغيرة التي يبغض الله فالغيرة في غير الريبة و أما الخيلاء التي يحبها الله فاختيال الرجل في القتال و اختياله عند الصدقة و أما الخيلاء التي يبغض الله فاختيال الرجل في البغي و الفخر.

( صحيح ) ( حم د ن حب ) جابر بن عتيك .

**٦٠٨٧- هەندێ لە پەرۆشی هەیە خوای گەوره پێی خۆشە لێ دەكات و ، ڕقیشی ڕقـی لـە هەندێكیـشیەتی ، هەنـدێ خـۆ نوانـدن بـوونی هەیـە خـوا پێـی خۆشـە و ، ڕقـی لـە هەندێكیشیەتی ، ئەو پەرۆشیەی خوا پێی خۆشە ئەوەیە گومان هەڵگر بێت ، ئـەوەش پێی ناخۆشە ئەوەیە گومان هەڵگر بێت ، ئەو خۆ نوا كە خـوای ندنـەش كـە خـوای گـەوره پێی خۆشە لە كاتی جەنگدایە یان لە كاتی خێركردنـایە ، ، ئەوەیش كە پێی ناخۆشە ، ئەوەیە لە خراپە و شانازیكرندا بێت.**

(الارواء ٢٠٥٩)

٦٠٨٨- من تعظم في نفسه و اختال في مشيته لقي الله و هو عليه غضبان.

( صحيح ) ( حم خد ) عن ابن عمر.

**٦٠٨٨- هەركەسێك لە دەرونی خۆیدا خۆی بە گەوره بزانێ و لە ڕۆیشتنیشدا فیز بكـات ، بە خوای خۆی دەكات و خوا لێی تووڕەیە.**

(الصحيحة٥٤٢)

# بابەتی ڕەچەڵەك

٦٠٨٩- إذا رأيتم الرجل يتعزى بعزاء الجاهلية فأعضوه بهن أبيه و لا تكنوا

( صحيح ) ( حم ت ) عن أبي .

**٦٠٨٩- ئەگر بینیتان پیاوێك شانازی بە سەردەمی نەفامی یەوە دەكات ، بڵێن قەپ بەگونی باوكدا بكە و ڕاستەوخۆ پێی بڵێن و مەشیشارنەوە[1]، [2]**

(الصحيحة٢٦٩)

٦٠٩٠- إذا سمعتم من يعتزي بعزاء الجاهلية فأعضوه و لا تكنوا

( صحيح ) ( حم ن حب طب الضياء ) عن أبي .

**٦٠٩٠- ئەگەر بیستان كەسێك شانازی بە سەردەمی نەفامی یەوە دەكات، پێی بڵێن قەپ بە گونی باوكدا بكە و مەیشارنەوە .**

(الصحيحة٢٦٩)

٦٠٩١- ثلاث لم تزلن في أمتي: التفاخر بالأحساب و النياحة و الأنواء

( صحيح ) ( ع ) عن أنس .

---

[1] حاشا هەرگیز پێغەمبەری خوا قسەی وا ناكات ، چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خاوەنی بەرزترین ڕەوشت و پاراوترین زمانە و جوانترین گوفتارە ، ئایا دەشێت هاوەڵانی و ئومەتەكەی ڕێنموونی بكات بۆ قسەی ناشرین، ئینجا جنێودان بە بت پەرستان بە دەقی قورئان قەدەغە كراوە وەكو خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّواْ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ (الأنعام : ١٠٨) سوننەتی پێغەمبەریش (ﷺ) هیچ كاتێك ناكۆك نییە لەگەڵ قورئانی پیرۆز .

تەنها ئەوەش بەسە كە خوای گەورە ستایشی پێغەمبەرەكەی كردووە و فەرمویەتی:﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ چۆنە پێغەمبەر لە ئەم ئاستە ڕەوشتی یە بەرزەدا ، هاوەڵانی فێر جنێوێك دەكات هەست بە شەرمەزاری بكەیت لە باسكردنی ؟ بۆیە ئەم فەرموودەیە ، ئەگەر سەنەدەكەشی تەواو بێت ، ناوەرۆكەكەی (علة) ی تیایە و ناكۆكە لەگەڵ هەندێ بنچینەی جێگیر هەیە لە ئیسلامدا كە ئەمە جێگای شیكردنەوەی نییە. (وەرگێر)

[2] بەڵكو ئەم ووتەیە پەندی پێشینانەو پێغەمبەریش سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت وەكو پەندی سەرزمانی خۆیان وتویانە دەنا ماناكەی وانیە .

**٦٠٩١- سیٚ شت هەیە بەردەوام لە ئوممە تمدا دمیٚننەوە : شانازیکردن بە کەسوکارمومو، شیوەن کردن لەسەر مردوو جادووی ئەستیٚرەناسی.**

(الصحيحة١٧٩٩)

٦٠٩٢- ثلاث من فعل أهل الجاهلية لا يدعهن أهل الإسلام: استسقاء بالكواكب و طعن في النسب و النياحة على الميت.

( صحيح ) ( تخ طب ) عن جنادة بن مالك .

**٦٠٩٢-سیٚ شت هەن کردەوەی خەڵکی سەردەمی نەفامین و موسوڵمانان وازیان لیٚ ناهیٚنن، داواکردنی باران لە هەسارە و،تانەو تەشەردان لە بنەماڵە و شیوەن کردن لەسەر مردوو.**

(الصحيحة١٨٠١)

٦٠٩٣- ثلاثة من أعمال الجاهلية لا يتركهن الناس: الطعن في الأنساب و النياحة على الميت و قولهم مطرنا بنوء كذا و كذا.

( صحيح ) ( طب ) عن عمرو بن عوف .

**٦٠٩٣- سیٚ شت هەیە لە کردەوەی سەردەمی نەفامیە و خەڵکیش هەر وازیان لیٚ ناهیٚنن ، تانەو تەشەردان کردن بە ڕەچەڵەك ، و شیوەنکردن لەسەر مردوو ، ئەوەش کە دەڵیٚن: بە پیرۆزی فلاٌنە ئەستیٚرە و فلاٌنە ئەستیٚرە بارا نمان بۆ باری.**

(الصحيحة ١٨٠١)

٦٠٩٤- ثلاثة من الجاهلية: الفخر بالأحساب و الطعن في الأنساب و النياحة.

( صحيح ) ( طب ) عن سلمان .

**٦٠٩٤- سیٚ شت لە نەفامیەوەن : شانازیکردن بە ڕەسەنایەتی بنەماڵە و ، سووکایەتی کردن بە ڕەچەڵەك و شیٚوەن گیٚڕان.**

(الصحيحة ١٨٠١)

٦٠٩٥- كلكم بنو آدم و آدم خلق من تراب لينتهين قوم يفتخرون بآبائهم أو ليكونن أهون على الله من الجعلان.

( صحيح ) ( البزار ) عن حذيفة.

**٦٠٩٥- هەمووتان نەوەی ئادەمن ، ئادەمیش لە گڵە ، کەسانیٚك کە شانازی دەکەن بە باوو باپیرانەوە ، یان واز بهیٚنن لەو کارەیان ، یان لە لای خوای گەورە لە قالۆنچە بیٚ بایەخ تر دەبن.**

(غاية المرام ٣٠٧)

٦٠٩٦- كل نسب و صهر ينقطع يوم القيامة إلا نسبي و صهري.

( صحيح ) ( ابن عساكر ) عن ابن عمر.

**٦٠٩٦- هەموو ڕەچەڵەك و خزمايەتتيەكی ژن و ژنخوازی دەپچڕێت لـە ڕۆژی قيامـەت ، جگە لە ڕەچەڵەك و خزمايەتیحەزو زاوايەتی من نەبێت .**

(الصحيحة ٢٣٦)

٦٠٩٧- لينتهين أقوام يفتخرون بآبائهم الذين ماتوا إنما هم فحم جهنم أو ليكونن أهون على الله من الجعل الذي يدهده الخرء بأنفه إن الله أذهب عنكم عبية الجاهلية و فخرها بالآباء إنما هو مؤمن تقي أو فاجر شقي الناس كلهم بنو آدم و آدم خلق من التراب.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة

**٦٠٩٧- ئەبێت كەسانێك واز بهێنن لە شانازيكردن بە باوو با پيرانيانەوە ئەوانـەيان كـە مردوون ، ئەوانە خەڵووزی دۆزەخن ، يان لەلای خوا بێ بايەخ تـر دەبـن لـەو قالۆنـچەی بە لووتی پيسايی دەتلێنێتەوە ، خوای گەورە لە خۆبايی بـوون و شـانازيكردنی بـە بـاوو با پيرانـەوە لابـردووە لەسـەرتـان ، يـان بڕوادارێكـی لـەخواترس و يـان خرا پـەكارێكی نەگبەت ، خەڵكی هەموويان لە ئادەمن ، ئادەميش لە گڵە.**

(المشكاة ٤٨٩٩)

٦٠٩٨- يا أيها الناس ! إن الله قد أذهب عنكم عبية الجاهلية و تعاظمها بآبائها فالناس رجلان: رجل بر تقي كريم على الله و فاجر شقي هين على الله و الناس بنو آدم و خلق الله آدم من تراب.

( صحيح ) ( ت ) عن ابن عمر.

**٦٠٩٨- هۆ خەڵكينـە ! بەڕاسـتی خـوای گـەورە لـووت بـەرزی و خۆبـەزل زانينـی نـەفامی لەسەرتـان لابردووە ، خەڵكيش دوو جۆر كەسن : پياوێكی چاكەكاری خواناسی بەڕێز لـە لای خوا و ، خرا پەكارێكی نەگبەتی سووك ڕيسوا لە لای خوا ، خەڵكيش نەوەی ئادەمن ، ئادەميش لە خۆڵە.**

(الصحيحة ٢٧٠٠)

٦٠٩٩- كفر بالله تبرؤ من نسب و إن دق.

( صحيح ) ( البزار ) عن أبي بكر رضي الله عنه.

**٦٠٩٩- ئەو بێ باوەڕییە بەخوا هەرکەسێك بە ئەنقەست نەژادی خۆی بداتە پاڵ کەسێك جگە لە باوکی خۆی.**

(الروض ٥٨٧)

٦١٠٠- كفر بامرئ ادعاء نسب لا يعرف أو جحده و إن دق.

( صحيح ) ( هـ ) عن ابن عمرو.

**٦١٠٠- بێ باوەڕییە بۆ کەسێك جاڕی ڕەچەڵەکێك بکات کەلێ نازانێ، یان نکوڵی لێ بکات بە کەیفی خۆی.**

(الروض ٥٨٧)

٦١٠١- ليس من رجل ادعى لغير أبيه و هو يعلمه إلا كفر و من ادعى ما ليس له فليس منا و ليتبوأ مقعده من النار و من دعا رجلا بالكفر أو قال عدو الله و ليس كذلك إلا حار عليه و لا يرمي رجل رجلا بالفسق و لا يرميه بالكفر إلا ارتدت عليه إن لم يكن صاحبه كذلك

( صحيح ) ( حم ق ) عن أبي ذر

**٦١٠١- هەر کەسێك خۆی بە کوڕی کەسێك دابنێت کە خۆیشی بزانێت وا نییە ، ئەو هیچی نیە بێ باوەڕی نەبێت ، هەرکەسیش داوای شتێك بکات کە ماڵی خۆی نەبێت ، ئەوە لە ئێمە نییە و ، با جێگای خۆی لە دۆزەخدا ئامادە بکات ، هەرکەسیش کەسێکی بەبێ باوەڕ بانگ کرد ، یان وتی : ئەی دوژمنی خواش وا نەبوو بەسەر خۆیدا دەشکێتەوە ، هەر پیاوێکیش بە پیاوێکی تر بڵێت خراپەکار یان ، بێباوەڕ بەسەر خۆیدا دەشکێتەوە ئەگەر وانەبێت.**

(الترغيب ١٩٨٥)

٦١٠٢- كل سبب و نسب منقطع يوم القيامة إلا سببي و نسبي

( صحيح ) ( طب ك هق ) عن عمر ( طب ) عن ابن عباس والمسور

**٦١٠٢- هەموو هۆکار و ڕەچەڵەکێك دەپچڕێت لە ڕۆژی قیامەت دا جگە لە هۆکار و ڕەچەڵەکی من نەبێت .**

(الصحيحة٢٣٦)

٦١٠٣- من ادعى إلى غير أبيه أو انتمى إلى غير مواليه فعليه لعنة الله المتتابعة إلى يوم القيامة.

( صحيح ) ( د ) عن أنس

**٦١٠٣- هەركەسێك خۆی بە كوڕی پیاوێك جگە لە باوكی خۆی دابنێت ، یان هەر كۆیلەیەكیش خۆی بداتە پاڵ كەسانێكی تر جگە لە خاوەنەكانی خۆی نەفرەتیەك لە دوای یەكی خوای گەورەی لێ بێت هەتا ڕۆژی قیامەت .**

(غاية المرام ٢٦٥)

٦١٠٤- من ادعى إلى غير أبيه لم يرح رائحة الجنة و إن ريحها ليوجد من مسيرة خمسمائة عام.

( صحيح ) ( هـ ) عن ابن عمرو.

**٦١٠٤- هەركەسێك خۆی بە كوڕی كەسێك لەقەڵەم بدات جگە لە باوكی ، بۆنی بەهەشت ناكات ، هەرچەند بۆنی بەهەشتیش لە دووری پێنج ساڵەوە بۆن دەكرێت .**

(الصحيحة٢٣٠٧)

٦١٠٥- من ادعى إلى غير أبيه و هو يعلم فالجنة عليه حرام.

( صحيح ) ( حم ق د هـ ) عن سعد وأبي بكرة.

**٦١٠٥- هەركەسێك خۆی بە كوڕی پیاوێك جگە لە باوكی خۆی لەقەڵەم بدات بە ئەنقەست ، بەهەشت لەسەری قەدەغە دەكرێت .**

(غاية المرام ٢٦٤)

٦١٠٦- لا ترغبوا عن آبائكم فمن رغب عن أبيه فهو كفر.

( صحيح ) ( ق ) عن أبي هريرة.

**٦١٠٦- پشت مەكەن لە باوكتان ، هەركەسێ نكۆڵی لە باوكی خۆی بكات ئەو بێ باوەڕ دەبێت.**

(المشكاة ٣٣١٥)

٦١٠٧- لا دعوة في الإسلام ذهب أمر الجاهلية الولد للفراش و للعاهر الحجر

( صحيح ) ( حم د ) عن ابن عمرو

**٦١٠٧- ڕەوا نییە لە ئیسلامدا كەس خۆی بە كوڕی پیاوێكی تر لەقەڵەم بدات جگە لە باوكی خۆی ، كاروباری نەفامی بەسەر چوو ، منداڵ بۆ جێگای ژن و مێردایەتی یە ، داوێن پیسیش بەشی بەردەباران كردنە.**

(المشكاة ٣٣٢١)

٦١٠٨- إن أحساب أهل الدنيا: الذين يذهبون إليه هذا المال

( صحيح ) ( حم ن حب ك ) عن بريدة .

**٦١٠٨- ڕەسەنایەتی خەڵکی دونیا کە بۆی دەچن : ئەو پارەیە.**

(الارواء ١٩٢٩)

٦١٠٩- حليف القوم منهم و ابن أخت القوم منهم

( صحيح ) ( طب ) عن عمرو بن عوف .

**٦١٠٩- هاوپەیمانی کەسانێك لە خۆیانە ، خوشکەزای کەسانێکیش لە خۆیانە.**

(المشكاة ٣٠٥١)

٦١١٠- خياركم في الجاهلية خياركم في الإسلام إذا فقهوا

( صحيح ) ( خ ) عن أبي هريرة .

**٦١١٠- ڕەسەنترینتان لە سەردەمی نەفامیدا ، ڕەسەنترینتانە لە سەردەمی ئیسلامدا ، ئەگەر تێگەیشتووبن.**

(المشكاة ٤٨٩٣)

٦١١١- شعبتان لا تتركهما أمتي: النياحة و الطعن في الأنساب.

( صحيح ) ( حل ) عن أبي هريرة.

**٦١١١- دوو بەش هەیە ، ئوممەتەکەم دەستیان لیٚ هەڵناگریٚ : شیوەنکردن لەسەر مردوو و ، ڕەخنەگرتن لە ڕەچەڵەك .**

(الصحيحة١٨٩٦)

٦١١٢- الولد للفراش و للعاهر الحجر.

( صحيح ) ( ق د ن هـ ) عن عائشة ( حم ق ت ن هـ ) عن أبي هريرة ( د ) عن عثمان ( ن )

**٦١١٢- منداڵ بۆ جێگایە[1]، داوێن پیسیش بەشی بەردبارانە[2].**

(الارواء ٢١٠٨)

[1] واتە : جێگای ژن و مێردایەتی ، یان سەرپەرشتیاری ئافرەتی کۆیلە.

[2] واتە : ئەو کەسەی کە بانگەشەی منداڵێك دەکات کە منداڵی خۆیەتی هیچی بۆ ناژمێردرێت ، مادام ئەو منداڵە دایك و باوکی شەرعی خۆی هەیە بە هاوسەرگیری.

## بابەتی زەمکردنی ئێرەیی بردن ( چاو تێبڕین ) و کینە

٦١١٣- لا تباغضوا و لا تدابروا و لا تنافسوا و كونوا عباد الله إخوانا.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة.

**٦١١٣- ڕقەبەرایەتی مەكەن و پشت لە یەكتر هەڵمەكەن و ، كێبڕكێی یەكتر مەكەن و ، بەڵكو هەمووتان ببنە بەندەی خوا و برای یەكتر.**

(غاية المرام ٤٠٠)

٦١١٤- لا تباغضوا و لا تقاطعوا و لا تدابروا و لا تحاسدوا و كونوا عباد الله إخوانا كما أمركم الله و لا يحل لمسلم أن يهجر أخاه فوق ثلاثة أيام.

( صحيح ) ( حم ق د ) عن أنس.

**٦١١٤- ڕقەبەرایەتی یەكتر مەكەن و ، پەیوەندیتان مە پچڕێنن و ، پشت لە یەكتر مەكەن و ، ئێرەیی مەكەن و چاو مەبڕنە ماڵی یەكتر ، ببنە بەندەی خوا و و برا هەر وەكو فەرمانی پێكردون ، ڕوایش نییە بۆ موسوڵمانێك دەنگ دابڕێت لە براكەی لە سێ ڕۆژ زیاتر .**

(صحيح ابي داود ٤٩١٠)

٦١١٥- لا تحاسدوا و لا تناجشوا و لا تباغضوا و لا تدابروا و لا يبع بعضكم على بيع بعض و كونوا عباد الله إخوانا المسلم أخو المسلم و لا يخذله و لا يحقره التقوى هاهنا - و أشار إلى صدره - بحسب امرئ من الشر أن يحقر أخاه المسلم كل المسلم على المسلم حرام دمه و ماله و عرضه.

( صحيح ) ( حم م ) عن أبي هريرة.

**٦١١٥- چاو مەبڕنە ماڵی یەكتر و ، نرخ لەسەر یەكتر بەرز مەكەنەوە ، ڕقەبەرایەتی یەكتر مەكەن و پشت لەیەكتر مەكەن و ، كەستان مامەڵە بەسەر مامەڵەی كەستاندا مەكەن و ، ببنە بەندەی خواو برای یەكتر ، موسوڵمان برای موسوڵمانە ، پشتی بەرنادات و ، بەكەم تەماشای ناكات ، (لە خوا ترسان ) پارێزكاری ئا لێرەدایە (ئاماژەی بۆ سنگی خۆی كرد ) هەركەسێك ئەوەندە خراپەی بەسە كە براكەی بەكەم بزانێ ، موسوڵمان هەموو شتێكی لەسەر موسوڵمان قەدەغەیە خوێنی و ماڵی و ئابڕووی.**

(الارواء ٢٥١٦)

٦١١٦- دب إليكم داء الأمم قبلكم: الحسد و البغضاء هي الحالقة حالقة الدين لا حالقة الشعر و الذي نفس محمد بيده لا تدخلوا الجنة حتى تؤمنوا و لا تؤمنوا حتى تحابوا أفلا أنبئكم بشيء إذا فعلتموه تحاببتم أفشوا السلام بينكم.

( صحيح ) ( حم ت الضياء ) عن الزبير .

**٦١١٦- دەرد و نەخۆشی میللەتانی پێش خۆتانتان بەسەردا داباری:ئێرەیی و ڕق و کینە، داتاشەرە ، تاشەری ئایین نەك قژ ، سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ، ناچنە بەهەشتەوە تاکو باوەڕ نەهێنن ، باوەڕیش ناهێنن تاکو یەکترتان خۆش نەوێت ، ئایا ئاگادارتان بکەم لە شتێك ئەگەر ئەنجامی بدەن یەکترتان خۆش دەوێت ، سڵاو لە نێوان خۆتان دا بڵاو بکەنەوە.**

(صحيح الترمذي ٢٥١٠)

٦١١٧- إنما تفرقكم في الشعاب و الأودية من الشيطان.

( صحيح ) ( حم د ك ) عن أبي ثعلبة الخشني .

**٦١١٧- لە ڕاستیدا پەرتەوازە بوونتان لە شیوو و دۆڵەکاندا لە شەیتانەوەیە.**

(صحيح الترمذي ٢٥١٠)

٦١١٨- ألا إن من قبلكم من أهل الكتاب افترقوا على ثنتين و سبعين ملة و إن هذه الملة ستفترق على ثلاث و سبعين ثنتان و سبعون في النار و واحدة في الجنة و هي الجماعة و إنه سيخرج من أمتي أقوام تجارى بهم تلك الأهواء كما يتجارى الكلب لصاحبه لا يبقى منه عرق و لا مفصل إلا دخله.

( صحيح ) ( د ) عن معاوية .

**٦١١٨- ئەوانەی پێش ئێوە لە خاوەنی پەڕاوەکان پەرتەوازە بوون بە حەفتاو دوو کۆمەڵەوە ، ئەم میللەتەش دەبنە حەفتاو سێ دەستەوە ، حەفتا و دووی لە دۆزەخ و ، یەك دەستەی لە بەهەشتدایە، ئەویش کۆمەڵی موسڵمانان[1] ، ئینجا کەسانێکیش لە ئوممەتی من پەیدا دەبن ، بەدوای ئەو ئارەزوانەدا ڕادەکەن وەکو چۆن سەگێك لەدوی خاوەنەکەی ڕادەکات هیچ ڕەگ و پۆو جومگەیەکی نامێنێ نەچێتە ناویەوە .**

(الصحيحة٢٠٤)

---

[1] **مامۆستامان وتوویەتی : کۆمەڵ مەبەست لەوانەی ڕێگای هەقیان گرتووە ئەگەر چی یەك کەسیش بێت وەکو لە ئیبنو مەسعودەوە جێگیر بووە.**

٦١١٩- الجماعة رحمة و الفرقة عذاب.

( صحيح ) ( عبدالله في زوائد المسند القضاعي ) عن النعمان بن بشير .

**٦١١٩- كۆمەڵی موسڵمانان میهرەبانییە و ، جیاوازیش سزایە.**

(الصحيحة١٦٧)

٦١٢٠- يد الله على الجماعة.

( صحيح ) ( ت ) عن ابن عباس.

**٦١٢٠- دەستی خوا لەگەڵ كۆمەڵدایە.**

(اصلاح المساجد ٨٠)

٦١٢١- سيصيب أمتي داء الأمم: الأشر و البطر و التكاثر و التشاحن في الدنيا و التباغض و التحاسد حتى يكون البغي.

( صحيح ) ( ك ) عن أبي هريرة.

**٦١٢١- لەمەودوا دەردی ئوممەتەكان تووشی ئوممەتی منیش دەبێت : خۆشڕابواردن و ، ( لە خۆبایی بوون ) و ، دونیا ویستی و هەڵپەكردن و ، دەمە قاڵە لەسەر دونیا و ، ڕقەبەرایەتی و ، ئێرەیی بەیەكتر بردن [1] ، تاكو بەو هۆیەو ستەم دروست دەبێت .**

(الصحيحة٦٨٠)

٦١٢٢- المسلم أخو المسلم.

( صحيح ) ( د ) عن سويد بن حنظلة.

**٦١٢٢- موسوڵمان برای موسوڵمانە.**

(الصحيحة٥٠٤)

٦١٢٣- المسلم أخو المسلم لا يخونه و لا يكذبه و لا يخذله كل المسلم على المسلم حرام عرضه و ماله و دمه التقوى هاهنا - و أشار إلى القلب - بحسب امرئ من الشر أن يحقر أخاه المسلم.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة.

**٦١٢٣- موسوڵمان برای موسوڵمانە ، ناپاكی لێ ناكات و درۆی لەگەڵ ناكات و ، پشتی بەرنادات و داماوی ناكات ، هەموو موسوڵمانێك هە لەسەر موسوڵمان قەدەغەیە ،**

---

[1] واتە : چاو برینە یەكتر و ویرەیی و حەسوودی بەیەكتر بردن .

**ئابڕوو ماڵ و خوێنی ، لە خواترسان ئالێرەدایە (ئاماژەی کرد بۆ دڵ) لەوە کەسێك ئەوەندە خراپەی بەسە برای موسوڵمانەکەی بەکەم بزانێت.**

(الارواء ٢٥١٦)

## بابەتی دەنگ دابڕین

٦١٢٤- من هجر أخاه سنة فهو كسفك دمه.

( صحيح ) ( حم خد د ك ) عن حدرد.

**٦١٢٤- هەرکەسێك ساڵێك دەنگ لە براکەی دابڕێ وەکو ئەوەیە خوێنی ڕشتبێت.**

(الصحيحة٩٢٥)

٦١٢٥- هجر المسلم أخاه كسفك دمه.

( صحيح ) ( ابن قانع ) عن أبي حدرد.

**٦١٢٥- دەنگ دابڕینی موسوڵمان لە براکەی وەکو کوشتنیەتی .**

(الصحيحة٩٢٨)

٦١٢٦- لا هجرة بعد ثلاث.

( صحيح ) ( حم م ) عن أبي هريرة.

**٦١٢٦- دەنگ دابڕین لەسێ ڕۆژ بەدواوە ڕەوانییە .**

(الارواء ٢٥٢٩)

٦١٢٧- لا يحل لمؤمن أن يهجر أخاه فوق ثلاثة أيام.

( صحيح ) ( م ) عن ابن عمر.

**٦١٢٧- ڕەوا نییە بۆ هیچ بڕوادارێك دەنگ دابڕێت لە براکەی زیاتر لە سێ ڕۆژ .**

(الارواء ٢٠٨٩)

٦١٢٨- لا يحل لمسلم أن يهجر أخاه فوق ثلاث فمن هجر فوق ثلاث فمات دخل النار.

( صحيح ) ( د ) عن أبي هريرة.

**٦١٢٨- دروست نییە بۆ هیچ موسوڵمانێك لە سێ ڕۆژ زیاتر دەنگ لە براکەی دابڕێت ، هەرکەسیش وا بکات و وا بمرێت دەچێتە دۆزەخەوە .**

(الارواء ٢٠٨٩)

٦١٢٩- لا يحل لمسلم أن يهجر أخاه فوق ثلاث ليال يلتقيان فيصد هذا و يصد هذا و خيرهما الذي يبدأ بالسلام.

( صحيح ) ( حم ق د ت ) عن أبي أيوب.

**٦١٢٩- ڕەوا نییە بۆ هیچ موسوڵمانێك زیاتر لە سێ ڕۆژ دەنگ جلبڕێت لە براكەی ، بەیەكبگەن ئەمیان ڕووی وەرگێڕێت و ، ئەویان ڕووی وەرگێڕێت ، چاكترینیشیان ئەوەیانە دەست پێشخەری بكات لە سەلام كردندا .**

(الارواء ٢٠٨٩)

٦١٣٠- لا يكون لمسلم أن يهجر مسلما فوق ثلاثة فإذا لقيه سلم عليه ثلاث مرات كل ذلك لا يرد عليه فقد باء بإثمه.

( صحيح ) ( د ) عن عائشة.

**٦١٣٠- نابێت موسوڵمانێك دەنگ دابڕێت لە هیچ موسڵمانێك لەسێ ڕۆژ زیاتر ، كە گەیشتن بە یەكتر سێ جار سەلامی لێ بكات ئەگەر هەر وەڵامی نەدایەوە ، بێگومان گوناهەكەی دەكەوێتە ئەستۆی ئەو .**

(الارواء ٢٠٨٩)

٦١٣١- أفضل الصدقة إصلاح ذات البين.

( صحيح ) ( طب هب ) عن ابن عمرو .

**٦١٣١- چاكترین خێر و بەخشندەیی چاكسازی نێوان دوو كەسە.**

(الصحيحة٢٦٣٩)

٦١٣٢- ألا أخبركم بأفضل من درجة الصيام و الصلاة و الصدقة ؟ إصلاح ذات البين فإن فساد ذات البين هي الحالقة.

( صحيح ) ( حم د ت ) عن أبي الدرداء .

**٦١٣٢- ئایا ئاگادارتان بكەم لە پلەیەك لە پلەی ڕۆژو نوێژ و صەدەقە چاكتربێت ؟ ئاشت كردنەوەی خەڵكی ، چونكە تێكچوونی نێوان خەڵكی تاشەری ئایینە.**[1]

(المشكاة ٥٠٣٨)

٦١٣٣- إياكم و سوء ذات البين فإنها الحالقة.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة .

---

[1] **واتە دین لە خاوەنەكەی دادەماڵێ و دایدەتاشێ**

**٦١٣٣- نەكەن نێوانی خۆتـان تێكبدەن ، چونكە ئەوە تـاشەرە[1].**

(المشكاة ٥٠٤١)

## بابەتی ڕەوشت ناشرینی

٦١٣٤- إن الله لا يحب كل فاحش متفحش.

( صحيح ) ( حم ) عن أسامة بن زيد .

**٦١٣٤- خوای گەورە خۆشی لەبەد فەڕو خراپەكار نايە [2].**

(الارواء ٢١٣٣)

٦١٣٥- إن الله تعالى يبغض الفاحش المتفحش.

( صحيح ) ( حم ) عن أسامة بن زيد .

**٦١٣٥- بەڕاستی خوای گەورە ڕقی لە بەدفەڕو خراپەكارە .**

(الارواء ٢١٣٣)

٦١٣٦- إن شر الناس منزلة عند الله يوم القيامة من تركه الناس اتقاء فحشه.

( صحيح ) ( ق د ت ) عن عائشة .

**٦١٣٦- بەڕاستی خـراپترین كـەس لـە ڕۆژی قیامـەت دا ، كەسێكە خـەڵكی لـە ترسـی خراپەو بەدفەڕی وازیانم لێ هێنابێت .**

(الصحيحة١٠٤٩)

٦١٣٧- يا عائشة ! إن من شر الناس من تركه الناس اتقاء فحشه.

( صحيح ) ( ت ) عن عائشة.

**٦١٣٧- ئەی عائیشە!بەڕاسـتی خـراپترین كـەس كەسێكە خـەڵكی لـە ترسـی خراپـەی خۆیانی لێ بپارێزن .**

(الصحيحة١٠٤٩)

---

[1] واتە : لابەری چاكە و پاداشتە و باعیسی سزایە

[2] (القرطبي) دەڵێت: (الفاحش) ئەو كەسەیە بە سروشت ڕاهاتووە لەگەڵ قسەی خراپ كردن لە بارەی ناپینەوە ، یان ئەو كەسەیە قسە گەلێك دەكات بە ناڕەوا ، (المتفحش) یش ئەو كەسەیە ناوەنگرۆ و هۆگری ئەو قسانە بێت و بەكاریان بهێنێ.

٦١٣٨- الأشرة شر.

( صحيح ) ( خد ع ) عن البراء .

**٦١٣٨- لە هەق نەويستی خراپەيە .**

(الصحيحة١٤٩٣)

٦١٣٩- ليس لأحد على أحد فضل إلا بالدين أو عمل صالح حسب الرجل أن يكون فاحشا بذيا بخيلا جبانا.

( صحيح ) ( هب ) عن عقبة بن عامر.

**٦١٣٩- كەس لە كەس چاكتر نييە مەگەر بە دينداری و كردەوەی چاك نەبێت لەوە خراپتر نييە پياوێك بەدفەڕو ڕو زمان شڕ و دەم پيس و چرووك و ترسنۆك بێت.**

(الصحيحة١٠٣٨)

٦١٤٠- مه يا عائشة ! فإن الله لا يحب الفحش و لا التفحش.

( صحيح ) ( م ) عن عائشة.

**٦١٤٠- ئامان ئەی عائيشە! چونكە بەڕاستی خوای گەورە بەدفەڕو زمانشڕو خراپەكاری خۆش ناوێ .**

(الصحيحة٢٧٢١)

٦١٤١- مهلا يا عائشة ! عليك بالرفق و إياك و العنف و الفحش.

( صحيح ) ( خ ) عن عائشة.

**٦١٤١- لەسەرخۆبە ئەی عائيشە ! پێويستە لەسەرت نەرم و نيان بيت ، خۆت بە دوور بگرە لە توندوتيژی و قسەی ناشرين.**

(المشكاة ٤٦٣٨)

٦١٤٢- المؤمن غر كريم و الفاجر خب لئيم.

( صحيح ) ( د ت ك ) عن أبي هريرة.

**٦١٤٢- ئيماندار سادە و بەخشندەيە [1]، خراپەكاريش ( چاو قايم ) چاو قايم و خوێڕيە . [2]**

(الصحيحة٩٣٢)

---

[1] شارەزای خراپە نييە و لە تەڵەكە بازی نازانێت بۆيە زوو دەخەڵەتێ لەبەر دڵپاكی خۆی

[2] خب : چاوقايم ـ فێڵباز ، ( لئيم ) واتە خوێڕی ـ نا ڕەسەن ـ ناپەسەند .

٦١٤٣- يا عائشة ! إن الله لا يحب الفاحش المتفحش.

( صحيح ) ( د ) عن عائشة.

**٦١٤٣- ئەی عائیشە! بەڕاستی خوای گەورە کەسی بەدفەڕو خراپەکاری خۆش ناوێت .**

(الارواء ٢١٣٣)

٦١٤٤- يا عائشة إن شرار الناس الذين يكرمون اتقاء شرهم.

( صحيح ) ( د ) عن عائشة.

**٦١٤٤- ئەی عائیشە خراپترینی خەڵکی ئەوانەن ڕێزیان لێ دەگیردرێت لە ترسی خراپەیان.**

(الصحيحة١٠٤٩)

٦١٤٥- يا عائشة ! متى عهدتني فحاشا ؟ إن شر الناس عند الله منزلة يوم القيامة من تركه الناس اتقاء شره.

( صحيح ) ( حم ق ) عن عائشة.

**٦١٤٥- ئەی عائیشە! کەی منت بینیوە قسەی ناشرین بکەم؟ خراپترین کەس لە لای خوا لە ڕۆژی قیامەتدا، کەسێکە خەڵکی لەبەر خراپەکاری وازی لێ بهێنن.**

(الصحيحة١٠٤٩)

٦١٤٦- شر ما في رجل شح هالع و جبن خالع.

( صحيح ) ( تخ د ) عن أبي هريرة.

**٦١٤٦- خراپترین ڕەوشت لە پیاودا هەبێت و چاوچنۆکی و ترسنۆکیە .**

(الصحيحة٥٦٠)

## بابەتی غەیبەت و دوو زمانی

٦١٤٧- اثنتان تدخلان الجنة: من حفظ ما بين لحييه و رجليه دخل الجنة

( صحيح ) ( الخرائطي في مكارم الأخلاق ) عن عائشة .

**٦١٤٧- دووان بەهەشت : کەسێك نێوان هەردوو لای ڕیشی (( زمان )) نێوان هەردوو قاچی بپارێزێت لە خراپەیە دەچێتە بەهەشتەوە.** [1]

(الصحيحة٥١٠)

---

[1] واتە : زمانی و داوێنی بپارێزێت .

٦١٤٨- أتدرون ما الغيبة ؟ ذكرك أخاك بما يكره إن كان فيه ما تقول فقد اغتبته و إن لم يكن فيه فقد بهته.

( صحيح ) ( حم م د ت ) عن أبي هريرة .

**٦١٤٨- ئايا دەزانن غەیبەت چییە؟ باسکردنی بۆ براکەتە بەوەی کە پێی ناخۆشە ، ئەگەر ئەو شتەی تیایە کە تۆ باسی دەکەیت غەیبەتت کردووە ، ئەگەر تیاشیدا نەبێت بوختانت بۆ کردووە.**

(الصحيحة١٤١٩)

٦١٤٩- أتدرون ما العضه ؟ نقل الحديث من بعض الناس إلى بعض ليفسدوا بينهم

( صحيح ) ( خد هق ) عن أنس .

**٦١٤٩- ئايا دەزانن دڕك خۆری[1] چییە؟ گواستنەوەی قسە لە نێوان خەڵکی دا بۆ ئەوەی نێوانیان تێکچێت.**

(الصحيحة٨٤٥)

٦١٥٠- احفظ لسانك.

( صحيح ) ( ابن عساكر ) عن مالك بن يخامر .

**٦١٥٠- زمانت بپارێزە.**

(الصحيحة١١٢٢)

٦١٥١- احفظ لسانك ثكلتك أمك معاذ ! و هل يكب الناس على وجوههم إلا ألسنتهم ؟

( صحيح ) ( الخرائطي في مكارم الأخلاق ) عن الحسن مرسلا .

**٦١٥١- زمانت بپارێزە ئەی موعاز دایکت شینت بۆ بکات! ئایا خەڵکی هەر بە هۆی زمانیانەوە نییە لەسەر ڕوخساریان دەخرێنە دۆزەخەوە.**

(الصحيحة١١٢٢)

٦١٥٢- املك عليك لسانك.

( صحيح ) ( ابن نافع طب ) عن الحارث بن هشام .

**٦١٥٢- زمانی خۆت بگرە.**

(الصحيحة٨٨٨)

---

[1] **العضة : واتە : وشتر خۆرە ـ گیای دڕکاوی ـ یان ماری ژەهراوی . قاموسی رستە ، ج٣ ، ل ١٧٢٣ ـ ١٧٢٤ .**

٦١٥٣- املك عليك لسانك و ليسعك بيتك و ابك على خطيئتك.

( صحيح ) ( ت ) عن عقبة بن عامر .

**٦١٥٣- زمانی خۆت بگره و ، با لەماڵی خۆت دا بحەجمێ و ، بۆ تاوانەكان بگری.**

(الصحيحة ٨٩٠)

٦١٥٤- إن الرجل ليتكلم بالكلمة لا يرى بها بأسا يهوي بها سبعين خريفا في النار.

( صحيح ) ( ت هـ ك ) عن أبي هريرة .

**٦١٥٤- بەڕاستی كەسی وا هەیە قسەیەك دەكات و بە خراپی نازانێت ، بە هۆی ئەو قسەوە حەفتا پاییز[1] دەخرێتە دۆزەخەوە.**

(الصحيحة ٥٤٠)

٦١٥٥- إن الرجل ليتكلم بالكلمة من رضوان الله تعالى ما يظن أن تبلغ ما بلغت فيكتب الله له بها رضوانه إلى يوم القيامة و إن الرجل ليتكلم بالكلمة من سخط الله تعالى ما يظن أن تبلغ ما بلغت فيكتب الله عليه بها سخطه إلى يوم القيامة.

( صحيح ) ( مالك حم ت ن هـ حب ك ) عن بلال بن الحارث .

**٦١٥٥- بەڕاستی كەسی وا هەیە قسەیەك دەكات لە ڕەزامەندی خوای گەورەدا ، نازانێت تا كوێ بڕ دەكات، خوای گەورە تا ڕۆژی قیامەت ڕەزامەندی خۆی بۆ دەنووسێت ، كەسی وایش هەیە قسەیەك دەكات لە بێ فەرمانی خوای گەورەدا ، گومان نابات بگاتە ئەو جێگای كە پێی گەیشت ، خوای گەورە توڕە بوونی خۆی بۆ دەنووسێ تا ڕۆژی قیامەت.**

(الصحيحة٨٨٨)

٦١٥٦- إن العبد ليتكلم بالكلمة ما يتبين فيها يزل بها في النار أبعد ما بين المشرق و المغرب.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أبي هريرة .

**٦١٥٦- بەڕاستی بەندە هەیە قسەی وا دەكات بە بێ لێكدانەوە ، بە هۆیەوە دەخلیسكێتە نێو دۆزەخ و زیاتر لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا پیادا ڕۆدەچێت .**

(الصحيحة٥٣٩)

٦١٥٧- إن من أربى الربا الاستطالة في عرض المسلم بغير حق.

( صحيح ) ( حم د ) عن سعيد بن زيد .

---

[1] **واته : حەفتا ساڵ .**

**٦١٥٧- بەڕاستی خراپترین سوو ، قسە پێ وتن و بەکەم سەیرکردن و باسکردنی ناموسی موسڵمانە بە ناهەق .**

(المشكاة ٥٠٤٥)

٦١٥٨- إياك و كل أمر يعتذر منه.

( صحيح ) ( الضياء ) عن أنس .

**٦١٥٨- خۆت بەدوور بگرە لە هەموو کارێك پێویستی بە داوای لێبوردن هەبێت.**

(الصحيحة٣٥٣)

٦١٥٩- ذلك بحق و المشاءون بالنميمة و المفرقون بين الأحبة و الباغون البرآء الدحضة أولئك يقذرهم الرحمن عز و جل.

( صحيح ) ( أبو الشيخ في التوبيخ ابن عساكر ) عن الوضين بن عطاء مرسلا.

**٦١٥٩- پیاو چاکانی ئوممەتم ئەوانەن بەبینینیان یادی خوا دەکرێتەوە ، خراپەکانی ئوممەتیشم ئەوانەن : دوو زمانی دەکەن و ، جیاوازی دەخەنە نێوان خۆشەویستان ، کە بەرین لە خراپەکاری .**

(المشكاة ٤٨٧٢)

٦١٦٠- خياركم الذين إذا رءوا ذكر الله بهم و شراركم المشاءون بالنميمة المفرقون بين الأحبة الباغون البرآء العنت.

( صحيح ) ( هب ) عن ابن عمر.

**٦١٦٠-چاکترینتان ئەوانەن کە دەبینرێت یادی خوا بیر بکەوێتەوە و خراپترینیشتان دوزمانەکانن (( ئەوانەی قسەدێنن و دەبەن )) نێوان دۆست و خۆشەویستان تێك دەدەن ، ئەوانە ستەمکار و خراپەکارو بێ باوەڕو دەست درێژیکارن .**

٦١٦١- زنا اللسان الكلام.

( صحيح ) ( أبو الشيخ ) عن أبي هريرة.

**٦١٦١- زینای زمان قسە کردنە[1] .**

(الارواء ٢٤٢٨)

[1] مەناوی دەڵێت : چونکە چێژ لە قسەکردن وەردەگرێت ، چۆن داوێن پیسی چێژی ناڕەوای تیایە .

٦١٦٢- شرار أمتي الذين غذوا بالنعيم الذين يأكلون ألوان الطعام و يلبسون ألوان الثياب و يتشدقون في الكلام.

( صحيح ) ( ابن أبي الدنيا في ذم الغيبة هب ) عن فاطمة الزهراء.

**٦١٦٢- خراپترینی ئومەتم ئەوانەن بە خۆشگوزەرانی گۆشکراون و ، هەموو جۆرمكانی خواردن دەخۆن و هەموو جۆرمكانی پۆشاكی رەنگاو رەنگ دەپۆشن و ،فیشاڵ و قسەی زل ئەكەن.**

(الصحيحة١٨٩١)

٦١٦٣- طوبى لمن ملك لسانه و وسعه بيته و بكى على خطيئته.

( صحيح ) ( طص حل ) عن ثوبان.

**٦١٦٣- خۆش بەختی [1] بۆ كەسێك زمانی خۆی بگرێت و ، لە ماڵی خۆیدا جێگای ببێتەوە و ، بۆ تاوانەكانی خۆی بگری .**

(الروض ١٨٠)

٦١٦٤- الغيبة أن تذكر الرجل بما فيه من خلفه.

( صحيح ) ( الخرائطي في مساوئ الأخلاق ) عن المطلب بن عبدالله بن حنطب.

**٦١٦٤- غەیبەت ئەوەیە ، باسی شتێكی كەسێك بكەیت كە تێیدایە لە پاشملە .**

(الصحيحة٩٩٢)

٦١٦٥- الغيبة ذكرك أخاك بما يكره.

( صحيح ) ( د ) عن أبي هريرة.

**٦١٦٥- غەیبەت باسكردنی بۆ براكەتە بەوەی كە پێی ناخۆشە [2].**

(غاية المرام ٤٢١)

٦١٦٦- لكل ابن آدم حظه من الزنا فزنا العين النظر و زنا اللسان المنطق و الأذنان زناهما الاستماع و اليدان يزنيان فزناهما البطش و الرجلان يزنيان فزناهما المشي و الفم يزني و زناه القبل.

( صحيح ) ( د ) عن أبي هريرة.

---

[1] طوبي : چەند واتایەكی هەیە لەوانەش : بەهەشت ـ بەختیاری و كامەرانی ـ درەختێكە لە بەهەشتدا ئەگەر سوارێكی تیژڕەو سەد ساڵ بەكوڵەغار بەژێر سێبەرمكەیدا برِوات تەواو نابێت ـ خۆش بەختی .

[2] غەزالی دەڵێت: خۆت بە دوور بگرە لە غەیبەتی قورئان خوێنی ریا باز، كە دەڵێیت : فلانە كەس خوا چاكی بكات ، پێم ناخۆش بوو ئەوەی بەسەریدا هات خوا ئێمە و ئەویش چاك بكات ، چونكە لە راستیدا ئەمە دووشت لەخۆ دەگرێت غەیبەتیشە و خۆپەرستیشە ، چونكە ئەگەر مەبەست پاڕانەوەیە بۆ ئەو كەسە پێویستە بە نهێنی بۆی بپاڕێیتەوە لەخوا.

**٦١٦٦- هەموو ئادەميزادێك پشكى هەيە لە زينادا، جا زيناى چاو تەماشاكردنى حەرامە و زيناى زمان قسە كردنە ، وە زيناى هەردوو گوێ گوێ گرتنە و ، دەستەكانيش زينا دەكەن زيناكەشيان هەوڵدانە بۆى زيناى قاچ ڕۆيشتنە بۆى و دەميش زينا دەكات زيناكەشى ماچ كردنە.**

(الارواء ٢٤٢٨)

٦١٦٧- أكثر خطايا ابن آدم في لسانه.

( صحيح ) ( طب هب ) عن ابن مسعود .

**٦١٦٧- زۆربەى تاوانەكانى ئادەميزاد لە زمانيدايە.**

(الصحيحة٥٣٣)

٦١٦٨- ألا أنبئكم ما العضه ؟ هي النميمة القالة بين الناس.

( صحيح ) ( م ) عن ابن مسعود .

**٦١٦٨- ئايا پێتان بڵێم گيا دڕكە[1] چييە ؟ دوو زمانى يە لە نێوان خەڵكيدا.**

(الصحيحة٨٤٤)

٦١٦٩- لما عرج بي ربي عز و جل مررت بقوم لهم أظفار من نحاس يخمشون وجههم و صدورهم فقلت: من هؤلاء يا جبريل ؟ قال: هؤلاء الذين يأكلون لحوم الناس و يقعون في أعراضهم.

( صحيح ) ( حم د ) عن أنس .

**٦١٦٩- كاتێك خواى گەورە بەرزيكردمەوە[2] ، بە لاى كەسانێكدا تێپەڕيم نينۆكيان لەمس بوو ڕووخسار و سينگى خۆيان پێ دەڕنى وتم : ئەوانە كێن ئەى جيبريل؟ فەرمووى: ئەوانەن كە گۆشتى خەڵكيان دەخوارد و قسەيان بە ناموسى خەڵكى دەووت .**

(الصحيحة٥٣٠)

٦١٧٠- ما أحب أني حكيت إنسانا و أن لي كذا و كذا.

( صحيح ) ( د ت ) عن عائشة.

**٦١٧٠- حەز ناكەم لاسايى فلان كەس بكەمەوە و[3] ئەوەندە و ، ئەوەندەم هەبێت لەماڵى دونيا.**

(المشكاة ٤٨٥٧)

---

[1] وشتر خۆرە . گيا دڕكە ـ گياى بيابان .

[2] بۆ شەو ڕەوى و بەرز بونەوە .. الاسراء و المعراج .

[3] يان وەكو فلان كەس وابم .

٦١٧١- ما أظن فلانا و فلانا يعرفان من ديننا شيئا.

( صحيح ) ( خ ) عن عائشة.

**٦١٧١- گومان نابەم فلان و فلان هيچ شتێك لە ئايينى ئێمە بزانن.**

(الصحيحة٣٠٧٧)

٦١٧٢- من ذكر رجلا بما فيه فقد اغتابه.

( صحيح ) ( الحاكم في تاريخه ) عن أبي هريرة.

**٦١٧٢- هەركەسێك باسى پياوێك بكات بەشتێك كە تيايدا بێت ئەوە غەييەتى كردووە.**

(الصحيحة١٤١٩)

٦١٧٣- لقد قلت كلمة لو مزجت بماء البحر لمزجته.

( صحيح ) ( د ت ) عن عائشة.

**٦١٧٣- بەڕاستى قسەيەكت كرد ئەگەر تێكەڵ ئاوى دەريا بكرێت ئاوێتەى دەبێت .**

(المشكاة ٤٨٥٣)

٦١٧٤- لا يعضه بعضكم بعضا.

( صحيح ) ( الطيالسي ) عن عبادة.

**٦١٧٤- بوختان بۆ يەكتر مەكەن.** [1]

(الصحيحة٢٤٤٣)

٦١٧٥- لا يدخل الجنة قتات.

( صحيح ) ( حم ق ٣ ) عن حذيفة.

**٦١٧٥- دوو زمان ناچێتە بەهەشتەوە.**

(الصحيحة١٠٣٤)

٦١٧٦- إذا أصبح ابن آدم فإن الأعضاء كلها تكفر اللسان فتقول: اتق الله فينا فإنما نحن بك فإن استقمت استقمنا و إن اعوججت اعوججنا ).

( صحيح ) (ت ابن خزيمة هب) عن أبي سعيد .

**٦١٧٦- هەر كە ئادەميزاد ڕۆژى لێ دەبێتەوە ، هەموو ئەندامەكانى گلەيى و بناشتى بە زمانى دەڵێن : لە خوا بترسە دەربارەى ئێمە بەڕاستى ئێمە بە تۆوە بەستراوين ، ئەگەر**

---

[1] (( لا يعضهُ )) چقڵ و دڕك و داڵ لەيەك هەڵمەچەقێنن .

**ڕاست و دامەزراو بێت ئێمەیش ڕاست دامەزراو دەبین دەبینەوە ، ئەگەریش چەوت و لاریش بێت ئێمەیش چەوت و لار دەبین .**

(المشكاة ٤٨٣٨)

٦١٧٧- قولوا خيرا تغنموا و اسكتوا عن شر تسلموا.

( صحيح ) ( القضاعي ) عن عبادة بن الصامت.

**٦١٧٧- قسەی باش بکەن قازانج دەکەن ، بێ دەنگیش بن سەلامەت دەبن .**

(الصحيحة٤١٢)

٦١٧٨- كل المسلم على المسلم حرام ماله و عرضه و دمه حسب امرئ من الشر أن يحقر أخاه المسلم.

( صحيح ) ( د هـ ) عن أبي هريرة.

**٦١٧٨- هەموو موسوڵمانێك لەسەر موسوڵمانێکی تر قەدەغەیە ، ماڵی و ئابڕووی و خوێنی ، بەسە بۆ خراپی کەسێك کە براکەی بەکەم بزانێت.**

(الصحيح أبي داود ٤٨٨٢)

٦١٧٩- لعله يخفف عنهما ما لم ييبسا.

( صحيح ) ( ق ) عن ابن عباس .

**٦١٧٩- بەڵکو سزایان لەسەر سووککەن ، هەتاکو ئەو کاتەی ووشك دەبن .**

(الارواء ٢٨٣)

٦١٨٠- ليس شيء من الجسد إلا و هو يشكو ذرب اللسان.

( صحيح ) ( ع هب ) عن أبي بكر.

**٦١٨٠- هیچ شوێنێکی لاشە نیە سکالاَ لە زمان نەکات .**

(الصحيحة٥٣٤)

٦١٨١- من وقاه الله شر ما بين لحييه و شر ما بين رجليه دخل الجنة.

( صحيح ) ( ت حب ك ) عن أبي هريرة.

**٦١٨١- هەرکەسێك خوای گەورە بیپارێزێت لە خراپەی نێوان هەردولای ڕیشی و خراپەی نێوان هەردوو قاچی دەچێتە بەهەشتەوە .**

(الصحيحة٥٠٩)

٦١٨٢- من يتوكل لي ما بين لحييه و ما بين رجليه أتوكل له بالجنة.

( صحيح ) ( حم ت حب ك ) عن سهل بن سعد.

**٦١٨٢- هەركەسێك پاراستنی زمـان و دامێنـی خـۆیم بـۆ مـسۆگەر بكـات ، بەهەشـتی بـۆ مسۆگەر دەكەم .**

(الصحيحة٢٦٩٢)

٦١٨٣- من يضمن لي ما بين لحييه و ما بين رجليه أضمن له الجنة.

( صحيح ) ( خ ) عن سهل بن معاذ.

**٦١٨٣- هەركەس زمان پاراستنی نێـوان دوو لای ڕیـشی و نێـوان دوو قـاچیم بـۆ مـسۆگەر بكات ، بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەكەم .**

(الضعيفة ٢٣٠٢)

٦١٨٤- يا معشر من آمن بلسانه و لم يدخل الإيمان قلبه ! لا تغتابوا المسلمين و لا تتبعوا عوراتهم فإنه من تتبع عورة أخيه المسلم تتبع الله عورته و من تتبع الله عورته يفضحه و لو في جوف بيته.

( صحيح ) ( حم د ) عن أبي برزة الأسلمي ( ٤ ) عن البراء.

**٦١٨٤- ئەی ئەو كەسانەی بە زمانیان بڕوایان هێنـاوە و ، ئیمـان نەچـووەتە دڵیانـەوە! غەیبەتی موسڵمانان مەكەن وە بە دوای كەم و كوڕیانـدا مەگەڕێن ، چونكە هەركەسێك بە دوای كەم و كورتی برا موسڵمانەكەیدا بگەڕێت خوای گەورە كەم و كورتییەكانی دەخاتـە ڕوو ، هەركێیش خوای گەورە بە دوای كەم و كورتیەكانیەوە بێت ئـابڕووی دەبـات ئەگەر لە كونجیماڵەكەی خۆشیدا بێت .**

(المشكاة ٥٠٤٤)

٦١٨٥- يا معشر من أسلم بلسانه و لم يدخل الإيمان في قلبه ! لا تؤذوا المسلمين و لا تعيروهم و لا تتبعوا عوراتهم فإنه من تتبع عورة أخيه المسلم يتتبع الله عورته و من تتبع الله عورته يفضحه و لو في جوف رحله.

( صحيح ) ( ت ) عن ابن عمر.

**٦١٨٥-ئەی ئەو كەسانەی بە زمان بـاوەڕیان هێنـاوە و بـاوەڕ نەچـووەتە نێـو دڵیانـەوە ! ئـازاری موسـڵمانان مـەدەن و عـەیب و عاریـان لێ مـەگرن و ، بـە دوای كـەم و كوڕیانـدا مەگەڕێن ، چـونكە هەركەسـێك وا بكـات خـوای گـەورە بـەد وای كـەم و كوڕیـدا دەچـێت و ئـابڕووی دەبـات ئەگەر لە كونجی ماڵی خۆشیدا بێت .**

(المشكاة ٥٠٤٤)

٦١٨٦- يبصر أحدكم القذى في عين أخيه و ينسى الجذع في عينه.

( صحيح ) ( حل ) عن أبي هريرة.

**٦١٨٦- کەسێکتان پووشکەیەك لە چاوی براکەتاندا دەبینێت و، چڵە دارێك لە چاوی خۆیدا نابینێ.** [1]

(الضعيفة ٣٣)

## بابەتی کەم قسەکردن

٦١٨٧- من حسن إسلام المرء تركه ما لا يعنيه.

( صحيح ) ( ت هـ ) عن أبي هريرة ( حم طب ) عن الحسين بن علي ( الحاكم في الكنى ) عن أبي بكر الشيرازي وعن أبي ذر ( الحاكم في تاريخه ) عن علي بن أبي طالب ( طص ) عن زيد ابن ثابت ( ابن عساكر ) عن الحارث بن هشام.

**٦١٨٧- جوانی مسوڵمانێتی کەسێك لەوەدایە واز لەو شتە بهێنێت کە پەیوەندی بەوەوە نییە.**

(الروض ٢٩٣)

٦١٨٨- رحم الله امرءا تكلم فغنم أو سكت فسلم.

( صحيح ) ( هب ) عن أنس والحسن مرسلا.

**٦١٨٨- ڕەحمەت لە کەسێك قسە بکات و دەسکەوتی هەبێت ، یان بێ دەنگ بێت و بێ وەی بێت.**

(الصحيحة٨٥٥)

٦١٨٩- رحم الله عبدا سمحا إذا باع سمحا إذا اشترى سمحا إذا قضى سمحا إذا اقتضى.

( صحيح ) ( خ هـ ) عن جابر.

**٦١٨٩- سۆز و بەزەیی خوا لەسەر کەسێك بێت کە شتی کڕی گونجاو بێت و کە شتی فرۆشت گونجاو بێت کاتێك دادوەری کرد یان داوای تۆمارکرد گونجاو بێت .**

(الصحيحة٨٥٥)

٦١٩٠- رحم الله عبدا قال خيرا فغنم أو سكت عن سوء فسلم.

( صحيح ) ( ابن المبارك ) عن خالد بن أبي عمران مرسلا.

---

[1] مەناوی دەڵێت : ئەمە نموونەیە، بۆیە گەورەترین تاوان و خراپترین ئابڕووچوونە ، سۆز و بەزەیی خوایش بۆ کەسێکە دڵ و زمانی بپارێزێت و براکەی تۆمەتبار نەکات و لەوە گەڕێت کە پەیوەندی بە خۆیەوە نیە.

**٦١٩٠- میهرەبانی خوا لە کەسێك بێت قسەی چاك بكات و قازانج بكات ، یان بێ دەنگ ببێت و سەلامەت بێت.**

(الصحيحة٨٥٥)

٦١٩١- من حفظ ما بين فقميه و رجليه دخل الجنة.

( صحيح ) ( حم ك ) عن أبي موسى.

**٦١٩١- هەرکەسێك نێوان دوو شەویلگەو نێوان دوو قاچی بپارێزێت دەچێتە بەهەشتەوە .**

(الترغيب ٢٤١٤)

٦١٩٢- من صمت نجا.

( صحيح ) ( حم ت ) عن ابن عمرو.

**٦١٩٢- هەرکەسێك بێ دەنگ بێت ڕزگاری دەبێت.**

(الصحيحة٥٣٥)

## بابەتی لێچوون و لاسایکردنەوە

٦١٩٣- أخرجوا المخنثين من بيوتكم.

( صحيح ) ( حم خ ) عن ابن عباس ( خ د هـ ) عن أم سلمة .

**٦١٩٣- نامەردەکان لە ماڵەکانتان دەرکەنە دەرەوە .**

(المشكاة ٤٤٢٨)

٦١٩٤- سبحان الله ! هذا كما قال قوم موسى: ( اجعل لنا إلها كما لهم آلهة و الذي نفسي بيده لتركبن سنن من كان قبلكم ).

( صحيح ) ( ت ) عن أبي واقد.

**٦١٩٤- پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە ! ئەمە وەکو ئەوەیە کە گەلی مووسا وتیان (( أجعل لنا الها كى لهم الهه )) پەرستراوێکیان بۆ دابنێ وەکو ئەوان پەرستراویان هەیە ( الاعراف : ١٣٨ ) سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ڕێگای ئەوانەی پێش خۆتان دەگرنە بەر.**

(المشكاة ٥٤٠٨)

٦١٩٤- لتركبن سنن الذين من كان قبلكم شبرا بشبر و ذراعا بذراع حتى لو ان احدكم دخل لدخلتم ، وحتى جحر ضب لو أن أحدهم جامع امرأته بالطريق لفعلتموه .

( صحيح ) ( حم ق هـ ) عن أبي سعيد ( ك ) عن أبي هريرة.

**٦١٩٥- ڕێگای ئەوانەی پێش خۆتان دەگرنە بەر بیست بە بیست و گەز بە گەز ، تەنانەت ئەگەر بچنە کونی بزنمژەیەکەوە ئێوەش بەدوایدا ملی ڕێ دەگرن ، تەنانەت ئەگەر کەسێکتان لەسەر ڕێگادا جووت بێت لەگەڵ خێزانەکەی ئێوەیش وا دەکەن.**[1]

(الصحيحة١٣٤٨)

٦١٩٦- لعن الله الرجل يلبس لبسة المرأة و المرأة تلبس لبسة الرجل.

( صحيح ) ( د ك ) عن أبي هريرة.

**٦١٩٦- نەفرینی خوا لە پیاوێك پۆشاكی ئافرەت بپۆشێ وە لە ئافرەتێكیش پۆشاكی پیاو بپۆشێت .**

(حجاب المرأة ٦٦)

٦١٩٧- لعن الله الرجلة من النساء.

( صحيح ) ( د ) عن عائشة.

**٦١٩٧- نەفرینی خوا لەو ئافرەتانەی لاسایی پیاوان دەكاتەوە.**

(الحجاب ٦٧)

٦١٩٨- لعن الله المتشبهات من النساء بالرجال و المتشبهين من الرجال بالنساء.

( صحيح ) ( حم د ت هـ ) عن ابن عباس.

**٦١٩٨- نەفرینی خوا لەو ئافرەتانەی لاسایی پیاوان دەكەنەوە و خۆیان بە پیاوان دەچوێنن لەو پیاوانەش لاسایی ئافرەتان دەكەنەوە خۆیان بە ئافرەتان دەچوێنن .**

(حجاب المرأة ٦٧)

٦١٩٩- لعن الله المخنثين من الرجال و المترجلات من النساء.

( صحيح ) ( خد ت ) عن ابن عباس

---

[1] **مەناوی دەڵێت: زۆرێك لە ئوممەتەكەی ڕێبازی فارسەكانیان گرت لە جل و بەرگ و سواری و دروشمەكانی شەڕ ، هەروەها چوونە سەر ڕێبازی جوولەكە و گاور لە ڕازاندنەوەی مزگەوت و خراپ ڕاگرتنی گۆڕ و وەرگرتنی بەرتیل جێ بەجێ كردنی سزا شەرعییەكان لەسەر لاوازەكان و واز هێنان لە بەهێزەكان و ، سڵاو كردن بە پەنجە و سەردان نەكردنی نەخۆش و ....**

**٦١٩٩- نەفرینی خوا لە پیاوە ژنانییەکان و ، لە ئافرەتە کوڕانیەکان .**[1]

(المشكاة ٤٤٢٨)

٦٢٠٠- ليس منا من تشبه بالرجال من النساء و لا من تشبه بالنساء من الرجال.

( صحيح ) ( حم ) عن ابن عمرو.

**٦٢٠٠- لە ئێمە نییە هەر ئافرەتێك لاسایی پیاوان بكاتەوە و ، هەر پیاوێكیش لاسایی ئافرەتان بكاتەوە.**

(حجاب المرأة ٩٦)

٦٢٠١- من تشبه بقوم فهو منهم.

( صحيح ) ( د ) عن ابن عمر ( طس ) عن حذيفة.

**٦٢٠١- هەركەسێك لاسایی كەسانێك بكاتەوە لە ئەوانە.**

(الصحيحة ٣٩١)

٦٢٠٢- لا يختلجن في صدرك شيء ضارعت فيه النصرانية.

( صحيح ) ( حم د ت ) عن هلب.

**٦٢٠٢- با شتێك لە دڵتدا دروست نەبێت كە پێی لە گاورەكان بچێت.**

(حجاب المراة ٩٢)

٦٢٠٣- لتتبعن سنن الذين من قبلكم شبرا بشبر أو ذراعا بذراع حتى لو سلكوا جحر ضب لسلكتموه قالوا: اليهود و النصارى ؟ قال: فمن ؟.

( صحيح ) ( حم ق هـ ) عن أبي سعيد ( ك ) عن أبي هريرة.

**٦٢٠٣- ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان دەگرنەبەر بست بە بست و ، گەز بەگەز ، تەنانەت ئەگەر بچنە كونی بزن مژەیەكەوە بە دوایاندا دەڕۆن وتیان: جولەكە و گاور ؟ فەرمووی: ئەگەر ئەی كێ؟**

(اصلاح المساجد ٣١)

٦٢٠٤- لا تترك هذه الأمة شيئا من سنن الأولين حتى تأتيه.

( صحيح ) ( طس ) عن المستورد.

**٦٢٠٤- ئەم ئومەتە واز ناهێنن لە هیچ ڕێبازێكی ئەوانەی پێش خۆیان تاكو نەیگرنەبەر.**

(السنة ٧٢)

---

[1] **ئافرەت كە خۆی بچوێنێ بە پیاو پێی دەوترێ ((كوڕانی ))**

## بـابەتى پياوى بىٚ ناموس (( گەوادى ))

٦٢٠٥- ثلاثة لا يدخلون الجنة: العاق لوالديه و الديوث و رجلة النساء.

( صحيح ) ( ك هب ) عن ابن عمر .

**٦٢٠٥- سـىٚ كـەس نـاچـنە بەهەشـتەوە : خرا پـەكار لەگـەلٚ دايـك و بـاوك و ، گـەواد و نامەرد ، هەروەها ئەو ئافرەتـى خۆى وەكو پياو لىٚ دەكات كوڕانى .**

(حجاب المرأة المسلمة ٩٧)

## بـابەتى غيرەت و بەنـاموسى

٦٢٠٦- من الغيرة ما يحب الله و منها ما يكره الله فأما ما يحب فـالغيرة في الريبـة و أمـا مـا يكره فالغيرة في غير ريبة.

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي هريرة.

**٦٢٠٦- هەندىٚ لە پەرۆشى (( دلٚپيسى )) خوا پێى خۆشـە و ، هەندێكيـشى پـىٚ ناخۆشـە ، ئـەوەى پێى خۆشە دلٚ پيسيەكى گومان ئاميٚز بێت ، ئەوەشى پىٚ ناخۆشە دلٚپيسيەكەى بەبىٚ گومان بێت .**

(الارواء ٢٠٥٩)

٦٢٠٧- لا أحد أغير من الله و لذلك حرم الفواحش ما ظهر منهـا و مـا بطـن و لا أحـد أحـب إليه المدح من الله و لذلك مدح نفسه و لا أحد أحـب إليـه العـذر مـن الله مـن أجـل ذلـك أنـزل الكتاب و أرسل الرسل.

( صحيح ) ( حم ق ت ) عن ابن مسعود.

**٦٢٠٧- كەس لە خوا بـە غـيرەت تـر نييـە ، بۆيـە هەرچـى خرا پـەكارى هەيـە – ديـار و نـاديار – هەمووى قەدەغەى كردووە، كەس نييە ئەوەنـدەى خواى گەورە پياهەلٚوتنى پـىٚ خۆش بێت ، بۆيـە ستاسـشى خـۆى كـردووە ، كەسـيش ئەوەنـدەى خـواى گـەورە پۆزشـى ( بيانوى ) بەلاوە بـاش نييە ، بۆيە كتێبى دابەزاندووە و پێغەمبەرانى ڕەوانە كردووە.**

(الترغيب ٣١٤٨)

٦٢٠٨- لا شيء أغير من الله تعالى.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أسماء بنت أبي بكر.

**٦٢٠٨- هيچ شتێك له خوا به غیرەت تر بێت.**

(المشكاة ٣٣١٥)

## بابەتی منالّی زینا ( زۆڵ )

٦٢٠٩- ليس على ولد الزنا من وزر أبويه شيء.

( صحيح ) ( ك ) عن عائشة.

**٦٢٠٩- زۆڵ هیچ هەڵ ناگرێت له گوناهی دایك و باوکی.**

(الصحيحة٢١٨٦)

٦٢١٠- ولد الزنا شر الثلاثة.

( صحيح ) ( حم د ك هق ) عن أبي هريرة.

**٦٢١٠- منالّی زۆڵ[1] له دایك و باوکی خراپتره.** [2]

(الصحيحة٦٧١)

## بابەتی دوو ڕوویی و سیفەتی دووڕووەکان

٦٢١١- أخر عني يا عمر إني خيرت فاخترت قد قيل لي : (( استغفر لهم أو لا تستغفر لهم إن تستغفر لهم سبعين مرة فلن يغفر الله لهم )) لو أعلم أني لو زدت على السبعين غفر له لزدت

( صحيح ) ( ت ن ) عن عمر .

**٦٢١١- بڕۆره دوامەوه ئەی عومەر ، من سەرپشك کرام و هەڵمبژارد ، پێم وترا : ( استغفر لهم أو لا ستغفر لهما سبعين مرة فله يغفر لهم ) ( التوبة : ٨٠ ) داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەی یان داوای لێ خۆشبوونیان بۆ نەکەی ئەگەر حەفتا جاریش داوای**

---

[1] زۆڵ ـ منالّی زینا ـ زۆڵزایه .

[2] مەناوی دەڵێت: ئەگەر چووه سەر کردەوەی باوك و دایکی کرد ، یان لەوان خراپتره ، له ڕووی بنچینه ورەگەز و ڕەچەڵەکەوه چونکه خۆی زۆڵه و دایك و باوکی زۆڵ نین .

**لێخۆشبوونیان بۆ بکردایە هەرگیز خوا لێیان خۆش نابێت. ئەگەر بمانزانیبا لە حەفتا جار زیاتر داوای لێ خۆشبوونم بۆ بکردانایە سوودی دەبوو ، زیادم دەکرد .** [1]

(الصحيحة١١٣١)

٦٢١٢- أخوف ما أخاف على أمتي كل منافق عليم اللسان.

( صحيح ) ( عد ) عن عمر .

**٦٢١٢- ئەوە کە زۆر ترسم هەیە بۆ ئوممەتەکەم هەموو دوو ڕوویەکی قسە زانە.**

(الصحيحة١٠١٣)

٦٢١٣- إذا قال الرجل للمنافق: يا سيدي فقد أغضب ربه.

( صحيح ) ( ك هب ) عن بريدة .

**٦٢١٣- ئەگەر پیاوێك بە دووڕوێکی وت: گەورەم ، خوای لە خۆی تووڕە کردووە .**

(الصحيحة٣٧٠)

٦٢١٤- إن أخوف ما أخاف على أمتي كل منافق عليم اللسان.

( صحيح ) ( حم ) عن عمر .

**٦٢١٤- بەڕاستی ترسی زۆرم دەربارەی ئوممەتەکەم لە دووڕوویکی زمان لووسە.**

(الصحيحة١٠١٣)

٦٢١٥- إن أخوف ما أخاف عليكم بعدي كل منافق عليم اللسان.

( صحيح ) ( طب هب ) عن عمران بن حصين .

**٦٢١٥- زۆرترین ترسم دەربارەی ئێوە ، لە هەر دوو ڕوێکی زمان لووسە.**

( الترغيب ١٣٢)

٦٢١٦- في أصحابي اثنا عشر منافقا منهم ثمانية لا يدخلون الجنة حتى يلج الجمل في سم الخياط.

( صحيح ) ( حم م ) عن حذيفة.

**٦٢١٦- لە هاوەڵانم[2] دا دوانزە دووڕوو[3] هەیە، هەشت کەس لەوان ناچنە بەهەشتەوە تاکو ووشترێك یان – وشترە گوریسێك – لەکونی دەرزی ئەودیو نەکرێ .**

(الصحيحة ٣٥٣٧)

---

[1] ئەمەی فەرموو کاتێك ویستی نوێژ بکاتە سەر سەرکردەی مونافیقەکان ( عبدالله بن ابي سلول ).

٢ ) واتە : ئەوانەی بە هاوەڵی من دادەنرێن.

٣ ) ئەوانەن کە دەم و چاوی خۆیان هەڵپێکا بوو ، لە شەوی گەڕانەوەی پێغەمبەر( ﷺ ) لە تەبووك لە کاتێکدا لەگەڵ عەممار و حزیفەدا بوو ویستیان بیکوژن لەڕێگا ( الثنية ) بەڵام خوای گەورە ، پاراستی لێیان و ناوەکانیشی پێ ووت .

٦٢١٧- إن في أمتي اثني عشر منافقا لا يدخلون الجنة و لا يجدون ريحها حتى يلج الجمل في سم الخياط ثمانية منهم تكفيكهم الدبيلة: سراج من النار يظهر في أكتافهم حتى ينجم من صدورهم

( صحيح ) ( م ) عن حذيفة .

**٦٢١٧- بەڕاستی لە ئوممەتی مندا دوانزە دووڕوو هەیە[١]، کە ناچنە بەهەشتەوە و بۆنیشی ناکەن ، تاکو وشتر بەکونی دەرزیدا نەچێت ، هەشت کەسیان دومەڵ لە کۆڵ ئێوەیان دەکاتەوە : ئاگرێك لەسەر شانیان دەردەکەوێت نافەوتێت تاکو لە سینگیانەوە دەردەچێت.**

(الصحيحة ٣٥٣٧)

٦١١٨- إنما خيرني الله فقال: ( استغفر لهم أو لا تستغفر لهم إن تستغفر لهم سبعين مرة) و سأزيده على سبعين .

( صحيح ) ( م ) عن ابن عمر .

**٦٢١٨- خوای گەورە سەرپشکی کردوم و فەرمووی: ( استغفر الله أو لا [٢]تستغفر لهم إن تستغفر لهم سبعين مرة فلن يغفر الله لهم ) ( التوبة: ٨٠ ) منیش لە حەفتا زیاتری دەکەم.**

(الصحيحة١١٣١)

٦١١٩- ألا أخبركم بصلاة المنافق؟ أن يؤخر العصر حتى إذا كانت الشمس كثرب البقرة صلاها.

( صحيح ) ( قط ك ) عن رافع بن خديج .

**٦٢١٩- ئایا ئاگادارتان بکەم لە نوێژی دووڕوو ؟ نوێژی عەسر دوا دەخات تاکو خۆر تینی نامێنێ وەکو چارەکە بەز گۆشتی مانگا دادەپۆشێ ئینجا دەیکات.**

(الصحيحة ١٧٤٥)

٦١٢٠- تجدون الناس معادن فخيارهم في الجاهلية خيارهم في الإسلام إذا فقهوا و تجدون خير الناس في هذا الشأن أشدهم له كراهية قبل أن يقع فيه و تجدون شر الناس يوم القيامة عند الله ذا الوجهين: الذي يأتي هؤلاء بوجه و يأتي هؤلاء بوجه.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أبي هريرة .

---

١ ) مەبەست ئەوانەیە کە ویستیان پێغەمبەر ( ﷺ ) بکوژن ، لە شەوی گەڕانەوەی لە غەزای تەبوك .

٢ واتە : داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەن یان داوای لێخۆشبوونیان بۆ نەکەی تەنانەت ئەگەر حەفتا جاریش داوای لێخۆشبوون بونیان بۆ بکەی هەرگیز خوا لێیان خۆش نابێت .

**٦٢٢٠- خەڵكی دەبینن وەكو كانەكان وان ، چاكترینیان لەسەردەمی نەفامیدا چاكترینیانە لە سەردەمی ئیسلامدا ئەگەر تێ بگەن و حاڵی بن ، چاكترینی خەڵكیش دەبینن ئەو كەسەیە كە زۆر ڕقی لە ئیسلامە پێش ئەوەی موسڵمان بێت، خراپترینی خەڵكیش لە ڕۆژی قیامەتدا لە لای خوا كەسی دووڕووەكانن : دەچێتە لای ئەوانە بەڕوویەك و، دەچێتە لای ئەوانە بەڕوویەكی تر.**

(الترغيب ٢٩٤٧)

٦١٢١- إن من شر الناس عند الله يوم القيامة ذا الوجهين.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة .

**٦٢٢١- بەڕاستی خراپترین كەس لە ڕۆژی قیامەت لە لای خوا دوو ڕووە.**

(الصحيح الترمذي ٢٠٢٥)

٦٢٢٢- من ستر الناس ذا الوجهين: الذي هؤلاء بوجه و يأتي هؤلاء بوجه.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أبي هريرة .

**٦٢٢٢- خراپترینی خەڵكی كەسی دووڕووە : دەچێت بۆ لای ئەوانە بە ڕوویەكەوە و دەچێت بۆ لای ئەمانەش بە ڕوویەكی ترەوە.**

(الصحيح أبي داود ٤٨٧٢)

٦١٢٣- من كان له وجهان في الدنيا كان له يوم القيامة لسانان من نار.

( صحيح ) ( د ) عن عمار.

**٦٢٢٣- هەركەسێك لە دونیا دوو ڕووی هەبێت ، لە ڕۆژی قیامەت دا دوو زمانی ئاگرینی دەبێت.**

(الصحيحة ٨٩٢)

## بابەتی ڕووپامایی

٦١٢٤- إذا جمع الله الأولين و الآخرين ليوم لا ريب فيه نادى مناد: من كان أشرك في عمل عمله لله أحدا فليطلب ثوابه من عنده فإن الله أغنى الشركاء عن الشرك ).

( صحيح ) ( حم ت هـ ) عن أبي سعيد بن أبي فضالة.

**٦٢٢٤- كاتێك خوای گەورە پێشینان و دوایینان كۆدەكاتەوە لە ڕۆژێكدا كە هیچ گومانێكی تیا نیە ، جارچیەك بانگ دەكات ، هەركەسێك لەو كردەوەی كە كردویەتی كەسێكی تری كردووە بە هاوبەشی خوا با داوای پاداشتەكەی لەو كەسە بكات ، چونكە خوای گەورە لە هەموو كەسێك بێ نیازترە لەوەی هاوبەشی هەبێت.**

(المشكاة ٥٣١٨)

٦١٢٥- إذا كان يوم القيامة نادى مناد: من عمل عملا لغير الله فليطلب ثوابه ممن عمله له

( صحيح ) ( ابن سعد ) عن أبي سعد بن أبي فضالة .

**٦٢٢٥- لە ڕۆژی قیامەت دا یەكێك جاڕ دەدات : هەركەسێك كردەوەیەكی كردبێت بۆ كەسێك جگە لەو خوای گەورە با پاداشتەكەی لەو كەسە داوا بكات.**

(المشكاة ٥٣١٨)

٦١٢٦- إن أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر الرياء يقول الله يوم القيامة إذا جزي الناس بأعمالهم: اذهبوا إلى الذين كنتم تراءون في الدنيا فانظروا هل تجدون عندهم جزاء.

( صحيح ) ( حم ) عن محمود بن لبيد .

**٦٢٢٦- بەڕاستی ئەوەی زۆرترین شت ترسم لێی هەبێت ئەنجامی بدەن هاوبەش دانانی بچووكە، ڕوپامایی ، خوای گەورە لەو ڕۆژەی پاداشتی خەڵكی دەداتەوە بە كردەوەكانیان، بڕۆن بۆ لای ئەوانەی ( ڕیاییتان ) ڕوپاماییان بۆ دەكردن لە دونیا و ، بڕوانن ئاخۆ پاداشتێكتان دەست دەكەوێت لە لایان.**

(الصحيحة ٩٥١)

٦١٢٧- إن الله تعالى لا يقبل من العمل إلا ما كان له خالصا و ابتغي به وجهه.

( صحيح ) ( ن ) عن أبي أمامة .

**٦٢٢٧- بەڕاستی خوای گەورە هیچ كردەوەیەك وەرناگرێت ئەگەر بە پاكی و تەنها بۆ خۆی ئەنجام نەدرابێت.**

(الصحيحة ٥٢)

٦١٢٨- ألا أخبركم بما هو أخوف عليكم عندي من المسيح الدجال ؟ الشرك الخفي: أن يقوم الرجل فيصلي فيزين صلاته لما يرى من نظر رجل.

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي سعيد .

**٦٢٢٨- ئایا ئاگادارتان بكەم لەوەی ترسم هەیە لەسەرتان ، لە دەججال زیاتر لێی دەترسم زیانیان پێ بگەیەنێت ؟ هاوبەشی دانانی شاراوە : پیاوێك هەڵسێت نوێژ بكات بە جوانی و ڕێك و پێكی چونكە دەزانێت تەماشا دەكرێت.**

(الصحيحة٥٢)

٦١٢٩- الشرك الخفي أن يعمل الرجل لمكان الرجل.

( صحيح ) ( ك ) عن أبي سعيد.

**٦٢٢٩- هاوبەشدانانی شاراوە ئەوەیە كەسێك كردەوەیەك بكات بۆ ئەوەی تەماشای بكرێت.**

(المشكاة ٥٣٣٣)

٦١٣٠- الشرك في أمتي أخفى من دبيب النمل على الصفا.

( صحيح ) ( الحكيم ) عن ابن عباس.

**٦٢٣٠- هاوبەش بۆ دانان خوا لە ئوممەتی مندا لە دەنگی پێی مێروولە بەسەر تاوێری لووسدا شاراوەترە.**

(الضعيفة ٣٧٥٥)

٦١٣١- لا ألفين أقواما من أمتي يأتون يوم القيامة بحسنات أمثال جبال تهامة بيضاء فيجعلها الله هباء منثورا أما إنهم إخوانكم و من جلدتكم و يأخذون من الليل كما تأخذون و لكنهم قوم إذا خلوا بمحارم الله انتهكوها.

( صحيح ) ( هـ ) عن ثوبان.

**٦٢٣١- نامەوێ كەسانێك لە ئوممەتم ببینم ، لە ڕۆژی قیامەتدا بێن بە كردەوەی چاكەویستی بەوێنەی شاخەكانی تیهامە ، خوای گەورە بۆی دەم با بدات بۆیان ، بەڵێ ئەوانە براتانن و لە خۆتانن ، وەكو ئێوە شەو نوێژیش دەكەن ، بەلام ئەوانە كاتێك بەتەنها قەدەغەكراوەكانی خوا بۆ هەڵدەكەوێت سنوریان دەبەزێنن.**

٦١٣٢- لأعلمن أقواما من أمتي يأتون يوم القيامة بحسنات أمثال جبال تهامة بيضاء فيجعلها الله هباء منثورا أما إنهم إخوانكم و من جلدتكم و يأخذون من الليل كما تأخذون و لكنهم قوم إذا خلوا بمحارم الله انتهكوها

( صحيح ) ( هـ ) عن ثوبان

**٦٢٣٢- بێگومــان كەســانێ وادەزانــن لــە ئوممەتەكــەم لــە ڕۆژی قیامــەت دا دێــن و ، ئەوەندەی شاخی تیهامە چاكە لەگەڵ خۆیان دەهێنن ، خوای گەورە هەموویان بـۆ دەم بـا دەدات ، بەڵێ ئەوانە برای ئێوەن و هەر لە خۆتانن و لە شەویش وەردەگـرن وەكـو ئێـوە ، بەلام ئەوان كاتێك بەتەنها دەبن سنوری قەدەغەكراوەكانی خوا دەبەزێنن .**

(الصحيحة ٥٠٥)

٦١٣٣- ما كرهت أن يراه الناس منك فلا تفعله بنفسك إذا خلوت.

( صحيح ) ( حب ت ) عن أسامة بن شريك.

**٦٢٣٣- ئەگەر پێت ناخۆشە خەڵكی لێت ببینن بە تەنیایش هەر ئە نجامی مەدە .**

(الصحيحة ٥٠٥)

٦١٣٤- بشر هذه الأمة بالسناء والدين و الرفعة و النصر و التمكين في الأرض فمن عمل منهم عمل الآخرة للدنيا لم يكن له في الآخرة من نصيب.

( صحيح ) ( حم حب ك هب ) عن أبي .

**٦٢٣٤- مژدە بدە بەم ئوممەتە بە بەرزی پلە و پایە و دینداری و سەربەرزی و سـەركەوتن دامەزراوی و جێگیربون لەسەر زەویدا ، جا هەركامیان كردەوەی دوارۆژی لە پێناو دونیـادا كرد لە قیامەت دا بێ بەش دەبێت.**

(الجنائز ٥٢)

٦١٣٥- من أكل برجل مسلم أكلة فإن الله يطعمه مثلها من جهنم و من اكتسى برجل مسلم ثوبا فإن الله يكسوه مثله من جهنم و من قام برجل مسلم مقام سمعة و رياء فإن الله يقوم به مقام سمعة و رياء يوم القيامة.

( صحيح ) ( حم د ك ) عن المستورد بن شداد.

**٦٢٣٥- هەركەسێك بەزۆر خواردنێك دەرخـواردی پیـاوێكی موسـڵمان بـدات خـوای گـەورە وێنـەی ئـەوەی لـە دۆزەخـدا دەرخـوارد دەدات ، هەركەسـێكیش بـە پۆشـاكێك بـەزۆر بـە موسڵمانێك ، خوای گەورە لەوێنەی ئـەوەی لـە دۆزەخ دا بـەزۆر پـێ لەبـەر دەكـات ، هـەر كەسێكیش بە زۆر موسڵمانێك بەرز بكاتەوە بۆ پلەوپایـەو ڕیابازیـەك، خـوای گـەورە لـە دۆزەخدا هەمان ڕاوەستان ڕای دەوەستێنێ.**

(الصحيحة ٩٣٤)

٦١٣٦- من سمع سمع الله به و من راءى راءى الله به.

( صحيح ) ( حم م ) عن ابن عباس.

**٦٢٣٦- هەركەسێك بەدوای ناوبانگ دا بگەڕێت : خوای گەورە ناوی دەزڕێنێ ، هەركێیش ڕیایی بكات خوای گەورە لەبەر چاوی خەڵكی دەخات.**

(المشكاة ٥٣١٦)

٦١٣٧- من سمع سمع الله به و من راءى راءى الله به و من شاق شق الله عليه يوم القيامة.

( صحيح ) ( حم خ هـ ) عن جندب.

**٦٢٣٧- هەركەسێك بەدوای ناوبانگ دا بگەڕێت : خوای گەورە ناوی دەڕزێنێ ، هەركەسیش ڕیایی بكات خوای گەورە لەبەر چاوی خەڵكی دەخات و ، هەركەسیش بارگرانی بكات خوای گەورە باری قورس دەكات لە ڕۆژی قیامەتد دا.**

٦١٣٨- من يرائي يرائي الله به و من يسمع يسمع الله به.

( صحيح ) ( حم ت هـ ) عن أبي سعيد.

**٦٢٣٨- هەركەسێك ڕیایی بكات خوای گەورە لەبەر چاوی خەڵكی دەخات ، هەركەسیش بەدوای ناوبانگدا بگەڕێ خوای گەورە ناوی دەڕزێنێت .**

(الترغيب ١٧٣٦)

## بابەتی تاوانە گەورەكان

٦١٣٩- اجتنبوا الكبائر و سددوا و أبشروا.

( صحيح ) ( ابن جرير ) عن قتادة مرسلا .

**٦٢٣٩- خۆتان بپارێزن لە تاوانە گەورەكان ، كاری چاكە ئەنجام بدەن و مژدەدەر بن.**

(الصحيحة ٨٨٥)

٦٢٤٠- من الكبائر شتم الرجل والديه: يسب أبا الرجل فيسب أباه و يسب أمه فيسب أمه.

( صحيح ) ( ق ت ) عن ابن عمرو.

**٦٢٤٠- لە تاوانە گەورەكانە جنێودانی پیاوێك بە باوك و دایكی خۆی ، جنێو بە باوكی كەسێك دەدات ئەویش جنێو بە باوكی ئەو دەدات جنێو بە دایكی كەسێك دەدات و ئەویش جنێو بە دایكی ئەو دەدات.**

(المشكاة ٤٩١٦)

## بابەتی سوننەتەكانی خەوتن

٦٢٤١- إذا استلقى أحدكم على قفاه فلا يضع إحدى رجليه على الأخرى.

( صحيح ) ( ت ) عن البراء ( حم ) عن جابر ( البزار ) عن ابن عباس .

**٦٢٤١- ئەگەر كەسێكتان لەسەر پشت ڕاكشان ، با قاچ نەخاتە سەر قاچ[1].**

(الصحيحة ١٢٥٥)

٦٢٤٢- إذا استيقظت فصل.

( صحيح ) ( حم د حب ك ) عن أبي سعيد .

**٦٢٤٢- ئەگەر لەخەو هەڵسای نوێژ بكە.**

(الارواء ٢٠٦٤)

٦٢٤٣- إذا قام أحدكم من الليل فاستعجم القرآن على لسانه فلم يدر ما يقول فليضطجع.

( صحيح ) ( حم م د هـ ) عن أبي هريرة .

**٦٢٤٣-ئەگەر كەسێكتان هەڵسان بۆ شەو نوێژ و ، قورئان قورس بوو لەسەر زمانی و نەيزانی چی دەڵێت با ڕاكشێت.**

(صحيح أبى داود ١١٨٤)

٦٢٤٤- إذا قام أحدكم من النوم فأراد أن يتوضأ فلا يدخل يده في الإناء حتى يغسلها فإنه لا يدري أين باتت يده و لا على ما وضعها.

( صحيح ) ( هـ قط الضياء ) عن جابر .

**٦٢٤٤- ئەگەر كەسێكتان لەخەو ئاگادار بێتەوە و بیەوێت دەست نوێژ بگرێت ، با دەستی نەخاتە نێو قاپەكە تاكو دەيشوات ، چونكە نازانێت دەستی لە كوێ ماوەتەوە.**

(صحيح أبى داود ٩٣)

٦٢٤٥- إذا نمتم فأطفئوا المصباح فإن الفأرة تأخذ الفتيلة فتحرق أهل البيت و أغلقوا الأبواب و أوكئوا الأسقية و خمروا الشراب.

( صحيح ) ( طب ك ) عن عبدالله بن سرجس .

---

١) ئەگەر ترسی بێت گەڵ و گونی بكەوێتە دەر، ئەگەر دەتوانێت قاچ بخاتە سەر قاچ.

**٦٢٤٥- كە خەوتن چرا بكوژێننەوە ، چونكە مشك پلیتەكەی دەبات و ماڵەكە دەسوتێ ، دەرگاكانیش دا بخەن و ، دەمی كوننەكان ببەستن ، خواردنەوەكانیش دابپۆشن.**[1]

(المشكاة ٤٢٤٩)

٦٢٤٦- إذا نمتم فأطفئوا سرجكم فإن الشيطان يدل مثل هذه على هذا فيحرقكم.

( صحيح ) ( د حب ك هب ) عن ابن عباس .

**٦٢٤٦- كاتێك دەخەون چراكانتان بكوژێننەوەو ، چونكە رێگە بەوە پیشان دەدا بتانسوتێنێ.**

(الصحيحة ١٤٢٦)

٦٢٤٧- أطفئوا المصابيح إذا رقدتم و أغلقوا الأبواب و أوكئوا الأسقية و خمروا الطعام و الشراب و لو بعود تعرضه عليه.

( صحيح ) ( خ ) عن جابر .

**٦٢٤٧- دەرگاكانتان دا بخەن و ، قاپەكانتان دا پۆشن و ، چراكانتان بكوژێننەوە ، دەمی كونەكانتان ببەستن و خواردن و خواردنەوەتانیش ئەگەر بەوەیش بووە دارێك بخەنە سەریان.**

(المشكاة ٤٢٤٩)

٦٢٤٨- أغلقوا أبوابكم و خمروا آنيتكم و أطفئوا سرجكم و أوكئوا أسقيتكم فإن الشيطان لا يفتح بابا مغلقا و لا يكشف غطاء و لا يحل وكاء و إن الفويسقة تضرم البيت على أهله.

( صحيح ) ( حم م د ت ) عن جابر .

**٦٢٤٨- دەرگاكانتان دا بخەن و قاپەكانتان دا پۆشن و ، چراكانتان بكوژێننەوە ، دەمی كونەكانتان ببەستن، چونكە شەیتان ناتوانێت دەرگای داخراو بكاتەوە و ، سەرقاپ لابدات و ، دەمی بەستراو بكاتەوە ، مشكیش ئاگر بەردەداتە ماڵەكەوە.**

(الارواء ٢٠٦٤٣٨)

٦٢٤٩- أقلوا الخروج بعد هدأة الرجل فإن لله تعالى دواب يبثهن في الأرض في تلك الساعة.

( صحيح ) ( حم د ن ) عن جابر .

**٦٢٤٩- دەرچوونتان كەمكەنەوە لە پاش بێ دەنگی خەڵكی ، چونكە خوای گەورە گیانەوەری هەیە بڵاویان دەكاتەوە بەسەر زەویدا لەو كاتە .**

(الصحيحة ١٥١٨)

---

**[2] ئەگەر بە چلە دارێكیش بووە بخرێتە سەری.**

٦٢٥٠- إن هذه النار إنما هي عدو لكم فإذا نمتم فأطفئوها عنكم.

( صحيح ) ( ق هـ ) عن أبي موسى .

**٦٢٥٠- لە ڕاستی دا ئەو ئاگرە دوژمنی ئێوەیە ، جا کاتێك کە دەخەون بیکوژێننەوە.**

(المشكاة ٤٣٠١)

٦٢٥١- إن هذه ضجعة لا يحبها الله تعالى.

( صحيح ) ( حم ت ك ) عن أبي هريرة .

**٦٢٥١- ئەو شێوازە خەوتنە خوای گەورە حەزی پێ ناکات**[1].

(المشكاة ٤٧١٨)

٦٢٥٢- إن هذه ضجعة يبغضها الله تعالى - يعني الاضطجاع على البطن -.

( صحيح ) ( حم د هـ ) عن طخفة بن قيس الغفاري .

**٦٢٥٢- خوای گەورە ڕقی لەو جۆرە خەوتنەیە – واتە : لەسەردەم- .**

(المشكاة ٤٧١٨)

٦٢٥٣- ألا لا يلومن امرؤ إلا نفسه يبيت و في يده ريح غمر.

( صحيح ) ( هـ ) عن فاطمة الزهراء .

**٦٢٥٣- با کەسێك جگە لە خۆی لۆمەی کەس نەکات ، ئەگەر بخەوێت و بۆن و چەوری گۆشتی بە دەستەوە بێت.**

(الصحيح ابن ماجة ٣٢٩٦)

٦٢٥٤- إياك و السمر بعد هدأة الرجل فإنكم لا تدرون ما يأتي الله في خلقه.

( صحيح ) ( ك ) عن جابر .

**٦٢٥٤- نەکەیت لە پاش شەو دانیشیت و نەخەویت ، چونکە ئێوە نازانن چی لە دروستکراوەکانی دەکات.**

(الصحيحة ١٧٥٢)

٦٢٥٥- خمروا الآنية و أوكئوا الأسقية و أجيفوا الأبواب و اكفتوا صبيانكم عند المساء فإن للجن انتشارا و خطفة و أطفئوا المصابيح عند الرقاد فإن الفويسقة ربما اجترت الفتيلة فأحرقت أهل البيت.

( صحيح ) ( خ ) عن جابر .

---

**١) خەوتن لەسەر سك.**

**٦٢٥٥- قاپەكان دا پۆشن و ، كونەكان دەم ببەستن و ، دەرگاكان دا بخەن و ، منالەكانتان بهێننە مالەوە لە كاتى ئێوارە ، چونكە جنۆكەكان بلاوبوونەوە و رفاندنيان هەيە لەو كاتەدا ، چراكانيش لە كاتى خەوتندا بكوژێننەوە ، چونكە لەوانە مشك پليتەكە رابكێشێت و مالەكە بسوتێنێ.**

(المشكاة ٤٢٩٥)

٦٢٥٦- غطوا الإناء و أوكئوا السقاء فإن في السنة ليلة ينزل فيها وباء لا يمر بإناء لم يغط أو سقاء لم يوكأ إلا وقع فيه من ذلك الوباء.

( صحيح ) ( حم م ) عن جابر.

**٦٢٥٦- قاپ دا پۆشن و ، كوننەدەم ببەستن ، چونكە لە هەموو ساڵێكدا شەوێك هەيە دەرد و بەلاى تيا دادەبەزێت، دادەبەزێت ، تێپەڕ نابێت بە لاى قاپێكى دانە پۆشراو يان كوننەيەكى دەم نەبەستراو تاكو تێى نەكەوێت.**

(الصحيحة ٣٧)

٦٢٥٧- غطوا الإناء و أوكئوا السقاء و أغلقوا الأبواب و أطفئوا السراج فإن الشيطان لا يحل سقاء و لا يفتح بابا و لا يكشف إناء فإن لم يجد أحدكم إلا أن يعرض على إنائه عودا و يذكر اسم الله فليفعل فإن الفويسقة تضرم على أهل البيت بيتهم.

( صحيح ) ( ك هـ ) عن جابر.

**٦٢٥٧- قاپ دا پۆشن و ، دەمى كوننە ببەستن ، دەرگاكان دا بخەن و ، چراكان بكوژێننەوە و ، چونكە شەيتان دەمى بەستراو و ، دەرگاى داخراو ناكاتەوە و ، سەرەقاپيش لانابات ، ئەگەر كەسێكتان هەر هيچى دەست نەكەوت دارێك نەبێت با ناوى خواى لەسەر بهێنێت و بيخاتە سەرى ، چونكە مشك مالەكە بۆ خاوەنەكەى ئاگر دەدات .**

(الصحيحة ٣٧)

٦٢٥٨- قيلوا فإن الشياطين لا تقيل.

( صحيح ) ( طس أبي نعيم في الطب ) عن أنس.

**٦٢٥٨- نيوەڕۆ خەو بكەن ، چونكە شەيتانەكان نيوەڕۆ خەو ناكەن .**

(الصحيحة ١٦٤٧)

٦٢٥٩- كان إذا أخذ مضجعه جعل يده اليمنى تحت خده الأيمن.

( صحيح ) ( طب ) عن حفصة.

**٦٢٥٩- كاتێك دەچووە سەر جێگاكەی دەستی ڕاستی دەخستە ژێر گۆنای ڕاستی .**

(المشكاة ٢٤٠٠)

٦٢٦٠- كان إذا عرس و عليه ليل توسد يمينه و إذا عرس قبل الصبح وضع رأسه على كفه اليمنى و أقام ساعده.

( صحيح ) ( حم حب ك ) عن أبي قتادة.

**٦٢٦٠- پێغەمبەر كاتێك لە گەشتەكانی لایدەدا بۆ پشوودان دەستی ڕاستی دەنایە ژێر سەری ، ئەگەر پێش بەرەبەیانیش لاییدایە ، سەری دەخستە سەر ناو لەپی ڕاستی بازووی ڕاست دادەنا.**

(المشكاة ٤٧١٦)

٦٢٦١- كان إذا نام نفخ.

( صحيح ) ( حم ق ) عن ابن عباس.

**٦٢٦١- پێغەمبەر (ﷺ) كاتێك دەخەوت پرخەی دەهات.**

(المشكاة ١١٩٥)

٦٢٦٢- كان إذا نام وضع يده اليمنى تحت خده و قال: اللهم قني عذابك يوم تبعث عبادك.

( صحيح ) ( حم ت ن ) عن البراء ( حم ت ) عن حذيفة ( حم هـ ) عن ابن مسعود.

**٦٢٦٢- پێغەمبەر (ﷺ) كاتێك دەخەوت دەستی ڕاستی دەخستە ژێر گۆنای و دەیفەرموو: خوایە بمانپارێزی لە سزات ، لەو ڕۆژەی بەندەكانت زیندوو دەكەیتەوە.**

(المشكاة ٨٢٨)

**٦٢٦٣- هەركێ لەسەربانێك بخەوێت وپەرژینی نەبێت پەیمانی لەگەڵ خوا بڕیوەتەوە.**

(الصحيحة٨٢٨)

٦٢٦٣- من بات على ظهر بيت ليس عليه حجاب فقد برئت منه الذمة.

( صحيح ) ( خد د ) عن علي بن شيبان.

٦٢٦٤- من نام عن حزبه أو عن شيء منه فقرأه فيما بين صلاة الفجر و صلاة الظهر كتب الله له كأنما قرأه من الليل.

( صحيح ) ( م ) عن عمر.

**٦٢٦٤- هەركێ خەوت بڕە قورئانەكەی خۆی نەخوێند یا هەندێكی لێ نەخوێند و ، لە نێوان نوێژی بەیانی و نیوەڕۆ خوێندی وەكو ئەوەیە لە شەو خوێندبێتی.**

(الصحيح ابي داود ١١٨٦)

٦٢٦٥- من نام و في يده غمر و لم يغسله فأصابه شيء فلا يلومن إلا نفسه.

( صحيح ) ( حم د ) عن أبي هريرة.

**٦٢٦٥- هەركێ بخەوێت و ، دەستی بە بۆن و چەوری گۆشتەوە بێت و نەیشوات ئینجا تووشی شتێك بێت ، لۆمەی كەس نەكات لە خۆی زیاتر.**

(الروض ٨٢٣)

٦٢٦٦- النار عدو فاحذروها.

( صحيح ) ( حم م ) عن ابن عمر.

**٦٢٦٦- ئاگر دوژمنە وریای بن.**

(الصحيح ابن ماجة ٣٧٧٠)

٦٢٦٧- لا تتركوا النار في بيوتكم حين تنامون.

( صحيح ) ( حم ق د ت هـ ) عن ابن عمر.

**٦٢٦٧- ئاگر لە ماڵەكانتاندا بەجێ مەهێڵن ئەو كاتەی دەخەون.**

(المشكاة ٤٣٠٠)

٦٢٦٨- لا يبيتن رجل عند امرأة في بيت إلا أن يكون ناكحا أو ذا محرم.

( صحيح ) ( م ) عن جابر.

**٦٢٦٨- ڕەوا نییە پیاوێك لای ژنێك بمێنێتەوە ، مەگەر مێرد بێت یان مەحرەم.**

(الصحيحة ٣٠٨٦)

٦٢٦٩- لا يستلق الإنسان على قفاه و يضع إحدى رجليه على الأخرى.

( صحيح ) ( م ) عن جابر.

**٦٢٦٩- مرۆڤ ڕانەكشێت لەسەر پشتی قاچێكی بخاتە سەر ئەوی تر.**

(الصحيحة ١٢٥٥)

٦٢٧٠- يعقد الشيطان على قافية رأس أحدكم إذا هو نام ثلاث عقد يضرب مكان كل عقدة: عليك ليل طويل فارقد فإن استيقظ فذكر الله انحلت عقدة فإن توضأ انحلت عقدة فإن صلى انحلت عقده كلها فأصبح نشيطا طيب النفس و إلا أصبح خبيث النفس كسلان.

( صحيح ) ( حم ق د ن هـ ) عن أبي هريرة.

**٦٢٧٠- شەيتان لەو كاتەی دەخەون سێ گرێ لە لای سەری كەسێكتان لێ دەدا لە هەموو گرێیەكدا دەڵێت شەوێكی درێژت لە پێشە بخەوە جا ئەگەر ئاگادار بێتەوە گرێیەكیان دەكرێتەوە ، ئەگەریش دەست نوێژ بگرێت گرێیەك دەكرێتەوە ، ئەگەریش نوێژ بكات هەموو گرێكان دەكرێتەوە ، بۆ چالاك و ئاسوودە دەبێت ، ئەگەر نا سست و تەمەڵ دەبێت.**

(الصحيح ابو داود ١١٧٩)

## بابەتی ئەو فەرموودانەی دەربارەی مەڕو ماڵات و ئاژەڵ

٦٢٧١- اتقوا الله في البهائم المعجمة فاركبوها صالحة و كلوها صالحة

( صحيح ) ( حم د ابن خزيمة حب ) عن سهل بن الحنظلية .

**٦٢٧١- ترسی خواتان هەبێ سەبارەت بە ئەو ئاژەڵە بێ زمانانە ، بەچاكی سواری بن و، بە چاكی بیا نخۆن.**

(الصحيحة ٣٣)

٦٢٧٢- إذا ركبتم هذه البهائم العجم فانجوا عليها فإذا كانت سنة فانجوا و عليكم بالدلجة فإنما يطويها الله.

**٦٢٧٢- ئەگەر سواری ئەو وڵاخە بێ زمانانە بوون پەلە بكەن ، ئەگەر زەوی وشك و بێ گیا بوو خێرا بكەن[1] ، بە شەویش ڕێ بكەن چاكترە بۆتان ، چونكە لە ڕاستیدا خوای گەورە ڕێكان كورت دەكاتەوە.**

(الصحيحة ٦٨٢)

( صحيح ) ( طب ) عن عبدالله بن مغفل .

٦٢٧٣- اركبوا هذه الدواب سالمة و اتدعوها سالمة و لا تتخذوها كراسي لأحاديثكم في الطرق و الأسواق فرب مركوبة خير من راكبها و أكثر ذكرا منه.

( صحيح ) ( حم ع طب ك ) عن معاذ بن أنس .

---

١ ) واتە : لە ڕێگەیدا لەوەڕ نەبێت بیخوات ، بۆیە پەلە بكەن بۆ زیانی پێ نەگات .

**٦٢٧٣- سوارى ئەم ولآخانە بن بە بێ ماندوو كردنیان و ، وازیان لێ بهێنن ئەگەر پێویستیتان پێیان نەبوو ، وەكو كورسیش بەكاریان مەهێنن[١].**

٦٢٧٤- لا تمثلوا بالبهائم.

( صحيح ) ( ن ) عن عبدالله بن جعفر.

**٦٢٧٤- ئاژەڵ و مالآت ئەتك مەكەن.**

(الصحيحة ٦٢٣١)

٦٢٧٥- لعن الله من مثل بالحيوان.

( صحيح ) ( حم ق ن ) عن ابن عمر.

**٦٢٧٥- نەفرەتی خوا لە كەسێك ئەندامی ئاژەڵێك بە زیندوویی ببڕێت.**

(الصحيح النسائي ٤٤٤٢)

٦٢٧٦- إياي أن تتخذوا ظهور دوابكم منابر فإن الله تعالى إنما سخرها لكم لتبلغكم إلى بلد لم تكونوا بالغيه إلا بشق الأنفس و جعل لكم الأرض فعليها فاقضوا حاجاتكم.

( صحيح ) ( د ) عن أبي هريرة.

**٦٢٧٦- نەكەن پشتی ئاژەڵەكان بكەن بە مینبەر ، چونكە خوای گەورە ئەو ئاژەڵانەی بۆتان هێناوەتە ژێربار بۆ ئەوەی بتانگەیەنێت بە جێگایەك بە ماندوویی زۆر نەبێت پێی نەدەگەشتن ، زەویشی بۆ ئێوە داناوە پێویستی یەكانتانی لەسەر جێبەجێ بكەن.**

(الصحيحة ٢٢)

٦٢٧٧- دخلت امرأة النار في هرة ربطتها فلم تطعمها و لم تدعها تأكل من خشاش الأرض حتى ماتت.

( صحيح ) ( حم ق هـ ) عن أبي هريرة ( خ ) عن ابن عمر .

**٦٢٧٧- پشیلەیەك چووە دۆزەخەوە بە هۆی پشیلەیەكەوە كە بەندی كردبوو ، نە ئەوە بوو خواردنی پێ بدات و بەرەڵایشی نەدەكرد بڕوات لە گیانەوەر و خشۆكەی زەوی بخوات تاكو مردارەوە بوو.**

(الصحيحة ٢٨)

---

**١ ) مەناوی دەڵێت: واتە: وەكو كورسی لەسەریان دامەنیشن قسە لەگەڵ یەكتر بكەن و ئەویش ڕاوەستابێت، قەدەغەكراویش ئەوەیە ماوەیەكی زۆر لەسەردابنیشن بە بێ پێویستی.**

٦٢٧٨- عذبت امرأة في هرة حبستها حتى ماتت جوعا فدخلت فيها النار قال الله: لا أنت أطعمتيها و لا سقيتيها حين حبستيها و لا أنت أرسلتيها فأكلت من خشاش الأرض .

( صحيح ) ( حم ق ) عن ابن عمر ( الدارقطني في الأفراد ) عن أبي هريرة.

**٦٢٧٨- ئافرەتێك بە بۆنەی پشیلەیەكەوە سزادرا ، چونكە زیندانی كرد تاكو كوشتی و چووە دۆزەخەوە لەبەر ئەو كارەی ، خوای گەورە فەرمووی: نە خواردن و خواردنەوەت پێدا كاتێك زیندات كردووە نە بەرەڵایشت كرد لە گیانەوەر و خشۆكەی زەوی بخوات.**

(الصحيحة ٢١٠)

٦٢٧٩- عذبت امرأة في هر ربطته حتى مات و لم ترسله فيأكل من خشاش الأرض فوجبت لها النار بذلك .

( صحيح ) ( حم ) عن جابر.

**٦٢٧٩- ئافرەتێك ئەشكە نجە درا بە بۆنەی پشیلەیەكەوە بەستبوویەوە تاكو مردارەو بوو بەریشی نەدا بچێت گیانەوەری زەوی بخوات ، بۆیە بەو كارەی شایستەی دۆزەخ بوو.**

(الصحيحة ٢٨)

٦٢٨٠- لعن الله من يسم في الوجه.

( صحيح ) ( طب ) عن ابن عباس.

**٦٢٨٠- نەفرینی خوا لە كەسێك بێت ڕوومەتی ئاژەڵ داخ دەكات.**

(الصحيحة ٢١٤٩)

٦٢٨١- على ذروة كل بعير شيطان فامتهنوهن بالركوب فإنما يحمل الله تعالى .

( صحيح ) ( ك ) عن أبي هريرة.

**٦٢٨١-لەسەر كۆپارەی هەموو وشترێك شەیتانێك هەیە، بۆیە سووكایەتیان پێ بكەن بەسوار بوون چونكە خوای گەورە هەڵیدەگرێت.**

(الضعيفة الصيام ٦٣ )

٦٢٨٢- على ظهر كل بعير شيطان فإذا ركبتموها فسموا الله ثم لا تقصروا عن حاجاتكم .

( صحيح ) ( حم ن حب ) عن حمزة بن عمرو الأسلمي.

**٦٢٨٢- لەسەر پشتی هەموو وشترێك شەیتانێك هەیە، بۆیە سواریان بن و ناوی خوا بهێنن، درێغیش مەكەن لە ئەنجامدانی كارەكانتان.**

(الضعيفة الصيام ٦٣ )

٦٢٨٣- غفر لامرأة مومسة مرت بكلب على رأس ركي يلهث كاد يقتله العطش فنزعت خفها فأوثقته بخمارها فنزعت له من الماء فغفر لها بذلك.

( صحيح ) ( خ ) عن أبي هريرة.

**٦٢٨٣- خوای گەورە لە ئافرەتێکی سۆزانی خۆش بوو، چونکە بەلای سەگێکدا تێپەڕی لەسەر بیرێك وەستا بوو، هەناسە برکێی بوو خەریك گیانی دەربچێت لە تینوێتیدا، ئەویش پێڵاوەکەی داکەند و، بەسەر پۆشەکەی بەستیەوە ، ئاوی بۆ هەڵکیشا، ئیتر خوای گەورەیش بەو کردەوەی لێی خۆش بوو.**

(الصحيحة ٣٠)

٦٢٨٤- ما من بعير إلا في ذروته شيطان فإذا ركبتموها فاذكروا نعمة الله تعالى عليكم كما أمركم الله ثم امتهنوها لأنفسكم فإنما يحمل الله تعالى.

( صحيح ) ( حم ك ) عن أبي الأوس الخزاعي.

**٦٢٨٤- هەموو وشترێك شەیتانێك لەسەر بەرزایی پشتێتی، جا ئەگەر سواری بوون یادی خوای گەورە و نیعمەتەکانی بکەن، وەکو فەرمانی پێکردوون و، ئینجا بەکاری بهێنن بۆ خۆتان چونکە خوای گەورە خۆی هەڵیدەگرێت.**

(الصحيحة ٢٢٢٧)

٦٢٨٥- لا أيم الله لا تصاحبنا راحلة عليها لعنة.

( صحيح ) ( م ) عن أبي بردة.

**٦٢٨٥- نە، سوێند بەخوا وڵاخێکی نەفرین لێکراو نابێت لە گەڵماندا بێت[1].**

## بابەتی پێشبڕکێ

٦٢٨٦- لا سبق إلا في خف أو حافر أو نصل.

( صحيح ) ( حم ٤ ) عن أبي هريرة.

**٦٢٨٦- ڕەوا نییە پێشبڕکێ بە بەرانبەر، مەگەر لە وشتر و ئەسپ وێردا نەبێت.**

(الارواء ١٥٠١)

[1] بەو ئافرەتەی فەرموو کە نەفرینی لە وڵاخەکەی خۆی کرد.

## بابەتی تێخوڕینی ئەسپ لە پێشبڕکێ دا

٦٢٨٧- من جلب على الخيل يوم الرهان فليس منا.

( صحيح ) ( طب ) عن ابن عباس.

**٦٢٨٧- لە ئێمە نییە ئەو کەسەی پیاوێک دوای ئەسپ بخات بۆ تێخوڕین لە ڕۆژی پێشبڕکێ دا.**

(الصحيحة ٢٣٣١)



# پە ڕاوی پزیشکی و نوشتە

## بابەتی ئەوانەی تیمار ناکرێن لە نەخۆشییەکانیان

٦٢٨٨- ما اختلج عرق و لا عين إلا بذنب و ما يدفع الله عنه أكثر.

( صحيح ) ( طس الضياء ) عن البراء.

**٦٢٨٨- ئازاری لە ماسولکە و دەمار و چاودا دروست نابێت بە هۆی گوناهەوە نەبێت، ئەوەی خوا لای دەبات زۆر زیاترە[1] ( ئەو گوناه و تاوانانەی خوا لەسەری لادەبات زۆر زیاترە لەو ئازارەی دەیچێژێت ).**

٦٢٨٩- لا يصيب عبدا نكبة فما فوقها أو دونها إلا بذنب و ما يعفو الله عنه أكثر.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي موسى.

**٦٢٨٩- هەر بەندەیەك تووشی مەینەتێك یان زیاتر بێت یان کەمتر بەهۆی گوناهەوە تووشی دەبێت، ئەوەشی خوای گەورە لێی خۆش دەبێت زۆرترە.**

(المشكاة ١٥٥٨)

٦٢٩٠- المصائب و الأمراض و الأحزان في الدنيا جزاء.

( صحيح ) ( ص حل ) عن مسروق مرسلا.

**٦٢٩٠- دەرد و بەلا و نەخۆشی و خەم و خەفەت لە دونیا پاداشتە.**

(الضعيفة ٢٩٢٤)

## بابەتی سەردانی نەخۆش

٦٢٩١- إذا جاء الرجل يعود مريضا فليقل: اللهم اشف عبدك فلانا ينكأ لك عدوا أو يمش لك إلى الصلاة.

( صحيح ) ( حم د ابن السني طب ك ) عن ابن عمرو .

---

[1] **فيض القدير ج٥ ص٥٢٩**

**٦٢٩١- ئەگەر كەسێك چووە سەردانی نەخۆشێك با بڵێت: خوایە فلانە چاك بكەرەوە، هەڵسێت بە كوشتنی دوژمنێك، یان هەنگاوێك بنێت بەرەو نوێژێك.**

(الصحيحة ١٥٠٤)

٦٢٩٢- إذا رأى أحدكم مبتلى فقال: الحمد لله الذي عافاني مما ابتلاك به و فضلني عليك و على كثير من عباده تفضيلا كان شكر تلك النعمة.

( صحيح ) ( هب ) عن أبي هريرة .

**٦٢٩٢- ئەگەر كەسێكتان لێقەوماوێكی بینی ووتی: سوپاس بۆ ئەو خوای سەلامەتی كردم لەوبەلایەی تووشی تۆ بووە و، پەسەندیشی كردوومەتە سەر تۆ و زۆرێك لە بەندەكانی، ئەو سوپاسی ئەو نیعمەتەیە.**

(الروض ١٠٥٠)

٦٢٩٣- إذا عاد أحدكم مريضا فليقل: اللهم اشف عبدك ينكأ لك عدوا أو يمشي لك إلى صلاة.

( صحيح ) ( ك ) عن ابن عمر .

**٦٢٩٣- ئەگەر كەسێكتان سەردانی نەخۆشێكی كرد با بڵێت: خوایە بەندەكەت تیمار بكە دوژمنێكت بكوژێت و، یان بەرەو توێژێك رێبكات.**

(الصحيحة ١٣٦٥)

٦٢٩٤- إذا عاد الرجل أخاه المسلم مشى في خرافة الجنة حتى يجلس فإذا جلس غمرته الرحمة فإن كان غدوة صلى عليه سبعون ألف ملك حتى يمسي و إن كان عشيا صلى عليه سبعون ألف ملك حتى يصبح.

( صحيح ) ( حم ع هق ) عن علي .

**٦٢٩٤- ئەگەر سەردانی برا موسڵمانەكەی كرد لەباخێكی بەهەشتدا رێدەكات، تاكو دادەنیشێ، كە دانیشت سۆز و بەزەیی خوای بەسەردا دەرژێت، ئەگەر بەیانی بێت حەفتا هەزار فریشتە داوای دروودی بۆ دەكەن تاكو ئێوارە، ئەگەریش ئێوارە بوو حەفتا هەزار فریشتە داوای دروودی بۆ دەكەن تاكو بەیانی.**

(الصحيحة ١٣٦٧)

٦٢٩٥- إن الله تعالى يقول يوم القيامة: يا ابن آدم مرضت فلم تعدني قال: يا رب كيف أعودك و أنت رب العالمين ؟ قال: أما علمت أن عبدي فلانا مرض فلم تعده ؟ أما علمت أنك لوعدته

لوجدتني عنده ؟ يا ابن آدم استطعمتك فلم تطعمني فقال: يا رب و كيف أطعمك و أنت رب العالمين ؟ قال: أما علمت أنه استطعمك عبدي فلان فلم تطعمه أما علمت أنك لو أطعمته لوجدت ذلك عندي ؟ يا ابن آدم استسقيتك فلم تسقني قال: يا رب كيف أسقيك و أنت رب العالمين ؟ قال: استسقاك عبدي فلان فلم تسقه أما إنك لو سقيته لوجدت ذلك عندي.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة .

**٦٢٩٥- خواى گەورە لە رۆژى قيامەتدا دەفەرمويت: ئەى ئادەميزاد نەخۆشكەوتم و، سەردانت نەكردم، دەڵێت: ئەى پەروەردگارم چۆن سەردانت بكەم تۆ پەروەردگارى جيهانەكانى، دەفەرمويت: ئايا نەتزانى فلانە بەندەم نەخۆش كەوت و سەردانت نەكرد، ئايا نەتزانى ئەگەر سەردانت بكردايە من لەوێ دەبووم، ئەى ئادەميزاد داواى خواردنم لێ كردى و خواردنت پىٚ نەدام، دەڵێت: ئەى پەروەردگارم چۆن خواردن پىٚ بدەم و پەروەردگارى جيهانەكانى؛ دەفەرمويت: ئايا نەتزانى فلانە بەندەم داواى خواردنى لێكردى و خواردنت پىٚ نەدا، ئايا نەتزانى ئەگەر خواردنت پىٚ بدايە ئەوەت لەلاى من دەبينيەوە؟ ئەى ئادەميزاد داواى ئاوم لێكردى و ئاوت پىٚ نەدام، دەڵێت: ئەى پەروەردگارم چۆن ئاوت پىٚ بدەم و تۆ پەروەردگارى جيهانەكانى؟ دەفەرمويت: بەندەم داواى ئاوى لێكردى و پێت نەدا، بەڵێ ئەگەر ئاوت پێبدايە ئەوەت لەلاى من دەبينيەوە.**

(الترغيب ٩٥٢)

٦٢٩٦- إن المسلم إذا عاد أخاه المسلم لم يزل في مخرفة الجنة حتى يرجع.

( صحيح ) ( حم م ت ) عن ثوبان .

**٦٢٩٦- موسڵمان ئەگەر سەردانى برا موسڵمانەكەى كرد، هەر وەكو ئەوەيە لە باخەكانى بەهەشتدا بێت تاكو دەگەڕێتەوە.**

(المشكاة ١٥٢٧)

٦٢٩٧- عائد المريض في مخرفة الجنة فإذا جلس عنده غمرته الرحمة .

( صحيح ) ( البزار ) عن عبدالرحمن بن عوف.

**٦٢٩٧- سەردانكەرى نەخۆش لە باخە بەهەشتدايە، كاتێك لەلاى نەخۆشەكە دادەنيشىٚ سۆز و بەزەيى خواى بەسەردا دادەبەزىٚ.**

(الصحيحة ١٩٢٩)

٦٢٩٨- عائد المريض يمشي في مخرفة الجنة حتى يرجع .

( صحيح ) ( م ) عن ثوبان.

**٦٢٩٨- ئەو كەسەى سەردانى نەخۆش دەكات لە باخيكى بەهەشت ڕێ دەكات تاكو دەگەڕێتەوە.**

(الصحيحة ١٩٢٩)

٦٢٩٩- فكوا العاني و أجيبوا الداعي و أطعموا الجائع و عودوا المريض.

( صحيح ) ( حم خ ) عن أبي موسى.

**٦٢٩٩- ديل لە دەستى دوژمن ڕزگار بكەن و، بچنە دەم بانگكەرەوە و، نان بە برسى بدەن و، سەردانى نەخۆش بكەن.**

(المشكلة الفقر ١١٢)

٦٣٠٠- كان إذا أتى مريضا أو أتي به قال: أذهب الباس رب الناس اشف و أنت الشافي لا شفاء إلا شفاؤك شفاء لا يغادر سقما.

( صحيح ) ( ق هـ ) عن عائشة.

**٦٣٠٠- پێغەمبەر ( ﷺ ) كە دەچووە لاى نەخۆشێك يان بۆيان دەهێنا دەيفەرموو: ئازارى بە سوێ لابدە ئەى پەروەردگارى ئادەميزاد، چارەسەريشى بكە تۆ خاوەن چارەسەرى، چارەسەرێكى بكە نەخۆشى بەجێ نەهێڵێ.**

(الصحيحة ٢٧٧٥)

٦٣٠١- كان إذا دخل على مريض يعوده قال: لا بأس طهور إن شاء الله.

( صحيح ) ( خ ) عن ابن عباس.

**٦٣٠١- كاتێك دەچووە لاى نەخۆشێك بۆ سەردان كردنى دەيفەرموو: قەيناكا، پاككەرەوەى گوناهـ** (انشاء الله).

(المشكاة)

٦٣٠٢- ما من امرئ مسلم يعود مسلما إلا ابتعث الله سبعين ألف ملك يصلون عليه في أي ساعات النهار كان حتى يمسي و أي ساعات الليل كان حتى يصبح.

( صحيح ) ( حب ) عن علي.

**٦٣٠٢- هەر موسڵمانێك سەردانی نەخۆشێکی موسڵمان بکات خوای گەورە حەفتا هەزار فریشتە دەنێرێ داوای سۆز و بەزەیی خوای بۆ بکەن لەهەرکاتێکی ڕۆژ بێت تاکو ئێوارە، لەهەرکاتێکی شەویش بێت تاکو بەیانی.**

(الصحيحة ١٣٦٧)

٦٣٠٣- ما من رجل يعود مريضا ممسيا إلا خرج معه سبعون ألف ملك يستغفرون له حتى يصبح و من أتاه مصبحا خرج معه سبعون ألف ملك يستغفرون له حتى يمسي.

( صحيح ) ( د ك ) عن علي.

**٦٣٠٣- هەر پیاوێك سەردانی نەخۆشێك بکات ئێوارە حەفتا هەزار فریشتەی لەگەڵ دەردەچێت داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن تاکو بەیانی، ئەگەریش سەر لەبەیانی بچێتە لای حەفتا هەزار فریشتەی لەگەڵ دەردەچێ داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن تاکو ئێوارە.**

(الصحيحة ١٣٦٧)

٦٣٠٤- من أتى أخاه المسلم عائدا مشى في خرافة الجنة حتى يجلس فإذا جلس غمرته الرحمة فإن كان غدوة صلى عليه سبعون ألف ملك حتى يمسي و إن كان مساء صلى عليه سبعون ألف ملك حتى يصبح.

( صحيح ) ( هـ ك ) عن علي.

**٦٣٠٤- هەرکێ بەسەردان بچێتە لای برا موسڵمانەکەی، لەناو باخێکی بەهەشتدا ڕێ دەکات تاکو دادەنیشێ لەلای، ئەو کاتەیش میهرەبانی خوای گەورە دەورەی دەدات، ئەگەر بەیانی بێت حەفتا هەزار فریشتە داوای میهرەبانی خوای بۆ دەکەن تاکو ئێوارە، ئەگەریش ئێوارە بێت داوای میهرەبانی خوای بۆ دەکەن تاکو بەیانی.**

(الصحيحة ١٣٦٧)

٦٣٠٥- من رأى مبتلى فقال: الحمد لله الذي عافاني مما ابتلاك به و فضلني على كثير ممن خلق تفضيلا لم يصبه ذلك البلاء.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة.

**٦٣٠٥- هەرکێ کەسێکی گیرۆدە بینی و، وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە سەلامەتی کردم لەوەی تۆی پێ گرفتار کرد، لەسەر زۆرێکیش لە دروستکراوەکانی پەسەندی کردم، ئیتر ئەو نەخۆشییەی تووش نابێت.**

(الصحيحة ٦٠٤)

٦٣٠٦- من عاد مريضا أو زار أخا له في الله ناداه مناد: أن طبت و طاب ممشاك و تبوأت من الجنة منزلا.

( صحيح ) ( ت هـ ) عن أبي هريرة.

**٦٣٠٦- هەركێ سەردانی نەخۆشێك بكات، یان لەبەر خوا سەردانی برایەكی بكات، بانگكەرێك بانگی دەكات: خۆش بێت و، ڕێكردنەكەت پیرۆزبێت و، ماڵێكیش لە بەهەشتدا بۆ دیاری بكرێت.**

(المشكاة ٥٠١٥)

٦٣٠٧- من عاد مريضا لم يحضر أجله فقال عنده سبع مرات: أسأل الله العظيم رب العرش العظيم أن يشفيك إلا عافاه الله من ذلك المرض.

( صحيح ) ( د ك ) عن ابن عباس.

**٦٣٠٧- هەركێ سەردانی نەخۆشێك بكات ڕۆژی تەواو نەبووبێت و ، حەوت جار لەلای بلێت: داوا لەخوای گەورە دەكەم، كەخوای عەرشی گەورەیە تیمارت بكات، خوای گەورە لەو نەخۆشییە ڕزگاری دەكات.**

(المشكاة ١٥٥٣)

٦٣٠٨- من عاد مريضا لم يزل في خرفة الجنة حتى يرجع.

( صحيح ) ( م ) عن ثوبان.

**٦٣٠٨- هەركەسێك سەردانی نەخۆشێك بكات لە باخێكی قەشەنگی بەهەشتدایە تاكو دەگەڕێتەوە.**

(الصحيحة ١٩٢٩)

٦٣٠٩- ما من مسلم يعود مسلما غدوة إلا صلى عليه سبعون ألف ملك حتى يمسي و إن عاده عشية صلى عليه سبعون ألف ملك حتى يصبح و كان له خريف في الجنة.

( صحيح ) ( ت ) عن علي.

**٦٣٠٩- هەر موسڵمانێك سەردانی نەخۆشێكی موسڵمان بكات سەر لەبەیانی، حەفتا هەزار فریشتە داوای بەزەیی و لێخۆشبوونی بۆ دەكەن تاكو ئێوارە، ئەگەر ئێوارەیش بێت تاكو بەیانی داوای بەزەیی و لێ خۆشبوونی تاكو بەیانی بۆ دەكەن و باخچەیەكی قەشەنگ و ڕازاوەی بەهەشتیشی پێ دەدرێت .**

(الصحيحة ١٣٦٧)

## بابەتی ئەوەی نەخۆشی قەرەبووی گوناهەكانە

٦٣١٠- أبشر فإن الله تعالى يقول: هي ناري أسلطها على عبدي المؤمن في الدنيا لتكون حظه من النار يوم القيامة.

( صحيح ) ( حم هـ ك ) عن أبي هريرة .

**٦٣١٠- مژدەت لێ بێت بەڕاستی خوای گەورە دەفەرموێت: ئەو تایە ئاگری منە، زاڵی دەكەمە سەر بەندە بڕوادارەكەمدا لە دونیادا، بۆ ئەوەی بری پشكی خۆی بكەوێت لە ئاگری دۆزەخ لە ڕۆژی قیامەتدا .**

(الصحيحة ٢٥٥٧)

٦٣١١- أبشري يا أم العلاء فإن مرض المسلم يذهب خطاياه كما تذهب النار خبث الحديد.

( صحيح ) ( طب ) عن أم العلاء.

**٦٣١١- مژدەت لێ بێت ئەی دایكی عەلا! بەڕاستی نەخۆشی موسڵمان گوناهەكانی لادەبات وەكو چۆن ئاگر پیسی[1] ئاسن لادەبات.**

(الصحيحة ٧١٤)

٦٣١٢- إذا ابتلى الله العبد المسلم ببلاء في جسده قال الله عز و جل: أكتب له صالح عمله فإن شفاه غسله و طهره و إن قبضه غفر له و رحمه.

( صحيح ) ( حم ) عن أنس .

**٦٣١٢- ئەگەر خوای گەورە بەندەكەی لەلاشەیدا تاقی بكاتەوە بە بەڵایەك، دەفەرموێت: كردەوە چاكەكەی بۆ بنووسە، ئەگەر چاك بوەوە بیشۆرێتەوە و پاكی بكەرەوە، ئەگەر گیانیشی كێشا لێی خۆش دەبێت و بەزەیی پیادێتەوە.**

(الارواء ٥٥٣)

٦٣١٣- إذا اشتكى العبد المسلم قال الله تعالى للذين يكتبون: اكتبوا له أفضل ما كان يعمل إذا كان طلقا حتى أطلقه.

( صحيح ) ( حل ) عن ابن عمرو .

---

[1] ژەنگ وژار

**٦٣١٣- كه بەندەى موسڵمان سكاڵا بكات له نەخۆشى خواى گەورە دەفەرموێت كه دەنوسێت: كەدەنووسى باشترين كردەوەى بۆ بنووسە لەوەى كردوويەتى هەتا ئەو كاتەى ساغ بوو، تاكو رزگارى دەبێت ئەگەر لەرزگار بوونى چاكبوونەوە بێت.**

(الصحيحة ١٢٣١)

٦٣١٤- إذا اشتكى المؤمن أخلصه من الذنوب كما يخلص الكير خبث الحديد.

( صحيح ) ( خد حب طس ) عن عائشة .

**٦٣١٤- ئەگەر موسڵمان هاوارى ئازارێكى هەبێت پاكى دەكاتەوە له گوناهەكانى، وەكو چۆن موشە دەمە[1] پيسى ئاسن لادەبات و دەمەزردى دەكات .**

(الصحيحة ١٢٥٧)

٦٣١٥- إذا مرض العبد أو سافر كتب الله تعالى له من الأجر مثل ما كان يعمل صحيحا مقيما.

( صحيح ) ( حم خ ) عن أبي موسى .

**٦٣١٥- ئەگەر بەندە نەخۆشكەوێت يان گەشت و گوزار بكات خواى گەورە پاداشتى كاتى ساغى و نيشتەجى بوونى بۆ دەنووسێت.**

(الارواء ٥٥٣)

٦٣١٦- إذا مرض العبد قال الله للكرام الكاتبين: اكتبوا لعبدي مثل الذي كان يعمل حتى أقبضه أو أعافيه.

( صحيح ) ( ش ) عن عطاء بن يسار مرسلا .

**٦٣١٦- كاتێك موسڵمان نەخۆش دەكەوێت خواى گەورە بە نووسەرە بەرێزەكان دەفەرموێت: بنووسن بۆ بەندەكەم وەكو ئەو كردارانەى لەومو پێش دەيكرد، تاكو دەييەمەوە لاى خۆم يان چارەسەرى دەكەم.**

(الارواء ٥٥٣)

٦٣١٧- إن الرجل ليكون له المنزلة عند الله فما يبلغها بعمل فلا يزال الله يبتليه بما يكره حتى يبلغه إياها.

( صحيح ) ( حب ك ) عن أبي هريرة .

---

**[1] ئامێرێكى ئاسنگەرى بوو له چەرم دروستكرابوو وەكو باڵۆنێكى گەورە كه دەكرايەوە پڕ دەبوو له هەوا كه دەهێنرايەوە فووى له پشكۆكانى دەكرد .**

**٦٣١٧- بەڕاستی کەسی وا هەیە پلە و پایەی دەبێت لەلای خوا ناتوانێت پێی بگات بە کردەوەی خۆی، بەڵام خوای هەر تاقیدەکاتەوە بەشتی ناخۆش تاکو پێی دەگات.**

(الصحيحة ٢٥٩٩)

٦٣١٨- إن الصالحين يشدد عليهم و إنه لا يصيب مؤمنا نكبة من شوكة فما فوق ذلك إلا حطت عنه بها خطيئة و رفع له بها درجة.

( صحيح ) ( حم حب ك هب ) عن عائشة .

**٦٣١٨- بەڕاستی پیاو چاکان زبریان لەگەڵ ڕەچاو دەکرێت، هیچ مەینەتێکیش تووشی موسڵمانێك نابێت لە دڕکێك بەرەو سەرەوە تاکو گوناهێکی لێ هەڵنەوەرینێ و، پلەیەکی پێ بەرز نەبێتەوە.**

(الصحيحة ١٦١٠)

٦٣١٩- إن العبد إذا مرض أوحى الله إلى ملائكته: أنا قيدت عبدي بقيد من قيودي فإن أقبضه أغفر له و إن أعافه فحينئذ يقعد لا ذنب له.

( صحيح ) ( ك ) عن أبي أمامة .

**٦٣١٩- بەڕاستی بەندەی خوا کاتێك نەخۆش دەکەوێت خوای گەورە وەحی بۆ فریشتەکان دەنێرێت: من چەسپێك لە چەسپەکانم بەندەکەم کۆکردوە، ئەگەر بیبەمەوە لای خۆم لێی خۆش دەبم، ئەگەر چارەسەری بکەم، هەڵدەسێتەوە و گوناهی لەسەر نەماوە.**

(الصحيحة ١٦١٣)

٦٣٢٠- إن المؤمنين يشدد عليهم لأنه لا تصيب المؤمن نكبة من شوكة فما فوقها و لا وجع إلا رفع الله له بها درجة و حط عنه خطيئة.

( صحيح ) ( ابن سعد ك هب ) عن عائشة .

**٦٣٢٠- بەڕاستی دەربارەی بڕواداران دەنوێنم، چونکە هیچ نەهامەتییەکیان تووش نابێت لە دڕکێك و بەرە و ژوورتر، یان ئازارێك، تاکو خوای گەورە پلەیەکیان بۆ بەرز نەکاتەوەوە گوناهێکیان لێ نەسڕێتەوە .**

(الصحيحة ١١٦٧)

٦٣٢١- عظم الأجر عند عظم المصيبة و إذا أحب الله قوما ابتلاهم.

( صحيح ) ( المحاملي في أماليه ) عن أبي أيوب.

**٦٣٢١- گەورەیی پاداشت بە گەورەیی کارەساتە، ئەگەر خوای گەورەیش کەسانێکی خۆش بوێت تاقیاندەکاتەوە.**

(الصحيحة ١٤٦)

٦٣٢٢- قاربوا و سددوا ففي كل ما يصاب به المسلم كفارة حتى النكبة ينكبها أو الشوكة يشاكها.

( صحيح ) ( حم م ت ) عن أبي هريرة.

**٦٣٢٢- کاری چاکە بپێکن و لەخوا نزیك ببنەوە ، هەرچیش تووشی موسڵمان دەبێت قەرەبوی گوناهە، تەنانەت هەر مەینەتییەك یان دڕکێکی پیابچەقێت .**

(الطيماويه ٣٠٧)

٦٣٢٣- ليس من عمل يوم إلا و هو يختم عليه فإذا مرض المؤمن قالت الملائكة: يا ربنا ! عبدك فلان قد حبسته فيقول الرب: اختموا له على مثل عمله حتى يبرأ أو يموت.

( صحيح ) ( حم طب ك ) عن عقبة بن عامر.

**٦٣٢٣- هەرچی کردەوەی ڕۆژانە هەیە مۆر دەکرێت، جا کاتێك بڕوادار نەخۆش دەکەوێت فریشتەکان دەڵێن: پەروەردگارمان! فلانە بەندەت بە نەخۆشی گیرداوە و خستووە، پەروەردگار دەفەرموێت: کردەوەکانی بۆ مۆر بکەن لەسەر کردەوەکانی پێشووی تاکو چاك دەبێتەوە یان دەمرێت.**

(الصحيحة ٢١٩٣)

٦٣٢٤- ليودن أهل العافية يوم القيامة أن جلودهم قرضت بالمقاريض مما يرون من ثواب أهل البلاء.

( صحيح ) ( ت الضياء ) عن جابر.

**٦٣٢٤- لەش ساغەکان لەڕۆژی قیامەتدا ئاواتەخوازن پێستەکانیان لەدونیاد بەمەقەست ببڕایە، کاتێك پاداشتی نەخۆش و گرفتارەکان دەبینن.**

(الصحيحة ٢٢٠٦)

٦٣٢٥- مامن شيء يصيب المؤمن حتى الشوكة تصيبه إلا كتب الله له بها حسنة و حط عنه بها خطيئة.

( صحيح ) ( م ) عن عائشة.

**٦٣٢٥- هەرچی تووشی باوەڕدار دەبێت تەنانەت دڕکێکیشی تێهەڵدەچەقێت، خوای گەورە چاکەیەکی بۆ دەنووسێت و خراپەیەکی لەسەر لادەبات.**

(الصحيحة ٢٥٠٣)

٦٣٢٦- ما من شيء يصيب المؤمن في جسده يؤذيه إلا كفر الله عنه به من سيئاته.

( صحيح ) ( حم ك ) عن معاوية.

**٦٣٢٦- هەرچی تووشی باوەڕدار بێت لەلاشەیدا و ئازاری بدات، خوای گەورە بەوە لە گوناهەکانی پەردەپۆش دەکات .**

(الصحيحة ٢٢٧٤)

٦٣٢٧- ما من شيء يصيب المؤمن من نصب و لا حزن و لا وصب حتى الهم يهمه إلا يكفر الله به عنه من سيئاته.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي سعيد.

**٦٣٢٧- هەرچی تووشی باوەڕدار بێت لە شەکەتی و پەژارە و نەخۆشی، تەنانەت خەفەتێکیش کەتووشی دەبێت، خوای گەورە گوناهی پێ لادەبات بۆی.**

(الترغيب ٣٤١٥)

٦٣٢٨- ما من عبد يصرع صرعة من مرض إلا بعثه الله منها طاهرا.

( صحيح ) ( طب الضياء ) عن أبي أمامة.

**٦٣٢٨- هەر بەندەیەك شەپلو فێ بەزەویدا و بوە نەخۆشی، خوای گەورە لەئە نجامدا پاکی دەکاتەوە .**

(الصحيحة ٢٢٧٧)

٦٣٢٩- ما من مسلم يشاك شوكة فما فوقها إلا كتبت له بها درجة و محيت عنه بها خطيئة.

( صحيح ) ( م ) عن عائشة.

**٦٣٢٩- هەر موسڵمانێك دڕکێکی تێهەڵدەچەقی، یان لەوە زیاتری توش بوو، حەتمەن پلەیەکی بۆ دەنووسرێت و، خرا پەیەکی بۆ دەسرێتەوە.**

(الروض ٨١٩)

٦٣٣٠- ما من مسلم يصاب في جسده إلا أمر الله تعالى الحفظة: اكتبوا لعبدي في كل يوم و ليلة من الخير ما كان يعمل ما دام محبوسا في وثاقي.

( صحيح ) ( ك ) عن ابن عمرو.

**٦٣٣٠- هەر موسڵمانێك تووشی دەردەداریەك بێت لەلاشەیدا خوای گەورە فەرمان بەنووسەرە پارێزەرەکان دەکات: بنووسن بۆ بەندەکەم لە جیاتی هەموو ڕۆژوو شەوێك وەکو ئەو کردەوانەی لەوەو پێش دەیکرد، تاکو بەکۆتی من بە سرابێتەوە.**

(الصحيحة ١٢٣٢)

٦٣٣١- ما من مسلم يصيبه أذى شوكة فما فوقها إلا حط الله له به سيئاته كما تحط الشجرة ورقها.

( صحيح ) ( ق ) عن ابن مسعود.

**٦٣٣١- هەر موسڵمانێك توشی ئازاری دڕكێك یان لەوە زیاتر بێت، خوای گەورە گوناهەكانی بۆ دەوەرێنی بەو دڕكە وەكو چۆن درەخت گەڵاكانی دەوەرێت.**

(الصحيحة ٢٠٤٧)

٦٣٣٢- ما من مصيبة تصيب المسلم إلا كفر الله بها عنه حتى الشوكة يشاكها.

( صحيح ) ( حم ق ) عن عائشة.

**٦٣٣٢- هەر كارەساتێك تووشی موسڵمانێك ببێت، خوای گەورە گوناهی پێ لادەبات، تەنانەت ئەگەر دڕكێكیش بچێت بە شوێنێكیدا .**

**(الترغيب ٣٤١٣)**

٦٣٣٣- ما يزال البلاء بالمؤمن و المؤمنة في نفسه و ولده و ماله حتى يلقى الله و ما عليه خطيئة.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة.

**٦٣٣٣- بەڵا و مەینەتی بەردەوام دوچاری پیاو و ئافرەتی باوەڕدار دەبێت لە خۆی و ماڵ ومناڵیدا، تاكو بەخوا بگات و هیچ گوناهێكی لەسەر نەماوە.**

(الصحيحة ١٢٨٠)

٦٣٣٤- ما يصيب المسلم من نصب و لا وصب و لا هم و لا حزن و لا أذى و لا غم حتى الشوكة يشاكها إلا كفر الله بها من خطاياه.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أبي سعيد وأبي هريرة معا.

**٦٣٣٤- موسڵمان تووشی هەر شەكەتی و نەخۆشی و خەم و ئازار و پەژارەیێك بێت، تەنانەت ئەگەر دڕكێكیشی تێهەڵچەقێت ، خوای گەورە گوناهەكانی بۆ دەسڕێتەوە پێی.**

(الصحيحة ٢٥٠٣)

٦٣٣٥- من يرد الله به خيرا يصب منه.

( صحيح ) ( حم خ ) عن أبي هريرة.

**٦٣٣٥- خوای گەورە خێرو چاكەی بۆ كەسێك بوێت تاقی دەكاتەوە بەكارەسات و نەخۆشی.**

(المشكاة ١٥٣٦)

٦٣٣٦- وصب المؤمن كفارة لخطاياه.

( صحيح ) ( ك هب ) عن أبي هريرة.

**٦٣٣٦- نەخۆشی بڕوادار قەرەبوی تاوانەكانیەتی .**

(الصحيحة ٢٤١٠)

٦٣٣٧- لا يصيب المؤمن شوكة فما فوقها إلا رفعه الله بها درجة و حط عنه بها خطيئة.

( صحيح ) ( ت حب ) عن عائشة.

**٦٣٣٧- موسڵمان دڕكێك نایگەزێت یان زیاتر تاكو پلەی پێ بەرز نەبێتەوە و، خرا پەی لێ نەسرێتەوە.**

(الصحيح الترمذي ٩٦٥)

٦٣٣٨- يا ام العلاء أبشرى فأن مرض المسلم يذهب الله به خطاياه كما تذهب النار خبث الذهب .

( صحيح ) ( حم ن ) عن العرباض بن سارية.

**٦٣٣٨- ئەی دایكی عەلا! مژدەت لێ بێت، چونكە نەخۆشی موسڵمان گوناهەكانی لادەبات، وەكو چۆن ئاگر پیسی ئاڵتون و زیوو لادەبات.**

(الصحيحة ٧١٤)

٦٣٣٩- يود اهل العافية يوم القيامة حين يعطى اهل البلاء الثواب لو أنَّ جلودهم كانت قُرضت في الذين بالمقاريض .

( حسن (ت) عن جابر الصحيحة ٢٢٠٦).

**٦٣٣٩- لاشە ساغەكان لە ڕۆژی قیامەتدا خۆزگە دەخوازن پێستەكانیان بە مەقەست بڕابایەتەوە لە دونیا، كاتێك دەبینن دەردەدار و خاوەن بەڵاكان چەند پاداشتیان گەورەیە.**

(الصحيحة ٢٢٠٦)

## بابەتی تاعوون شەهیدییە

٦٣٤٠-أتاني جبريل بالحمى و الطاعون، فأمسكت الحمى في المدينة، وأرسلت الطاعون إلى الشام ، فالطاعون شهادة لأمتي ورحمة لهم ، ورجس على الكافرين.

(صحيح) (حم ابن سعد) عن أبي عسيب.

**٦٣٤٠- جیبریل تاو تاعوونی بۆ هێنام، تام لەمەدینە هێشتەوە و، تاعونیشم ناردە شام، تاعوون شەهیدی و بەزەییە بۆ ئوممەتەكەم و خرا پە و سزایشە بۆ بێباوەڕان.**

(الصحيحة ٧٦٠)

٦٣٤١-إذا سمعتم بالطاعون بأرض فلا تدخلوا عليه،وإذا وقع وأنتم بأرض فلا تخرجوا فرارا منه.

(صحيح) (حم ق ن) عن أسامة بن زيد (حم ق) عن عبدالرحمن بن عوف (د) عن ابن عباس.

**٦٣٤١- ئەگەر بيستتان تاعوون لە خاكێكدا هەيە مەچنە ئەوێ، ئەگەر لەشوێنێكيشدا كەوتەوە كە ئێوەی ليێبوون لێی هەڵمەيەن.**

(الصحيحة ٢٩٣١)

٦٣٤٢- إذا سمعتم بالطاعون بأرض فلا تدخلوا عليه،وإذا وقع وأنتم بأرض فلا تخرجوا منها فرارا منه.

(صحيح) (حم ق ن) عن أسامة بن زيد.

**٦٣٤٢- ئەگەر بيستتان تاعوون لەشوێنێكدا كەوتووەتەوە، مەچنە ئەو شوێنە، ئەگەر لە جێگەيەكيش بوون تاعونی لیٚ كەوتەوە لەدەستی هەڵمەيەن .**

(الصحيحة ٢٩٣١)

٦٣٤٣- الفارُّ من اطاعون كالفارَّ من الزحف ، والصابر فيه كالصابر في الزحف.

(صحيح) (حم عبد بن حميد) عن جابر.

**٦٣٤٣- هەڵهاتن و خۆدزينەوە لە تاعوون وەكو هەڵهاتن و خۆدزينەوە لە ڕۆژی هێرشبردندا، خۆڕاگريش تيايدا وەكو خۆڕاگرە لە ڕۆژی هێرش و جيهاددا.**

(الصحيحة ١٢٩٢)

٦٣٤٤-الفارّ من الطاعون كالفارّ من الزحف ، ومن صبر فيه كان له أجر شهيد.

(صحيح) (حم) عن جابر.

**٦٣٤٤- هاڵهاتوو لە تاعوون وەكو هەڵهاتووە لە جەنگ و هێرش ، هەركەسيش ئارامبگرێت پاداشتی شەهيدێكی هەيە.**

(الصحيحة ١٢٩٢)

٦٣٤٥- الفرار من الطاعون كالفرار من الزحف.

(صحيح) (ابن سعد) عن عائشة.

**٦٣٤٥- هەڵهاتن لە تاعوون وەكو هەڵهاتنە لە كاتی جيهادكردن.**

(الصحيحة ١٢٩٢)

٦٣٤٦- الفرار من الطاعون رجز بقية عذاب عُذبَّ بهِ قوم ، فإذا وقع بأرض وأنتم بها فلا تخرجوا منها فرارا منه، وإذا وقع بأرض ولستم بها فلا تدخلوها.

(صحيح) (حم م) عن أسامة بن زيد و سعد و خزيمة بن ثابت.

**٦٣٤٦- ئەم تاعوونە سزایە و، پاشماوەی سزای خەڵکانێکی ترە، کە پێی سزا دراون جا کاتێك لە شوێنێکدا دەکەوێتەوە لێی هەڵمەیەن، ئەگەر لە شوێنێکیش کەوتەوە و ئێوە لەوێ نەبوون، مەچن بۆ ئەو جێگایە.**

(الصحيحة ٢٩٣١)

٦٣٤٧-إن هذا الوباء رجز أهلك الله به الامم قبلكم قلبكم ، وقد بقي منه في الأرض شيء يجيء أحيانا و يذهب أحيانا ، فإذا وقع بأرض فلا تخرجوا منها فرارا، وإذا سمعتم به في أرض فلا تأتوها.

(صحيح) (حم ق ن) عن أسامة بن زيد.

**٦٣٤٧- ئەم درمە سزایەکە خوای گەورە ئوممەتەکانی پێش ئێوەی پێ لەناو دەبرد، هەندێکیشی ماوەتەوە دێت و دەڕوات لەسەر زەویدا، جا کاتێك ڕوودەدات لە شوێنێکدا هەڵمەیەن، ئەگەریش بیستتان لە شوێنێك پەیدا بووە مەچن بۆ ئەو شوێنە.**

(الصحيحة ٢٩٣١)

٦٣٤٨- يختصم الشهداء و المتوفون على فرشهم إلى ربنا في الذين يتوفون من الطاعون فيقول الشهداء إخواننا قتلوا كما قتلنا و يقول المتوفون على فرشهم: إخواننا ماتوا على فرشهم كما متنا فيقضي الله بينهم فيقول ربنا: انظروا إلى جراحهم فإن أشبهت جراحهم جراح المقتولين فإنهم منهم و معهم فينظرون إلى جراح المطعونين فإذا جراحهم قد أشبهت جراح الشهداء فيلحقون بهم.

(حسن) (حم ن) عن العرباض بن سارية.

**٦٣٤٨- شەهیدان و مردووانی سەرجێگا مشت و مڕ دەهێننە لای خوای گەورە سەبارەت بەوانەی بە تاعوون دەمرن، شەهیدان دەڵێن: براکانمان کوژران وەکو چۆن ئێمە کوژراین. مردووەکانی سەر جێگایش دەڵێن: براکانمان مردن لەسەر جێگاکانیان وەکو ئێمە. خوای گەورە داوەری نێوانیان دەکات و دەفەرموێت: بڕوانن بۆ برینەکانیان ئەگەر لە برینی کوژراوەکان چوو ئەو لەوانن و لەگەڵ ئەوانن، ئەوانیش تەماشای برینی تووشبووەکانی تاعوون دەکەن دەبینن وەکو برینی شەهیدانە، ئیتر دەیانگەیەننە ئەواندا.**

(الجنائز ٣٧)

# بابەتی تەنینەوەی نەخۆشی

٦٣٤٩- اتقوا المجذوم كما يتقى الأسد.

( صحيح ) ( تخ ) عن أبي هريرة .

**٦٣٤٩- خۆتان بپارێزن لە گول وەکو چۆن خۆتان لە شێر دەپارێزن .**

(الصحيحة ٧٨٠)

٦٣٥٠- أربع بقين في أمتي من أمر الجاهلية ليسوا بتاركيها: الفخر بالأحساب و الطعن في الأنساب و الاستسقاء بالنجوم و النياحة على الميت و إن النائحة إذا لم تتب قبل الموت جاءت يوم القيامة عليها سربال من قطران و درع من لهب النار.

( صحيح ) ( حم طب ك ) عن أبي مالك الأشعري .

**٦٣٥٠- چوارشت هەیە لە ئوممەتدا لە کاروباری نەفامییە، خەڵکی وازی لێ ناهێنێ: سووکایەتیکردن بە ڕەچەڵەك و، شیوەن لەسەر مردوو و، ئەستێرەکان، بارانمان بۆ باری بە فلانە ئەستێرە و فلانە ئەستێرە، تەنینەوەی نەخۆشیش، وشترێك گەڕ بوو، سەد ووشتی گەڕ کرد، ئەی کێ ووشتری یەکەمی تووش کرد؟!**

(الصحيحة ٧٣٤)

٦٣٥١- فمن أعدى الأول ؟

( صحيح ) ( ق د ) عن أبي هريرة.

**٦٣٥١- ئەی کێ یەکەم وشتری[1] تووش کرد؟!**

(الصحيحة ٧٨٢)

٦٣٥٢- لا تحدوا النظر إلى المجذومين.

( صحيح ) ( الطيالسي هق ) عن ابن عباس.

**٦٣٥٢- بەوردی تەماشای گەڕ و گولەکان مەکەن.**

(الصحيحة ١٠٦٤)

٦٣٥٣- لا تديموا النظر إلى المجذومين.

( صحيح ) ( حم هـ ) عن ابن عباس.

---

[1] واتە : توشی گەرۆلی کرد .

**٦٣٥٣- بە بەردەوامى تەماشاى گەڕ و گولەكان مەكەن.**

(الصحيحة ١٠٦٤)

٦٣٥٤- لا عدوى و لا صفر و لا هامة.

( صحيح ) ( حم ق ) عن أبي هريرة ( حم م ) عن السائب بن يزيد.

**٦٣٥٤- گواستنەوەى نەخۆشى نييە و، مانگى صەفەريش شوم نيە[1]، و پيْرۆ( هامە )يش درۆيە[2].**

(الصحيحة ٧٨٣)

٦٣٥٥- لا عدوى و لا طيرة و إنما الشؤم في ثلاث: في الفرس و المرأة و الدار.

( صحيح ) ( حم ق ) عن ابن عمر.

**٦٣٥٥- نەخۆشى تەنينەوە نييە و، شوومى ، بەلاّم شوومى تەنها لە سىّ شتدايە : لەئەسپ و، ئافرەت و، خانوو.**

(الصحيحة ٧٨٨)

٦٣٥٦- لا عدوى و لا طيرة و لا هامة ( ذلكم القدر فمن أجرب الأول ) .

( صحيح ) ( حم هـ ) عن ابن عمر.

**٦٣٥٦- نەخۆشى ناگويْزريْتەوە، شوويش نيە و، ( هامة ) درۆيە..... ئەى يەكەميانى گەڕ كرد.**

(الضعيفة ٤٨٠٨)

٦٣٥٧- لا عدوى و لا طيرة و لا هامة و لا صفر و فر من المجذوم كما تفر من الأسد.

( صحيح ) ( حم خ ) عن أبي هريرة.

**٦٣٥٧- نەخۆشى گواستنەوە نييە و، شوومى نيە و، ( هامة ) درۆيە و،مانگى صەفەر شووم نييە و، لەگەڕ و گول ڕابكە وەكو چۆن لە شيْر هەلّديْى.**

(الصحيحة ٧٨٤)

٦٣٥٨- لا عدوى و لا طيرة و لا هامة و لا صفر و لا غول.

( صحيح ) ( حم م ) عن جابر.

---

[1] چونكە عەرەب بە شوومى تەماشاى ئەو مانگە دەكەن.

[2] پيْرۆ : گيانەوەريْكى ژەهراويە گيانەوەريْكە لە ( رأس العقيل ) موە دەردەچيْت يان پەيدا دەبيْت ، هەروەها هاوار دەكات تاكو تۆلّەى دەكريْتەوە ، عەرەب وايان دەوت تاكو ئيسلام ئەوانى بە درۆ خستەوە .

**٦٣٥٨- نەخۆشی ناگوێزرێتەوە و، شوومی نیە و،(هامە) درۆیە و، مانگی صەفەر شووم نییە و، دێو یان خێو (غول)یش درۆیە.**

(الصحيحة ٧٨٤)

٦٣٥٩- لا عدوى و لا طيرة و يعجبني الفأل الصالح و الفأل الصالح: الكلمة الحسنة.

( صحيح ) ( حم ق د ت هـ ) عن أنس.

**٦٣٥٩- نەخۆشی بڵاو نابێتەوە و، شوومی نییە و گەشبینی چاك گەشبینی چاك قسەی باشە.**

(الصحيحة ٧٧٦)

٦٣٦٠- لا عدوى و لا هامة و لا طيرة و أحب الفأل الحسن.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة.

**٦٣٦٠- نەخۆشی بڵاو نابێتەوە، پیرۆ (هامة)یش[1] درۆیە و، بە شوومی تەماشای هیچ مەکەن و، قسەی چاکیشم پێ باشە.**

(الصحيحة ٧٨٧)

٦٣٦١- لا عدوى و لا هامة و لا نوء و لا صفر.

( صحيح ) ( د ) عن أبي هريرة.

**٦٣٦١- تەیننەوەی نەخۆشی نییە و، (هامة) درۆیە و، باران بەتەمای ئەستێرە بون بۆ باران بارین و، مانگی صەفەر شووم نییە.**

(السنة ٢٧٥)

٦٣٦٢- لا هامة و لا عدوى و لا طيرة و إن تكن الطيرة في شيء ففي: الفرس و المرأة و الدار.

( صحيح ) ( حم ) عن سعد بن مالك.

**٦٣٦٢- ( هامة )نییە و ،نەخۆشی تەنینەوە نیە و شومی نیە و ،ئەگەر شومی لە شتێکدا هەبێت لە ئەسپ و ئافرەت و خانوودایە [2].**

( الصحيحة ٧٨٩ )

٦٣٦٣- لا يعدي شيء شيئا فمن أجرب الأول ؟ لا عدوى و لا صفر خلق الله كل نفس فكتب حياتها و رزقها و مصائبها.

( صحيح ) ( حم ت ) عن ابن مسعود.

---

[1] گیاندارێکی بیابانی ژەهراویە ـ بەڵام عەرەب هەر بە خەیاڵ منداڵیان پێ ترساندووە .

[2] واتە : ئەم شتە ڕوو لە نەگبەتی بن زۆر خراپ و ماڵوێرانیە .

**٦٣٦٣- هيچ شتێك نەخۆشی لە شتێكی ترەوە ناگرێت ،ئەی كێ یەكەم ووشتری گەڕ كرد؟ نەخۆشی ناگوێزرێتەوە و ، مانگی صەفەر شووم نییە ،خوای گەورە هەموو گیانێكی درووست كردووە ،ژیان و ڕۆزی و مەینەتییە كانی بۆ نووسیوە .**

( الصحيحة ١١٥٢ )

٦٣٦٤- لا يوردن ممرض على مصح.

( صحيح ) ( حم ق د ن ) عن أبي هريرة.

**٦٣٦٤- خاوەنی ووشتری نەخۆش با نەچێت بۆلای خاوەنی ووشتری ساغ .**[1]

( الصحيحة ٩٦٧ )

## بابەتی هاندانی چەرەسەركردن

٦٣٦٥- إن الذي أنزل الداء أنزل الشفاء.

( صحيح ) ( ك ) عن أبي هريرة .

**٦٣٦٥- ئەوەی نەخۆشی ناردووە ،چارەسەریشی ناردووە.**

٦٣٦٦- إن الله تعالى حيث خلق الداء خلق الدواء فتداووا.

( صحيح ) ( حم ) عن أنس .

**٦٣٦٦- بەڕاستی خوای گەورە لە كوێ نەخۆشی دروستكردبێت ، هەر لەوێش چارەسەری درووست كردووە . خۆتان تیماربكەن .**

( غاية المرام ٢٩٠ )

٦٣٦٧- إن الله تعالى خلق الداء و الدواء فتداووا و لا تتداووا بحرام.

( صحيح ) ( طب ) عن أم الدرداء .

**٦٣٦٧- خوای گەورە نەخۆشی و چارەسەری درووست كردوە ،بۆیە خۆتان تیمار بكەن و بەشتی قەدەغە كراویش خۆتان تیمار مەكەن .**

٦٣٦٨- إن الله تعالى لم يضع داء إلا وضع له شفاء فعليكم بألبان البقر فإنها ترم من كل الشجر.

( صحيح ) ( حم ) عن طارق بن شهاب .

---

[1] **واتە : خاوەن وشتری نەخۆش نەچێتە لای خاوەن وشتری ساغ**

**٦٣٦٨- بەراستى خواى گەورە نەخۆشى دانەناوە تاكو چارەسەرى بۆ دانەنابێت ، شيرى مانگا بەكاربێنن بەڕاستى لە هەموو درەختێك بەرهەم هاتووە .**

( غاية المرام ٢٩٢ )

٦٣٦٩- الدواء من القدر و قد ينفع بإذن الله تعالى.

( صحيح ) ( طب أبو نعيم ) عن ابن عباس .

**٦٣٦٩- چارەسەركردن لە نەخشەى خودايە ،لەوانەشە بەيارمەتى بەسوود بگەيەنێت .**

( المشكلة الفقر ١٢ )

٦٣٧٠- الدواء من القدر و هو ينفع من يشاء بما شاء.

( صحيح ) ( ابن السني ) عن ابن عباس .

**٦٣٧٠- چارەسەركردن لە قەدەرە ،خواى گەورەش سوود دەگەيەنێ بەهەر كەسێك و بە هەر شتێك بيەوێت.**

( المشكلة الفقر ١٢ )

٦٣٧١- لكل داء دواء فإذا أصيب دواء الداء برئ بإذن الله تعالى.

( صحيح ) ( حم م ) عن جابر.

**٦٣٧١- هەموو نەخۆشيەك چارەسەرى هەيە ،جا ئەگەر چارەسەرى نەخۆشيەكە دۆزرايەوە بە پێى چاك دەبێتەوە بە پشتيوانى خواى گەورە .**

( غاية المرام ٢٩٢ )

٦٣٧٢- ما أنزل الله داء إلا أنزل له الدواء.

( صحيح ) ( هـ ) عن ابن مسعود.

**٦٣٧٢- خواى گەورە هيچ نەخۆشيەكى نەناردووە هەتا چارە سەرەكەشى بۆ نەناردبێت.**

( الصحيحة ٥١٨ )

٦٣٧٣- ما أنزل الله داء إلا أنزل له شفاء.

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي هريرة.

**٦٣٧٣- خواى گەورە نەخۆشى نەناردووە هەتاكو چارەسەرەكەشى نەناردبێت .**

( الصحيحة ٥١٨ )

٦٣٧٤- يا عباد الله تداووا فإن الله لم يضع داء إلا وضع له دواء غير داء واحد: الهرم.

( صحيح ) ( حم ٤ حب ك ) عن أسامة بن شريك.

**٦٣٧٤- ئەی بەندەكانی خوا خۆتان تیمار بكەن ، چونكە خوای گەورە نەخۆشی نەناردووە تاكو چارە سەریشی بۆ نەناردبێت. جگە لە پیری نەبێت.**

( المشكاة ٢٥٣٢ )

٦٣٧٥- عباد الله ! وضع الله الحرج إلا امرءا اقترض امرءا ظلما فذاك يحرج و يهلك عباد الله! تداووا فإن الله تعالى لم يضع داء إلا وضع له دواء إلا داء واحدا: الهرم .

( صحيح ) ( الطيالسي ) عن أسامة بن شريك.

**٦٣٧٥- بەندەكانی خوا ! خوای گەورە گوناهی لابردووە تەنها لەسەر كەسێك نەبێت بوختانی بۆ ناموسی كەسێك كردبێت بە ناهەق ،ئەوە گوناهەو ،بەندەكانی خوا لەناو دەبات! خۆتان چارەسەر بكەن چونكە خوای گەورە نەخۆشی نەناردووە تاكو چارەسەری بۆ دانەنابێت ،تەنها پیری نەبێت.**

( غاية الحرام ٢٩٢ )

٦٣٧٦- من تداوى بحرام لم يجعل الله فيه شفاء.

( صحيح ) ( أبو نعيم في الطب ) عن أبي هريرة.

**٦٣٧٦- هەركەسێك خۆی تیمار بكات بە شتی قەدەغە كراو ،خوای گەورە شیفای نادات.**

( الصحيحة٢٨٨١ )

٦٣٧٧- من تطبب و لم يعلم منه طب فهو ضامن.

( صحيح ) ( د ن هـ ك ) عن ابن عمرو.

**٦٣٧٧- هەركەسێك پزیشكی بكات و پێشتریش پزیشكی لێ نەبینرابێت ئەو بەر عۆدەی ئەو بەرپرسیاریەتیەی دەبێت دەچێتە ئەستۆی .**

( الصحيحة ٦٣٥ )

## بابەتی تیمارکردنی پێغەمبەرانە

٦٣٧٨- إذا اشتكى عينيه و هو محرم ضمدهما بالصبر

( صحيح ) ( م ) عن عثمان .

**٦٣٧٨- ئەگەر توشی چاو ئێشە بوو لە کاتی ئیحرام دا با به خۆڕاگری ( صبر )[١] تیماری بکات.**

( المشكاة ٢٦٨٦ )

٦٣٧٩- إذا حم أحدكم فليسن عليه الماء البارد ثلاث ليال من السحر

( صحيح ) ( ن ع ك الضياء ) عن أنس .

**٦٣٧٩- ئەگەر کەسێکتان توشی تا بوو با سێ جار ئاوی سارد بپرژێنن بە سەریدا سەرلەبەیانی سێ ڕۆژ.**

( الصحيحة ١٣١٠ )

٦٣٨٠- اكتحلوا بالإثمد فإنه يجلوا البصر و ينبت الشعر

( صحيح ) ( ت ) عن ابن عباس .

**٦٣٨٠- چاوتان برێژن به سورمه ( کل ) ، چونکه چاو بەهێز دەکات و موو دەڕوێنێ .**

( المشكاة ٤٤٧٢ )

٦٣٨١- ألبان البقر شفاء و سمنها دواء و لحومها داء

( صحيح ) ( طب ) عن مليكة بنت عمرو .

**٦٣٨١- شیری مانگا چارەسەرە ، ڕۆنەکەشی دەرمانە و ، گۆشتەکەشی نەخۆشی یە.**

( الصحيحة ١٥٣٣ )

٦٣٨٢- البسوا من ثيابكم البياض فإنها من خير ثيابكم و كفنوا فيها موتاكم و إن من خير أكحالكم الإثمد يجلوا البصر و ينبت الشعر.

( صحيح ) ( حم د ت حب ) عن ابن عباس .

**٦٣٨٢- جلە سپیە کانتان بپۆشن، چونکە ئەوە چاکترین پۆشاکەکانتانە، مردووەکانتانی تیا کفن بکەن ، چاکترین شتەکانیشتان بۆ چاو ڕشتن سورمەیە ( کله ) ، چاو بەهێز دەکات و موو دەڕوێنێ .**

( الجنائز ٦٢ )

---

[١] دەرمانێکی تاڵە

٦٣٨٣- إن كان في شيء من أدويتكم خير ففى شرطة محجم أو شربة من عسل أو لذعة بنار توافق داء و ما أحب أن أكتوي.

( صحيح ) ( حم ق ن ) عن جابر .

**٦٣٨٣- ئەگەر چارەسەرەكانتان چاكيان تيابێت كەڵە شاخە ،يان قومێ هەنگوين ،يان داخكردنێك بگونجێت لەگەڵ دەردێكدا ،بگونجێ بەلاَم پوشونانم پێ خۆش نييە .**

( الصحيحة ٢٤٥ )

٦٣٨٤- أنعت لك الكرسف فإنه يذهب الدم.

( صحيح ) ( د هـ ) عن حمنة بنت جحش .

**٦٣٨٤- لۆكەت بۆ وەسف دەكەم چونكە خوێن لادەبات.**

( صحيحة ابى داود ٢٩٢ )

٦٣٨٥- إن الله تعالى لم يضع داء إلا وضع له شفاء فعليكم بألبان البقر فإنها ترم من كل الشجر.

( صحيح ) ( حم ) عن طارق بن شهاب .

**٦٣٨٥- خواى گەورە هيچ نەخۆشيەكى دانەناوە تاكو چارەسەرەكەشى بۆ دانەنابێت ، بۆيە دەشێ شيرى مانگا بخۆن چونكە لە هەموو دارو درەختێك دەخوات .**[1]

( الصحيحة ١٦٥٠ )

٦٣٨٦- إن الله تعالى لم ينزل داء إلا أنزل له دواء علمه من علمه و جهله من جهله إلا السام و هو الموت.

( صحيح ) ( ك ) عن أبي سعيد .

**٦٣٨٦- خواى گەورە هيچ نەخۆشيەكى نەناردووە ،تاكو چارەسەرى بۆ نەناردبێت ، خەڵكانێك رێى پێدەبەن و ،خەڵكانێك رێى پێنابەن ،تەنها زەهر نەبێت كە مردنە .**

( الصحيحة ٤٥٢ )

٦٣٨٧- إن الله تعالى لم ينزل داء إلا أنزل له شفاء إلا الهرم فعليكم بألبان البقر فإنها ترم من كل شجر.

( صحيح ) ( ك ) عن ابن مسعود .

**٦٣٨٧- خواى گەورە دەردێكى نەناردووە تاكو چارەسەرى بۆ نەناردبێت ،تەنها پيرى نەبێت ،بۆيە شيرى مانگا بخۆن ، چونكە لە هەموو دارەكان دەخوات .**

( الصحيحة ٥١٧ )

---

[1] واتە سوودى ئەو رووەكە جۆراو جۆرانەش لە شيرەكەدا دەردەكەوێت . ( وەرگێر )

